The New York Times پڕفرۆشترینی نیۆرک تایمز

ستیف هارڤی

# خانمانە ڕەفتار بکە پیاوانە بیر بکەرەوە

بۆچوونی پیاوان لەبارەی خۆشەویستی، پەیوەندییەکان ،سۆزداری، بەرپرسیارێتی.

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە
هۆزان عەبدوڵڵا

K. K. R

GOLDEN BOOK

STEVE HARVEY

# خانمانە رەفتار بکە پیاوانە بیر بکەرەوە

بۆچوونی پیاوان لەبارەی خۆشەویستی،
[illegible]


ستیڤ هارڤی

پڕفرۆشترینی نیۆرک تایمز


وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە:

هۆزان عەبدوڵڵا

ناوی کتێب: خانمانە ڕەفتار بکە ، پیاوانە بیر بکەرەوە.
ناوی نوسەر : ستیڤ هارڤی
بابەت : دەرونزانی
وەرگێرانی: هوزان عەبدوڵلا
پێداچونەوە: سیروان سلێمان حسین
دیزاین : هەرێم عوسمان
تیژار : ١٠٠٠ دانە
چاپ: تاران
نوبەتی چاپ : چاپی یەکەم

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردن (١٣٧٨) ی ساڵی ( ٢٠١٩ ) ی پێدراوە

ئەم پەرتووکە تایبەتە بەهەموو خانمێک،
بەهیوای ئەوەم بتوانیت بەتێڕوانینێکی فراوانەوە،
بڕوانیتە مێشکی پیاوان.

# ناوەرۆک

# هەموو شتێک کەپێویستە بیزانیت دەربارەی پیاوان و پەیوەندییەکانیان لێرەدایە

من زیاتر لەبیست ساڵە بژێوی ژیانم دابین ئەکەم لەڕێی خستنە پێکەنینی خەڵک، بە خۆیان و ئەوانی دیکە، خێزانەکانیان، هاوڕێکانیان، وە بێگومان پێکەنین بەخۆشەویستی، و ڕەگەزو، پەیوەندیە سۆزداریەکان. هەمیشە گاڵتەکانم پڕ بووە لەدانایی و ڕاستی، کە لەئەزمونی ژیانم و تێڕوانین و فێربوون و ناسینی خەڵکەوە بووە، ئەڵێن نوکتەکانم بەشێکی هەستیار ئەپێکن لای خەڵک، چونکە کاریگەرییان لەسەر دروست دەکات، بەتایبەتی ئەو گاڵتانەی(نوکتە) لەبارەی ناجێگیری پەیوەندی نێوان ژن و پیاودایە.

هەرگیز سەرسام نەبووم کەخەڵک چەندیک قسە لەبارەی پەیوەندییە سۆزدارییەکان ئەکەن وبیری لێدەکەنەوە و ئەخوێننەوە و پرسیاری دەربارە ئەکەن، تەنانەت بەبێ ئەوەی ئاگایان لێبێت ئەکەونە پەیوەندییەوە و بەرەوپێش چوون و نازانن چۆن.

بێگومان، ئەگەر شتێک هەبێت لەم گەشتە کورتەم لەم سەرزەوییە بۆم دەرکەوتبێت ئەمەیە:

ا: زۆربەی ژنان پیاوان ناناسن(سروشتی پیاوان نازانن).

ب: پیاوان زۆر شتی بێمانا ئەنجام ئەدەن، لەکاتی پەیوەندیدا، بەبێ ئەوەی سزا وەربگرن، چونکە ژنان هەرگیز تێنەگەشتون کەپیاوان چۆن بیردەکەنەوە.

ج: من چەند زانیارییەکی بەنرخم لایە بۆ گۆڕینی هەموو ئەمانە.

من ئەمەم بۆ دەرکەوت لەمیانەی دەست بەکارکارکردنم لەڕادیۆ، لە بەرنامەی «ستیف هارڤی بەیانیان»›. پێشتر کەبەرنامەکەم لە لۆس ئەنجلوس بوو، بڕگەیەکم بۆ زیادکرد بە ناوی»لە ستیف بپرسە»، کە لەم بڕگەیەدا ژنان دەیانتوانی پەیوەندی بکەن و هەرچییەکیان ئەوێت بپرسن لەبارەی پەیوەندی سۆزدارییەوە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ. لەسەرەتادا هەستم کرد کەبڕگەی››لە ستیف بپرسە›› کۆمیدی ئەبێت وەکو ئەوەی ئەمە بۆ من زۆر گونجاو بێت.

بەلام زۆری نەخایاند درکم بەو شتە کرد کەگوێگرەکانم پێوەی ئەناڵێنن بەزۆری ژنان، هەرگیز کۆمیدی نەبوو، ژمارەیەکی زۆر خەم و پێداویستی هەبوو لەژیانیاندا کەهەولیان ئەدا چارەسەری بکەن، وەکو بابەتی: ژوان، پێکەوەبەستن، پارێزراوی، داب و نەریتی خێزانی، هیوا بەداهاتوو، لایەنی ڕۆحی، ڕوداوی درامی، وێنەی جەستە، چونە تەمەنەوە، هاوڕێیەتی، منال، هاوسەنگی لەنێوان ئیش و مالدا، پەروەردە.

لەڕاستیدا شتێک نیە کەبە بیرتدا بێت و پرسیاری دەربارە بکەی، بەلام ئەگەر سەیری سەرەوە بکەیت، هەست ئەکەی هەموو ئەوەی ژن ویستویەتی باسی بکات لەم بابەتەدا «پیاوان››بوو.

گوێگرە... ژنەکانم بەڕاستی ئەیانویست وەڵامیان دەست بکەوێت، وەڵامی چۆنیەتی دەرچوون لەو پەیوەندیانەی کەتییدان.

لەمیانەی برگەی «لە ستیف بپرسە»» و دواتریش لەبرگەکانی»ستروبیری لیتەرز»یشدا کەئێستا لەبەرنامەی»ستیف هارڤی بەیانییان»یشدا پێشکەشی ئەکەم، ژنان بەڕوونی دەریان بڕی کەدەیانەوێت پیاوان لەبەرامبەردا هەمان شتیان بۆ بکەن، وەک؛ ئەیانەوێت ئاڵوگۆڕی خۆشەویستی بکەن بەشێوەیەکی یەکسان، کەچەندێک خۆشەویستیان بەخشی هەمان بڕیان پێ بدرێتەوە.

ئەیانویست ژیانی سۆزداریان بەرهەمی هەبێت و پەسەند بێت، چونکە ئەمە وانەکات هاوژینی داهاتویان لا پەسەند بێت؛ ژنان ئەیانویست هەمان هەستی گەرم و گوڕیان پێبدرێت کەخۆیان هەیانە، لەهەمان کاتدا، ڕەچاوی ئەوەیان دەکرد ئەرک بە ئەرک، ڕێز بە ڕێز وەڵام بدرێتەوە، بەسادەیی کێشەی زۆربەی ئەو ژنانەی کەپەیوەندی بە بەرنامە ڕادیۆییەکەمەوە دەکەن پێیان وایە ناتوانن مامەڵەی ئاڵوگۆر بەدەستبهێنن لەگەڵ پیاواندا، لەکۆتاییدا ئەمە وایان لێدەکات هەست بە بێهیوایی و بێبەشی، بێزاربوون بکەن، لەپەیوەندییە شکست خواردووەکانییان.

کە بەسەرنجەوە سەیری ئەم بابەتە دەکەم، کاتێک لە گاڵتە (نوکتە) دەوەستم، مایکرۆفۆن و ڕوناکیەکانی ستۆدیۆ ئەکوژێنمەوە، و باوەڕ پێنەکراوانە ئەشڵەژێم –ئەشڵەژێم چونکە لەگەڵ ئەوەی پەیوەندیکەرەکانم بەلایەنی کەمەوە پێویستە هەموویان ئەزمونێکیان هەبێت لەگەڵ پیاواندا، ئەگەر بێت و (هاوڕێ—هاوڕێی کوڕ ، خۆشەویست، هاوسەر یان باوک یان برا یان هاوپیشەکانیان ) یش بێت، کەچی هێشتا

بەچاو كراوەيى و ليزانانە مامەلە لەگەل پياواندا بكەن، بەگويرەى مەرجەكانيان، لەشوينى گونجاوى خويان و بەريگەو شيوازى خويان، دەتوانن بەتەواوەتى بگەن بەوەى دەيانەويت.

لەراستيدا ئاموژگاريەكانم زور بەربلاو بوو بو ئەوانەى بەشدارى برگەى «لە ستيف بپرسە»يان ئەكرد، لەبەرنامەى( بەيانيانى ستيف هارڤى) بەرادەيەك هەوادارەكانم (لە ژنان و پياوان) پرسياريان دەكرد: كەى پەرتوكيك دەنوسم دەربارەى پەيوەندييەكان، كەيارمەتيدەريكى باشى ئەو ژنانە بيت كەئەيانويست پەيوەندييەكى توندوتول دابنين، وە چونيتى دەستكەوتنى ئەو پەيوەندييە، لەهەمانكاتدا پەرتوكەكە يارمەتى پياوانيشى دەدا كەئامادە بوون بو دانانى پەيوەندى، بەلام نەياندەتوانى و نەياندەزانى چون داواى پەيوەندييەك لەخانميك بكەن، دانى پيدادەنيم، لەسەرەتادا بەباشم نەدەزانى كتيبيك بنوسم دەربـارەى بابەتى پەيوەندى ژن و پياو، لەسەروو هەموويەوە جگە لەو وەلامانەى كەداومەتەوە بەمليونان گويگر هەموو بەيانيەك، هيچى ترم پينەبوو ئيتر پەرتوكى چى بنوسم؟؟

لـەوەش گرنگتر، چون من ئەوەندە بەجدى وەردەگرن؟ خو من نوسەر نيم. بەلام دواى ئەوە بيرم لەو پەيوەندييانە كردەوە كە لەژيانى خومدا هەمبووە، قسەم لەگەل هاورى ژن و هاورى پياوەكانمدا كرد، وە هەنديك لەهاوپيشەكانم. بوچونە نافەرمييەكانم كوكردەوە و سەرنجى ئەو شوينەوارانەم دا، كەپەيوەندييەكان لەسەر هەر يەكە لەئيمە جييدەهيلت، بەتايبەت شوينەوارى لەسەر خودى خوم چييە؟

بونمونە: باوكم ماوەى ٦٤ سالە هاوسەرگيرى لەگەل دايكم كردووە، دايكم زور بەنرخ بووە بوى، هەروەها بو منيش، وە

دایکم کاریگەرترین کەس بووە لەژیانمدا.

وە بەهەمان شێوە، هاوسەرو منداڵەکانم بێ جیاوازی بەنرخن لام، لەڕاستیدا نیگەرانیی بۆ داهاتووی کچەکانم خەمی گەورەی ژیانم بووە، لەکۆتاییدا گەورە ئەبن و هەوڵی بەدیهێنانی خەونێک ئەدەن، کەهەموو ژنێک هەیەتی: ئەیانەوێت شوو بکەن و منال و ماڵیان هەبێت، لەگەڵ خۆشەویستی ڕاستەقینە. لەناخی دڵمەوە هیوادارم نەکەونە فرتو فێڵ و گەمەی ئەو پیاوانەی کەتەنها بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانیان هەوڵ دەدەن، دەمانەوێت پیشانی جیهانی بدەین تا ببین بەپیاوچاک. من هەموو ئەمانە بەهۆی دایکم، ژنەکەم، کچەکەم، وە ملیۆنان لەو ژنانەی کە هەموو بەیانییەک گوێگری بەرنامەکەمن دەزانم، کەژنان پێویستیان بە «دەنگێکە» یارمەتیان بدات بۆ تێپەڕاندنی ناخۆشی و سەختیەکان و چارەسەرکردنی گرێکوێرەو کێشەو گرفتەکانیان، تابگەن بەوەی دەیانەوێت.

من پێشبینی ئەوە دەکەم، کەمن دەتوانم ئەو «دەنگە» بم کە ئاماژە دەکەم لەلایەکی پەرژینەکەوە ئەڵێم: هەموو ڕاستی و نهێنییەکانی پیاوان ئاشکرا ئەکەم لەگەڵ ئەو شتانەی کەپیاوان ئـارەزووی ئەکەن، ئەگەر ئەتانزانی! بـەلام نیمەی پیاوان نامانەوێت بزانن، چونکە ئەترسین لەبەرامبەردا بدۆڕێین.

لەناوەڕۆکدا، پەرتوکی «وەک خانم ڕەفتار بکە، و وەک پیاو بیربکەرەوە»، بەجۆرێک لەجۆرەکان بابەتێکی سەرنج ڕاکێشە، بێگومان لەوانەیە بیرتان بێت، چۆن تیپی «نیو ئینگلاند باتریوس» تاوانبار کران، چەند ساڵێک لەمەوبەر، بەیەکێک لەگەورەترین»فێڵ و تەڵەکە» دیاری کرا، لەمێژووی خولی یاری تۆپی پێی ئەمریکی، کەلێکۆڵەرەوەکان ئاشکرایان کرد

تیپەکە بەنهێنی راهێنانەکانی تیپی بەرامبەریان تۆمار دەکرد (وێنە دەگرت)، و ئاماژەی دەمی راهێنەرەکان و یاریزانەکانیان دەخوێندەوە و چاودێریان دەکرد، تاوەکو لەشێوازی یاریکردنیان تێبگەن، کەسودێکی زۆری هەبوو لەرکابەرێتیەکەدا، بێگومان زانینی چۆنییەتی یاریکردن و تۆمارکردنی خاڵ و تاکتیکەکان پاڵنەرێکی باش بوو بۆ سەرکەوتن بەسەر تیپی بەرامبەردا، هەر بەو هۆیەشەوە ئەیانتوانی سەربکەون و یاریەکە ببەنەوە.

ئەمە هەمان ئەوەیە کەخوێنەرە ژنەکان پەرتوکی››وەک ژن رەفتار بکە، و وەک پیاو بیربکەرەوە›› هیوای بۆ ئەخوازن، من ئەمەوێ هەموو ئەو ژنانەی کەخوازیارن بەڕاستی پەیوەندییەکی پتەویان هەبێت لەگەڵ پیاوەکانیان، بەڵام ناتوانن، و ئەوانەشی لەپەیوەندیان وئەیانەوێت باشتری بکەن، من ئەوەم لێیان ئەوێت هەموو شتێک لەبیربکەن کە لەبارەی پیاوانەوە فێری بوون، هەموو ئەو درۆ و ئەفسانانەی (درۆ و دەلەسە) کە لەدایک و هاورێکانییانەوە گوێبیستی بوون، وە هەموو ئەو ئامۆژگارییانەی کە لەگۆڤارەکاندا خوێندوتانەتەوە، ئەوەی لە تەلەفیزیۆن بینیوتانە، و هەوڵبدەن سروشتی پیاو لەلاپەرەی ئەم پەرتووکەوە ئاشکرا بکەن. پیاوان هەمیشە پێیان وایە کە ژن بەردەوام ئامۆژگاری لەژنانی دیکەوە وەردەگرێت، بۆیە نازانن پیاو پلان و تاکتیکی چییە و چۆن بیر ئەکاتەوە.

پەرتووکی››وەک خانم رەفتار بکە و، وەک پیاو بیربکەرەوە›› بەتەواوی ئەم دۆخە ئەگۆڕێت، ئەگەر تۆ لەپەیوەندیدایت لەگەڵ پیاوێکدا و ئارەزوومەندی کەئاستی پەیوەندییەکەتان بەرز بکەیتەوە و باشتری بکەیت، کەواتە ئەم پەرتووکە تاڕادەیەک تایبەتە بە تۆ.

ئەگەریش لەپەیوەندییەکی جدی دایت و چاوەڕێی ئەوەی ئەلقەی هاوسەرگیریت پێشکەش بکات، ئەوە هەر ئەم پەرتووکە تایبەتە بە تۆش، ئەگەریش هاوسەرگیریت کردووە و ئەتەوێت دووبارە کۆنترۆڵی شتەکان بکەیت و پەیوەندی نێوانتان بەهێز بکەیتەوە، یان ئەگەر تۆ بێزار بوویت لەدەست یارییەکانی مێردەکەت، من ئەمەویت سود لەم پەرتووکە وەربگریت، وەک هۆکارێک هەموو بنەماو یاساو ڕێسا و ئەو ئامۆژگاریانەی لێرەدا باس کراوە بەکاربهێنێت. بۆ بەگژداچوونەوەی یاریەکانی مێردەکەت بەرامبەرت و بەرەنگاربوونەوەی هێرشەکانی و بەرگری کردن. کە ناتوانرێت بوەستێنرێت، وە ناتوانێت بەرگەی بگرێت.

لەبەرئەوەی متمانەتان بەمن هەیە، بوەستن لەدووبارە بەکارهێنانەوەی پلانە کۆنەکانتان، چونکە چیتر سەرناگرن، لەڕاستیدا گەورەترین پلان کە لەجبەخانەی چەکەکانتاندا هەیە ئەوەیە کە دەکەوێتە پەیوەندییەوەو وادەزانێت دەتوانێت پیاوەکان «بگۆڕێت». ئەمە خراپ ترین و شکست خواردوترین پلانە، بۆچی؟

هۆکارەکەی ئەگەڕێتەوە بۆئەوەی کەژنانی دیکە بیرو بۆچوونیان هەرچیەک بێت، کە لەگۆڤارەکاندا ئاماژەی پێدەکەن و لەبەرنامەی «تۆک شۆو»ی تەلەفیزیۆنی، لێرەوە تا تیمبوکتو(شوێنێکە)، شت گەلێکی سەرەکی هەن لەپیاواندا کەهەرگیز ناتوانرێت بگۆڕدرێت، هەتا ئەگەر هەرچەنێک باشبێت لەگەڵیان و لێیان تێبگەیت، تۆ هەر مایەی فرتوفێل و یاریەکانیان نەبێت، هەتا تێنەگەیت لەداڕشتن و ڕێخستنیان و نەزانێت چی

ئەیجوڵێنێت و تورەی ئەکات و چۆن ئەکەوێتە خۆشەویستییەوە.

بەهۆی ئەم پەرتووکەوە، دەتوانیت مێشکی پیاوان بخوێنیتەوە و لێی تێبگەیت و لەڕێی ئەمەوە دەتوانیت بەشێوەیەکی باش خەونەکان و پلانەکان و ئارەزووەکانت جێبەجێ بکەیت.

لەهەمووی باشتر ئەوەیە دەتوانیت ئاشکرای بکەیت کەپیاوان پلان بۆ پەیوەندییەکی جدی دادەنێن، یان تەنها بۆ یاریکردن پێت؟ وەلەبەر ئەوە وەک خانم ڕەفتار بکە و، وەک پیاو بیربکەرەوە.



# چی پاڵ بەپیاوەوە دەنێت

لەو ڕستە ڕاستتر نیە، کەبڵێی ‹پیاوان بەڕاستی کەسانی سادەن›، سەرەتا ئەگەر ئەمە بخەیتە میشکتەوە، هەموو شتێک دەربارەی پیاوان کە لەم پەرتووکەدا فێری دەبیت، هەموو شتێک شوێنی خۆی دەگرێت، کاتێک کەبڕوات بەخۆت هێنا، پێویستە لەسەرت هەندێ؛ ڕاستی سەرەکی تێبگەیت: پاڵنەری سەرەکی پیاوان ئەوەیە کەکێن و چی ئەکەن و چی بەدەست دەهێنن..!

پیاوان لایان گرنگ نیە، ئەگەر بەڕێوەبەری جێبەجێ کار بن، یان کارگوزاری پاککردنەوە بن، یان ئەگەر هەردووکیان بێت، لەبەرئەوەی هەرچییەک بکات بەهۆی نازناوەکەیەوە لێی دەرباز دەبێت(کێیە...!) چۆن ئەم نازناوەی دەستبکەوێت(چی بکات..!) و ئەو پاداشتانە چین کە دەستی دەکەوێت، لەبەرامبەری هەوڵەکانیدا(چەندی دەست دەکەوێت..!)

ئەم سێ شتە بەردی بناغەی‹DNA›ی پیاوەتین، پیاوان ئەبێت ئەم سێ شتە بەدەست بهێنن، تاوەکو ببنە پیاوی ڕاستەقینە، بۆ ئەوەی لەڕێی ئەمانەوە بەئامانجەکانیان بگەن، وئەم جۆرانە لەپیاوان ئەگەر پەیوەندیت لەگەڵییاندا هەیە و

لەگەڵ یەکتر پێکهاتوون، یان بەتەمای هاوسەرگیری لەگەڵ بکەی، ئەوە ئەم جۆرانە زۆر سەرقاڵن و ناتوانێت بیر لەتۆ بکاتەوە.

بیری لێ بکەرەوە: لەو ساتەی کەکوڕێک تێیدا لەدایک ئەبێت، ئەوانەی دەورووبەری خێرا ئەڵێن: لەداهاتوودا چ ئیشێک ئەکات، تا ببێت بەپیاوێکی ڕاستەقینە، هەر بۆیە کوڕان فێری بەهێزیی دەبن و ڕکابەریی دەکەن، سەردەکەوێت و لەسەر پێی خۆی دەوەستێت، بەبێ ئەوەی بگری و ڕێگە بەکەس نادات بەسوکی مامەڵەی لەگەڵدا بکات و پشتگوێی بخات.

کوڕ فێر دەبێت چۆن بەسەختی تێبکۆشێت، و ئیشە سوک و سادە و ڕۆتینییەکانی پەیوەست بەماڵەوە ئەکات، عەلاگەی میوە و شتومەکەکان لەئۆتومبێل دادەگرێت، زبڵەکانی ماڵی فڕێ ئەدات، و بەفری دەورووبەری ماڵەوە دەماڵێت و چیمەنەکە کورت دەکاتەوە(دەبڕێتەوە). وە کاتێک ئەچێتە تەمەنی پێگەشتنەوە و گەورە ئەبێت، هەوڵی دەستکەوتنی ئیشوکار و پیشەیەک دەدات، کوڕان فێر دەبن پارێزگاری لەدایک و خوشک و برا بچوکەکانیان بکەن، ئاگای لەماڵ و خێزانەکەی ئەبێت و تایبەتمەندییەکانیان دەپارێزێت، کەفێرئەبێت ناوی خێزانەکەی بە بەرزی و باشی بهێڵێتەوە، وە ناوبانگێک بۆ خۆی دروست بکات، تا کاتێک چووە ژوورەکەی خۆی کە»کێیە..!»و «چی دەکات..!» و «چەندی دەست دەکەوێت..!» و کوڕ هەموو ئەم شتانە فێر دەبێت، لەپێناو یەک شتدا (پیاوەتی)، ئەم تێکۆشانە بۆ بەدەستهێنانی (پیاوەتی) ناگۆڕێت کاتێک کوڕ گەورە ئەبێت.

بکرە مەزن دەبێت و ئەم گرنگی پێدانەی هەمیشە بەردەوام دەبێت، و وەک خۆی ئەمێنێتەوە کەهەیە(چی ئەکات..!) و(چەندی

دەست دەکەویت..!). تاوەکو هەست بکات ئەرکی خۆی بەجێ هیناوە، و هەتا پیاو وابکات رۆڵی ژن لەچوارچیوەی پرکردنەوەی کەموکوری کەلین کورت دەکریتەوە، وە پیاو بیر لەجیگیر بوون و منال خستنەوە ناکاتەوە، یان پیکەوەنانی مال لەگەل کەسیکی تردا. هەتا ئەم سێ شتە بەدەست نەهینیت.

من نالیم هەر دەبیت بەدەستی هینابیت، بەلام بەلایەنی کەمەوە دەبیت لەریگەی هەولی بەدەستهینانیان بیت، بەدلنیایەوە بۆ منیش هەروا بوو، من هەرگیز لەبیری ناکەم، کەچەند بێ هیواو بیزار و رەنجاو بووم، کەبیست سالان بووم، لەکومپانیای فورد بۆ ئوتومبیل دوور خرامەوەو دەرکرام، وازم لەخویندی کولیژ هینا و بیکار مامەوە، بەسەختی دەمتوانی پارەی تەواوەتیم دەستبکەویت بوئەوەی خۆمی پی بژینم. چ بکات بەخیزان، ئەمە وای لیکردم زۆر نیگەران بم لەداهاتوم، دەبیت چ کاریک بکەم؟ چەند قازانج دەکەم؟ نازناوم چی ئەبیت؟

نازناوەکانی(دەرچووی زانکو) و (پشکنەر لەکومپانیای فورد)، رۆشتن و بونیان نەما، مادام ئیستا بێ ئیشم و کارم نیە، هەلی گەرانەوەم بۆ مالەوە بەموچەیەکی باشەوە لەدەست چوو، هیچ بیروکەیەکم نەبوو، کە بە چ ریگەیەک پارە پەیدا بکەم، ماوەیەکی خایاند تاخۆم گرتوو لەسەر پێی خۆم وەستام، چەندین ئیشی جوراوجورم ئەنجام دا: لەپاکردنەوەی راخەر (فەرش)کارم کرد، لەفرۆشتنی مافور و چەندین بەرهەمی دیکە، فروشتن و گەیاندنی بەرهەمەکانی دابەزاندنی کیش، کاری شیتانەم ئەکرد بۆ پیکەوەبەستن و ریخستنی ژیانم، وە دۆزینەوەی کچیک و هاوسەرگیری کردن لەگەلی و جیگیر بوونم، کوتا شت بوو کەبیری لیبکەمەوە. شەویک ئەو ژنەی نوکتەی

پێ دەنوسیم هانی دام کەبڕۆم بۆ یانەی شەوانەی ناوخۆی تایبەت بە( نمایشە کۆمیدیەکان) وەناوی خۆم تۆمار بکەم و بۆ پێشکەشکردنی نمایشێک، لەشەوێکی تایبەت بۆ ئەوکەسانەی کەشارەزاییەکی ئەوتویان نیە، وە بۆخۆشی، باشە، سەیرکە من دەمزانی کەکەسێکی کۆمیدیم، چەند دۆلارێکم پەیدا کرد، «تەنها چەند دۆلارێکی زۆر کەم» لەرێی نوسینی تێکست بۆ کۆمیدیە ناوخۆییەکان کەهەولیان دەدا بێنە ناو ئەم بوارەو تیای دەست بەکاربن، بەلام من بێ ئاگابوم و نەمدەزانی چۆن بێمە ناو ئەم بوارەوە، هەتا ئەو ژنە شتێکی لەمندا بەدی کرد و بانگی کردمە سەر شانۆ (ستەیج ) منیش کردم و مەبەستەکەم پێکا، و هەموانم سەرسام کرد و (٥٠ $)م دەستکەوت، بۆ ئەمڕۆ لەوانەیە ئەم برە پارەیە شتێکی زۆر نەبێت، بەلام لەو کاتەدا بۆمن وەکو (٥٠٠٠$) وابو لەبەر کردنی نوکتەیەک.

لەگەل ئەوەشدا، گرەنتی وەرگرتنی (٥٠$) ترم هەبو لەهەفتەی داهاتودا لەنمایشی شەوانەی (گالتەو گەپ)، چونکە کەسی براوەبوم لەم هەفتەیەدا، رۆژی دواتر (٥٠$)م بردەوە و چوم بۆ چاپەمەنی بۆ چاپکردنی کارت (بلیت)ی تایبەت بەخۆم، لەلایەکی کارتەکەوە ژمارەی موبایلەکەمم نوسی، لەگەل (ستیڤ هارڤی کۆمیدی) بلیتەکان زۆر درەوشاوەو جوان و ڕون نەبون، وە پیتەکانی دیار و دەرپەڕیو نەبو، بەلام بلیتەکان ئاماژەی بەوە دەکرد کەمن ستیڤ هارڤیم ( من کێم)، من خاوەنی بەهرەیەکی تایبەتیم لەکۆمیدیادا ( چی دەکەم)، بەم شێوەیە تەنها ئەوە مابو کەبزانم چەندم دەست دەکەوێت (چەند پەیدا دەکەم)، بەلایەنی کەمەوە من ئەوەم دیاری کردبو کەمن «کێم «و›› چی دەکەم›› ئەگەر ئێمەی پیاوان هەولی بەدیهێنانی خەونەکانمان نەدەین

و کێبڕکێی بەدەستهێنانی «کێین» و «چەند پەیدا دەکەین» نەدەین ئەوا فەوتاوین. بەڵام لەو کاتەی ئەم مەتەڵە شیدەکەینەوە و هەست دەکەین خەونەکانمان خەریکە سەردەگرێت، ڕۆح ئەکرێتەوە بەبەرماندا و دووبارە ئەژێینەوە و، وامان لێدەکات چالاک و بەجۆش بین و بەدڵسۆزی کار بکەین، لەو ساتەوە کەبووم بەکۆمیدی زۆر بەئامادە باشییەوە چوومە سەر ئەو تەختەی شانۆیە بۆئەوەی ببمە باشترین.

تەنانەت ئەمڕۆش بۆم گرنگ نییە چەندێک ماندوم، و چی لەژیانمدا ڕوودەدات، هەرگیز کارەکەم پشتگوێ ناخەم. هەرگیز نەبوە لەکاتی خۆیدا نەچمە سەر ئیش و دوابکەوم، بۆچی؟ لەبەرئەوەی کاتێک هەڵدەستم خەونەکانم کۆنترۆڵ کردوە، هەموو ڕۆژێک بەزیندویی و ڕەنگاو ڕەنگی خەونەکەم دەبینم وەکو ڕۆژی ڕووناک، ئەگەر بێت و لە بەرنامەی (بەیانیانی ستیف هارڤی) بم، یان لەبەرنامە جۆراو جۆرەکانی سەر تەلەفزیون بم، یان لەسەر تەختەی شانۆ بم، یان لە میانەی پێشکەشکردنی بەرنامای ڕاستەوخۆی (ستیف هارڤی) بم، ئەوە جێگیرەو ناگۆڕێت کە «من کێم « ( من ستیف هارڤیم ) و چی دەکەم (کۆمیدیم)، وە بێگومان بڕی ئەو پارەیەی کەپەیدای دەکەم هاوتایە لەگەڵ ئەوەی کەچیم بۆ خۆم و خێزانەکەم دەوێت، وئێستا دەتوانم ئاگاداری خێزانەکەم بم و خەرجییەکانیان دابین بکەم، وەک «دابینکردنی تابلۆی کێشراو بۆ ماڵەکەم، بنمیچی کانزایی، کورسی چەرم، سەگی پاسەوانی، چەندین ئوتومبێلم هەیە لەکەراجەکەمدا، دابینکردنی قیستی کۆلیجی منداڵەکانم، ئێستا دەتوانم هەموو ئەوە دابین بکەم کەهەمیشە هیوام بۆ دەخواست، دەتوانم پارێزگارییان لێ بکەم بەو شێوەی خۆم

دەمویست، من لەڕوانگەی خێزانەکەمەوە بەبێ هیچ دودڵییەک بووم بە پیاو وە لەبەرئەوە بەمێشکێکی سافەوە شەوانە دەخەوم، ئەمە پاڵنەری سەرەکی هەموو پیاوێکە، چجای ئەگەر باشترین یاریزانی «NBA» (تیپی باسکەی ئەمریکی) بێت، یان سەرکەوتوترین ڕاهێنەری توپی پێ بێت لەگوندەکانی «مینی سوتا»، ئەگەر سەرۆکی کۆمپانیای «فۆرشن ٥٠٠» بێت، یان نانەواچی بێت لەنانەوایەکی لا کۆلان، یان سەرۆکی دەستەیەکی یەکگرتوو بێت، یان سەرکردەی ساختەچییەکانی گەڕەکێکی هەژارنشین بێت، ئەگەر هەموو ئەمانەش بێت هەر شتێکی تایبەت هەیە لە DNA پیاودا، کەوای لێدەکات پارێزەری خێزانەکەی و خەرجییەکانیان بێت، وە ڕووبەڕووی هەرشتێک ئەبێتەوە بۆ گرەنتی خێزانەکەی و خەرجیەکانیان، وە ئەگەر پیاوێک بتوانێت خانویەک دابین بکات، کەواتە دەتوانێت خێزانەکەی بپارێزێت لەمەترسییەکانی دەوروبەری.

ئەگەر توانی جووتێک پێڵاوی وەرزشی بۆ منالەکەی بکڕێت، ئەوا لەوپەڕی دڵخۆشی و متمانەدایە، کەدەتوانێت بەدڵنییای و بێخەمی کچ و کوڕەکەی بنێرێت بۆ خوێندن، وە ئەگەر توانی گۆشت بکڕێت لەفرۆشگا، ئەوا هەست بەئاسودەیی دەکات، چونکە توانیویەتی خێزانەکەی تێربکات، ئەگەر لەوە کەمتریان پێ بکڕێت ئەوا هەست دەکەن پیاو نین.

لەوەش زیاتر ئێمە دەمانەوێت یەکەم بین، ئەمانەوێت لەشوێنێک باشترین بین، لەکاتی بەرپرسیارێتی. ئێمە ناتوانین هەموو کاتێک سەرمەشق بین لەژیاندا، بەڵام لەبەشێکی ژیاندا ئەو کەسە دەبین کەهەموان ڕووی تێدەکەن، ئەمەش زۆر گرنگە بۆ ئێمە، ئێمە بەڕاستی دەمانەوێت خۆمان هەڵبکێشین

و شانازی بەخۆمانەوە بکەین (خۆ فشکردنەوە)، مافی وتنی « من ژمارە یەکم›› کەژنان زۆر ئەمەیان بەلاوە گرنگ نییە ، بەلام بۆ ئیمە...؟ هەموو شتیکە بۆ ئیمەی پیاو، دوای ئەوەی ئەوەمان بەدەستهینا، هەرچیمان کرد ئەبیتە هۆی ڕاکیشانی سەرنج بۆ لای خۆمان و دەبینە جیگەی سەرنج، کاتیکیش بووین بەکەسیکی بەرچاو دەبیت بەهەر جۆریک بیت ژنان ئەمە ببینن، ئەگینا سودی چییە ببین بە ژمارە یەک و باشترین، تۆ دەبیت ئەمە بزانیت تا لەپالنەرەکانی پیاوان تیبگەیت، هۆکاری ئامادەنەبوونی لەمالەوە، هۆکاری بەسەر بردنی زۆرترین کات لەسەر کار، هۆکاری ئامەزرۆیی بۆ پارەکانی بەو شیوەیە. بۆیە وادەکات چونکە لەکارەکەیدا پیاوانی دیکە هەن ڕیگرن لەبەردەمیدا لەبەدەستهینانی نازناو و پارەکانی کەپەیدای دەکات، ئەمە کار لەبارودۆخی دەرونی دەکات(مەزاج)، ئەگەر تۆ بتوانیت دەریبخەیت کەهەست دەکات لەشوینە گونجاوەکە نیە، کە خۆی دەیەویت، یان لەسەر(هیلی دروست نیە) تا بگاتە شوینی مەبەست، دەتوانیت تیبگەیت لەهۆکاری بیزاری وئالۆزی و دۆخی دەروونی چیە؟ وە تۆ تیدەگەیت و بۆت ڕوون دەبیتەوە بۆچی ناتوانیت لەگەلیدا بیت و قسەی لەگەل بکەیت و گفتوگۆیەکی باش بکەن، بۆت ڕون دەبیتەوە کەزیاتر میشکی لای ئەم سی شتەیە، کە پالنەری پیاوانە، ئەگەر بەم شیوەیە دلی لای ئەم سی شتە بیت و سەرقالی بیرکردنەوە بیت لیی، نەتوانیت نازناوی خۆی چارە بکات لەگەل نیشەکەی و ئەو برەی کە بەباشی دەزانیت پەیدا بکات، کەواتە ناتوانیت ببیت بەو پیاوەی تۆ دەتەویت، وە بەو شیوەی دەتەویت دەربکەیت، پیاو ناتوانیت لەگەلت دابنیشیت و قسەت لەگەل بکات، تەنانەت

ناشتوانێت خەون بەهاوسەرگیری و دروست کردنی خێزانەوە ببینێت، ئەگەر مێشکی لای پارە پەیاکردن و دەسکەوتنی پێگەیەک و نازناوێک بێت، ئیتر چۆن ببێت بەو پیاوەی تۆ دەتەوێت.

لە ئەزمونی خۆمەوە دەڵێم، ئەم راستیانە هەمیشە لەگەڵ زۆربەی ژناندا کار ناکات، زۆربەتان پێتان وایە ئەگەر پیاوێک بەڕاستی خۆشی بوێت هەوڵ دەدەن پێکەوە خەونەکانتان بێننە دی، راستە دەتەوێت ماڵ پێکەوە بنێت، بەڵام تۆ بەلاتەوە پەسەنترە کەپەیوەندی دابنێی لەگەڵی، گرنگ نیە بەلاتەوە باری دارایی هەرچۆنێک بێت، ئەمە بیر کردنەوەیەکی شەریفانەیە، بەلام ناگونجێت لەگەڵ شێوازی کارکردنی پیاواندا، چاوی پیاو هەمیشە لەسەر خەلاتەکەیە، خەلاتێک کە لەوانەیە بەکەلکی تۆ نەیەت، هەتا نەگات بەو پێگەی مەبەستییەتی. مەحالە ئێمەی پیاو بتوانین تەرکیز لەسەر هەردوکیان بکەین پێکەوە، چونکە ئێمە ئەوەندە بەهرەدارنین بەداخەوە.

بیرت بێت، پیاو ناچار نیە کە هەر ئیستا پارەیەکی زۆر پەیدابکات.

هەر کەدەبینێت خەونەکانی بەدیهاتووە، و نازناوەکەی ڕون وئاشکرایە بۆی، پێگەو ئیشەکەی ئەیگەیەنێت بەوەی کەدەیەوێت، دەزانێت پارە زوو بێت یان درەنگ خۆی دێت، لەبەرئەوە زۆر هەوڵ نادات، چونکە دەزانێت خەریکە دەبێت بەو پیاوەی خۆی دەیەوێت. بۆیە تۆی خانم دەتوانێت یارمەتی بدەیت لەبەدەستهێنانی ئەمەدا، بەیارمەتیدانی لە تەرکیزکردن و تێڕوانینی لەسەر خەونەکەی و جێبەجێکردنی.

ئەگەر توانیت خۆت لەم پرۆژە››پلان››ە ببینیتەوە، دەتوانی لەم خالە بەجوانی تێبگەیت، لەم بەشەدا››پێنج پرسیار کە

پێویستە هەمو ژنێک بپرسێت، پێش ئەوەی لەپەیوەندیەکدا نوقم بێت›› ئەبێت پێوەی پەیوەست بێت، چونکە کاتێک پیاو ئەگات بەئاستی سەرکەوتن کە خۆی مەبەستییەتی، ئەبێت بەباشترین و دلخۆشترین پیاو و تۆش بەهەمان شێوە لەگەڵی دلخۆش دەبێت.



# خۆشەویستی ئێمە
# لە خۆشەویستی ئێوە ناچێت:

هیچ شتێک لەسەر ئەم هەسارەیە ناتوانرێت بەراورد بکرێت بە خوشەویستی ژن__خوشەویستییەکی بەسوز- میهرەبان- فراوان- بەخشندە- وجوان و بی مەرجە- پاک و بێگەردە.

ئەگەر تو پیاوی دلخوازی بیت، ئامادەیە شتی مەحالیش بکات لەپیناو تودا، گرنگ نیە چون ڕەفتار دەکەیت، گرنگ نیە چەند شتی شیتانەت کردووە، کات و خواست هەرچییەک بیت، ئەگەر تو دلخوازەکەی بیت قسەت بو دەکات، هەتا وشەکانی تەواوە دەبن، و کاتیک لەتەنگەژە و ناهەمواریدایت و هەست ئەکەی هیچ شتیک ناتوانیت دەربازت بکات، هانت دەدات و پشتگیریت دەکات، لەباوەشت دەگریت کاتیک نەخوشیت، وە لەگەلت پی دەکەنیت کاتیک سەردەکەویت، وە ئەگەر پیاوی دلخوازی ئەو بیت، ئەگەر توی خوش بویت، بەس خوشەویستییەکی ڕاستەقینە ئەلیم، ئەت درەوشینیتەوە کاتیک توزاویت، و هانت دەدات کاتیک شکستت هیناوە، و بەرگریت لیدەکات تەنانەت ئەو کاتانەشی کەدلنیا نیە تو لەسەر هەق بووی، وبەباشی گوی لەهەر وشەیەکت دەگریت

لە کاتێکدا تەنانەت کە شتگەلێک دەڵێی کە شایەنی گوێگرتنیش نیە، و گرنگ نیە چی ئەکەی، و لای گرنگ نیە کەهاوڕێکەی چەند جار پێی دەڵی کە: تۆ پیاوێکی گونجاو نیت بۆ ئەو، و لای گرنگ نیە چەند جار لە پەیوەندیدا چەند جار دەستت ناوە بەڕوویەوە، باشترینی خۆیت پێ دەبەخشێت، بەڕاستی هەوڵی بەدەستهێنانی دڵت ئەدا، تەنانەت کاتێک تۆ وا خۆت دەردەخەیت کەهەمو ئەوەی کردویەتی تۆی ڕازی کردووە، هێشتا واهەستدەکات بەس نیە.

خۆشەویستی ژن ئاوایە، بەرگەی هەموو تاقیکردنەوەیەکی لۆژیکی(مەنطیقی)، و هەموو هەلومەرجێک دەگرێت ،و بەتەواوەتی ژنان چاوەڕێی هەمان شت دەکەن، لەبەرامبەردا بەهەمان شێوە خۆشت بوێنەوە.

ئەگەر پرسیار لەهەر ژنێک بکەی کە چ جۆرە پیاوێکت دەوێ بۆ خۆشەویستی..؟؟

شتێکی لەم شێوەیەت پێ دەڵێت: دەمەوێت سادە، زیرەک، قسە خۆش، ڕۆمانسی، بەهەست ، خانەدان بێت، و لەسەرو هەمویەوە پاڵپشت بێت، و دەمەوێت سەیری چاوەکانم بکات و پێم بڵێ کە(من جوان)م و من تەواوکەری ئەوم، و پیاوێکم دەوێت ئەوەندە لاوازی تێدا بێت کەئازاری هەبوو بگری. و بە ڕووخۆشییەوە بەدایکیم بناسێنێت، منداڵان و ئاژەڵانی خۆش بوێت، و ئامادەبێت دایبی(حەفاضە)ی مناڵ بگۆڕێت و، قاپەکان بشوات، ئەم کارانە بکات بەبێ ئەوەی ناچار بم خۆم داوای لێ بکەم.

ئەگەر لاشەیەکی جوان و پارەیەکی زۆر و پێڵاوێکی گرنبەهای هەبێت بەبێ شوخت(ڕوشان)، باشتریش ئەبێت. ئامێن.

من لێرەم تا پێت بڵێم کەپێشبینی کردنی ئەم خۆشەویستییە و پیاوێک بەم تەواوییەوە(بێ کەم و کوڕی)یە شتێکی ناواقعییە.

ڕاستە، من وتم ڕونادات، مەحاڵە، چونکە خۆشەویستی پیاو وەک هی ژن نیە، بەدەستی ناهێنێت بە سەرلێشێواوی، ئێستا من ناڵێم ئێمە ناتوانین خۆشەویستی بکەین، من تەنها ئەڵێم خۆشەوستی پیاو زۆر جیاوازترە، زۆر سادە و ڕاشکاوانەیە، لەوانەیە بەدەستهێنانی قورس بێت.

شتێکی گرنگت پێ دەڵێم: ئەو پیاوەی کەخۆشی دەوێیت، لەوانەیە هەموو نیو کاتژمێر جارێک پەیوەندیت پێوە نەکات و خۆشەویستی خۆیت بۆ تازە بکاتەوە، لە کاتژمێر ٥:٣٠ی ئێوارە لەکاتێک کاتژمێر ٥:٠٠ وای کردوە.

پیاو دانانیشێت دەست بەسەر و قژتدا بهێنێت و پارچەیەک پەڕۆی سارد بخاتە سەر ناوچەوانت وتۆش کوپێک چای گەرم بخۆیتەوە و هەوڵ بدەی کەزوو چاک ببیتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا خۆشەویستییەکەی هەر خۆشەویستییە.

تەنها ئەوەیە خۆشەویستی پیاوان جیاوازە لەخۆشەویستی ژنان، کە ئەیبەخشێت و لەبەرامبەردا دەیەوێتەوە، لەزۆربەی بارودۆخەکاندا بەم شێوەیە، من مشتومڕی ئەوەمە، کەئەگەر زۆر بەسادەیی و بەتەواوەتی بزانیت پیاو چۆن خۆشەویستی دەکات، لەوانەیە ئەو پیاوە بدۆزیتەوە کە لەپێشتەوە وەستاوە و هەموو شتێکی خۆیت پێ دەدات، بگرە زیاتریش، چۆن دەزانیت پیاوێک تۆی خۆش دەوێت..؟؟ زۆر بەسادەیی هەر یەک لەم سێ شتە دەکات:

## بانگەشە بۆ خۆشەویستییەکەی دەکات:

ئەگەر پیاویک توی خوشبویت، ئامادەیە بە هەمووانی بلێت. ئەلیت: سەیرکە پیاو ئەمە ژنی منە، یان ئەلیت: ئەمە خوشەویستمە، یان ئەمە دایکی منالەکەمە، یان ئەمە خانمەکەمە و هەندیک وشەی دیکەش، ئەگەر پیاویک نازناویکی دیاری پی بەخشیت وەک: ئەمە هاوڕیمە یان ئەمە...(نازناوەکەت ئەلیت) ئەمەش ئەوە دەگەیەنیت کە ئەو پیاوە شوینیکی تایبەتی بو داناویت لەدلیدا ،و بەراستی هەستی بوت هەیە، و نازناویکت پی دەبەخشیت، ئەم نازناوە شیوازی ئەوە بونەوەی بەدەنگیدا هەمووان بزانن کەشانازی دەکات کە لەگەل تودایە، لەگەل تودا پلانی بو داهاتوو هەیە، و دوور دەڕوانیت و هەست دەکات کە ئەمە دەستپیکیکی نایابە.

ئەو پیاوەی کەتو بەژنی دلخوازی خوی دەزانیت، هەول دەدات بلیت من داوات دەکەم و هی منیت، هەول دەدات هەر ئیستا بەهەمووانی ڕابگەیەنیت و هەر پیاویک گویی لەپیاویکی دیکە بوو کەوتی: «ئەم خاتوونە خوشەویستمە»، دەزانیت کەپیویستە هەموو(یاری و فیل و تەلەکە و پلان و پروژانەی) بەمیشکیدا دیت سەبارەت بەم خانمە جوان و سەرنج ڕاکیشە بخاتە لاوە و بیری لی نەکاتەوە. لەبەرئەوەی پیاویکی دیکە بەدەنگی بەرز ڕایگەیاندووە کەئەم ژنە تایبەتە بە ئەو و (بەردەست نیە بوپلانگیری هیچ کەسیکی دیکە).

ئەمە ئاماژەیەکی تایبەتە، ئیمەی پیاو هەموومان دەزانین و ڕیزی دەگرین، وەک ئاماژەیەکی جیهانیە بو(هەرشتیک یان هەر شوینیک کە سنووردار کرا بیت)، ئەگەر بەهاوڕیی بانگی کردی،

یان بەناوی خۆتەوە، تۆ لای ئەو هەر ئەوەندە دەگەیەنێت، لەوە زیاتر سەیرت ناکات. ئێوەی خانم لەناخی دڵتانەوە باش دەزانن، ئەمەم بۆ هاوڕێیەکی خۆم باس کرد، زۆر پێکەنی، چونکە خۆی دەیزانی ولەنزیکەوە بینیبوی بەچاوی خۆی.

لەیەکێک لەبۆنەکانی ئێوارەی سەری ساڵدا، کەئەم هاوڕێیەم ڕاهاتبوو هەمیشە لەگەل خێزانەکیدا، یان لەگەل هاوڕێ نزیکەکانیدا بێت و ئامادە بێت، ماوەی دوانزە ساڵ. هاوڕێکەم وتی پیاوێکی ئەناسی کە هەموو ساڵێک لەگەل کچێکی تازەدا دەهات بۆ ئەم بۆنەیە_کچەکان یەک لە یەک جوانتر بوون_ و لەگەل کۆمەڵێک بەسەرهاتی دیکە لە لەسەر کارەکەی و پشووەکانی و یان پرۆژە بازرگانییە تازەکانی، و ئەم جۆرە شتانە.

هەرچەند ژن و چیرۆکەکان دەگۆرا و جیاواز بوون، بەلام تاکە شت کە نەدەگۆرا و جێگیر بوو ئەوە بوو کە: هیچ یەکێک لەم خانمانە نازناوی››خانمەکەی››یان››کچە هاوڕێکەی››ی وەرنەدەگرت. بە بێ هیچ دوودڵییەک کاتی ناساندن بێجگە لەناوەکانی خۆیان زیاتری پێ نەدەوتن. و لەگەل ئەوەش تەواوی شەوەکەی بە خواردنەوە و گفتوگۆ کردن لەگەل هاوڕێ کۆنەکانی و هاوپۆلەکانی بەڕێدەکرد. لە کاتێکدا کچەکەی بەتەنها لەسەر مێزەکە جێدەهێشت و کچەکە زەردەخەنەیەک دەکات بەعەزییە نەخشینەکەیەوە هەوڵ دەدات لەگەل دۆخەکدا ڕابێت، و هەموان زۆر باش دەیانزانی کەئەم دووانە هەر چوونە ئەودیوو دەرگاکە هەر کەسەو بەڕێگای خۆیدا دەڕوات. و کەس جارێکی تر ئەم کچەی لەگەلی نەدەبینییەوە.

لەناهەنگەکانی دواتردا، کوڕەکەیان لەگەل خانمێکی

نویدا بینی، کە دەستی یەکتریان گرتبوو و پیدەکەنین وەک پشیلەی››چیشیر››، و کاتیک بە هەمووانی ناساند ئامازەی بەوە کرد کەئەمە «خانمەکەیەتی›› و››خۆشەویستەکەیەتی››. و هەمووان دەست بەجی زانییان کە چی دەگوزەریت، ئەوە بەهۆی ئەو نازناوەوە نییە کە پیی بەخشیوە، بەلکو بەهۆی چۆنییەتی ڕەفتار کردنیتی لەگەلیدا، چونکە دەستی دەگریت و کاتیک قسەی لەگەل دەکات ڕاستەوخۆ سەیری نیو چاوەکانی دەکات، و بەهەموو هاوپیشەکانی(هاوڕێ زۆر باشەکانی کاری) دەناسینیت، و ڕادەکات بۆ مەیخانە و خواردنەوەی بۆ دەهینیت و سەمای لەگەل دەکات، بەشیوەیەک وەکو ئەوەی نەیەوێ ئەو شەوە تەواو ببیت. و کاتیک شەو هەمووان دەڕۆنەوە، دەزانن کەجاریکی دیکە ئەم خانمە لەگەلی دەبیننەوە کەدەستی لەناو دەستی ئەو پیاوەیە کە تانیستاش سەلتە، پیاویک کەهیندەی «دیانا ڕوز››جلەکانی لەکۆنسیرتەکاندا دەگۆڕیت، ژنی دەگۆڕی.

ئەی تۆ نەتزانیوە..؟ سالی داهاتوو هاتنەوە بۆ ئاهەنگەکە، خانمەکە هەلگری نازناویکی نوێ بوو››دەستگیراندار›› (نیشان کراو)، بیگومان ئەو بەشیک بوو لەپلان و پرۆژەی ئەم پیاوە.

لەبەرئەوە، ئەگەر تۆ بەلایەنی کەمەوە ماوەی ٩٠ڕۆژە لەگەل پیاویک پەیوەندیت هەیە وهیشتا دایکیت نەناسیوە، و پیکەوە نەڕۆشتوون بۆ کلیسە، و نزیک نیت لەخیزانەکەی و هاوریکانییەوە، و ئەگەر بردیتی بۆ ئاهەنگی کۆبونەوەی کار، و خزمەتگوزاری، ودەزگای زانیاری، و بەناوی خۆتەوە ناساندیتی و بانگی کردیت، کەواتە تۆ لەبەرنامە و پلانەکانی داهاتوویدا نیت. بەلام لەوساتەی نازناویکی پێ بەخشیت، ئەو کاتە داخوازیت دەکات، لەپیشچاوی کەسە گرنگەکانی ژیانی،

ئەگەر ئەو کەسە کوڕی یان خوشکی یان بەڕێوبەرەکەی بێت.
ئەوکات دەزانیت کە بەراشکاوی ئاماژەی بەشتێکی گرنگ داوە
کە ئەمەیە: نیازی خۆی ئاشکرا کردووە بەرامبەرت، لەبەردەم
هەموو ئەو کەسانەی کەدەیانەوێت بزانن.

بانگەشەکردن(دەربڕینی هەستەکانی) کلیکێکە کە لەڕێیەوە
دەزانیت پیاوێک بەجددی داخوازیت دەکات یان نا...

## دابین کردن:

هەر کە پیاو داوای ژنێکی کرد و ئەویش بەشەرەفەوە داواکەی قبول کرد، ئیتر پیاو جەژنیەتی، چونکە سەرکەوتوو بووە. بەسادەی، ئەو پیاوەی خوشی دەوێی پارە دەهێنێتەوە بۆ ماڵەوە، بۆئەوەی دڵنیا بێت کە تۆ و منداڵەکان چیتان پێویستە هەتان بێت ولەهیچتان کەم نەبێت. ئەمە یاسا و ئامانجی ئێمەیە، کۆمەڵگە فێری کردوین بەدرێژایی هەزاران ساڵ ک ئەرکی بنەرەتی پیاو ئەوەیە دڵنیابن لەسەلامەتی و جێگیربوونی خێزانەکانیان، ئەگەر مردووبن یا زیندوو. ئەگینا ئەو کەسانەی خۆشمان دەوێن پێویستیان بەهەر شتێک دەبێت (هەژار دەبن)، ئەمە کرۆکی پیاوەتییە، دەبێت دابینکەر بین. ئەمە هەموویەتی، (باشە، چەند شتێکی دیکە هەیە؛ وەکو چۆن کەسێکی بەخشندە بین، باسی باری ماددی ناکەم، تاچەندێک دەتوانی دابینکەری خێزانەکەت بێت. ئێستا لەمەیاندا مەبەستم باری ماددیە). ئەگەر پیاو گومانی لەخۆی کرد کە توانای دابینکردنی خێزانەکەی نییە، لەلایەنی ماددی و لەچەن ڕوویەکی تریشەوە، ئەوکات «خودی»خۆی لەخۆیدا بەزیندووی دەنێژێت، و هەتا بتوانێت

زیاتر دابینبکات بۆ هاوسەر و منداڵەکانی زیاتر هەست بە گەورەی و چالاکی دەکات. لەوانەیە ئەمە شتێکی زۆر سادە بێت، بەڵام ئەمە ڕاستییە (واقیعە).

وەک دابینکەرێک، پیاو لیستی(وەسڵی پارە) دەدات، کەپێویستە بدرێت، وەک کرێی خانوو، و کرێی گەرمی و کارەبا، وقیستی ئوتومبیل. و میوە و سەوزە دەکرێت وپارەی قیستی خوێندنگە دابیندەکات، و گرنگی بە پێداویستییەکانی تری ماڵەوە دەادت، پیاو پارەکانی لەشتی پڕوپوچ و بێ مانادا بەفیڕۆ نادات، و ئەگەڕێتەوە بۆ لات بەو پارەی پێی ماوە لەگیرفانیدا. کەسێکی خۆپەرست نییە، کەمێک پارە بدات بەتۆ و باقییەکەی(برە زۆرەکە) بۆخۆی هەڵبگرێت. ئەو پیاوەی بەڕاستی تۆی خۆش بوێت ناچار نابێت کەداوای پارەی لێ بکەیت، کەپێویستە، چونکە ئەیەوێت دڵنیابێت کەهیچت پێویست نییە. لەبەرئەوەی هەر دەست پێوە گرتنێک بەپارەوە لەدواییدا ناچاری دەکات پارەی زیاتر بهێنێتەوە بۆ ماڵەوە.

هەر ماچێک کەدەکرێت لەبەرامبەر دابینکردن و کڕینی پێداویستییەکان و جل و بەرگی قوتابخانە و زەخیرە و یارییەکان. و هەر وشەیەکی سوپاسگوزاری کە لەبەرامبەر چاککردنەوەی گلۆپ و ڕووناکی و وایەرەکان پێی دەوترێت، وای لیدەکات زیاتر شانازی بەخۆییەوە بکات وەک پیاوێک. هەر لەبەر ئەمەیە ئەگەر پیاوێکی ڕاستەقینە بێت، هەموو ئارەزووی کڕینی شتێک بۆ خۆی دەخاتە لاوە و زیاتر گرنگی بەدابینکردنی پێداویستییەکانی خێزانەکەی دەدات. و پێویستی بەکڕینی کۆمەڵیک داری گۆلفی نوێ نییە لەگەڵ پێڵاوی گرانبەها وسەیارەی کەشخە، یان هەر شتێکی تر کەپیاوان ئارەزووی

کڕینی دەکەن، بەبەراورد بەدابینکردنی پێداویستییەکانی ئەوانەی خۆشی دەوێن، لەبەر ئەوەی داری گۆلف ناتوانێت بتکات بەپیاوێکی چوار شانە. وەک ئەوەی کەڕێز گرتن و قسەیەکی خۆش لەلایەن ژنەکەتەوە ئەیکات. بەمشێوەیە، هەموو ئەوەی پیاو دەیکات لەپێناو ئەوەدایە کەدڵنیابێت ئەو ژنەی خۆشی دەوێت لێی ڕازییە و هەموو ئەوەی پێوستییەتی هەیەتی.

ئێستا دەزانم، هۆکاری خەمخواردن و نیگەرانی پیاوان لەباری ماددی چییە، پرسیاری ناوێت...، لەسەردەمێکدا کەژن تیایدا پەروەردە بووە، کەببێت بەگەورە(دەم سپی)ی لایەنی مادی پیاوان، ئەو کات ژن ڕێگە دەدات کە لای بوەستێت.

ئەگەرتو بە درێژایی ژیانت پێت وا بووە خەرجیەکانی ڕۆژانەی خۆت فەراهەم کردووە. وە پێت وابووە لەسەرهەموو کەسێک پێویستە پارەی خۆی بدات و خەرجی خۆی دابین بکات، وکاتێک کارتی بانکییەکەت دەرهێنا کەوەسڵی پارەکەت بۆ هێنرا بۆ ئەوەی پارەی خۆت بدەی، ئەوا تۆ چەندجارێک بەبەردەوامی ئەوەت سەلمادووە کەناتوانێت پشت بە پیاوێک ببەستێت، ڕێگریت کردووە شتێک بکات لەپێناوت،

لەبەرئەوە، ئەوە ڕوونە کەبۆچی ناتوانێت بەئاسانی لەم چەمکە سادەیە تێبگەیت.

بەلام بیرت بێت، چی پاڵ(هان) بەپیاوەوە دەنێت؛ پیاوی ڕاستەقینە ئەوە دەکات کە لەسەری پێویستە بیکات، تاوەکو دڵنیا بێت کە کەسەکانی(خێزانەکەی) لەهیچیان کەم نییە و هەموو شتێکیان هەیە، وەک: خانوو، جل و بەرگ، و پێداویستیەکانی بەگونجاوی دابینکرد، و ئەگەر کەمتەرخەمی کرد ئەوا پیاو نییە، یان با بڵێین پیاوەکەی تۆ نییە.

لەبەرئەوەی لە سەرەنجامدا ئەم کارە بۆ کچی کەسێکی دیکە ئەنجام دەدات کەلەوانەیە تۆ نەبێت، بەدڵنیاییەوە، زۆرێک لەپیاوان هەن کە خۆیان لەم بەرپرسیارەتییە ئەدزنەوە، ئەگەر بەهۆی خۆپەرستییەوە بێت، یان گەمژایەتی بێت، یان نەتوانینێکی رەها بێت، یان بەهۆی ئەم سێ شتە بەیەکەوە. بەلام هەندێک پیاو هەن خاوەنی؛ ئاست(خوێندەواری)و، هۆکاری کار، و سەرچاوە نین. تابریکی شیاو (نەکەم و نەزۆر) لە پارە پەیدا بکەن، و ئەگەر نەیتوانی دابینکەری خێزانەکەی بێت، ئیتر هەست ناکات کە پیاو بێت، و هەوڵدەدات لە هەستە توقێنەرەکانی (هەستکردن بەکەمی) هەلبێت، یان هەوڵدەدات ئەم هەستانە بنێژێت لەناخیدا، لەرێگەی خواردنەوە و کێشانی ماددەی بێهۆشکەر.

لەڕاستییدا، لەوانەیە کۆمەلێک نیشانەی(شوێنەوار)ی بەرچاو بەدی بکەیت لەو پیاوانەی کەتوانای دابینکردنیان نیە بۆ خێزانەکانییان، و پشت گوێیان خستووە، هەندێکیان دەستدەکەن بەتاوان کردن لەپێناو قەرەبووکردنەوەی ئەمە، (بەڕوونی، بەشێک لەبەکارهێنەرانی ماددە هۆشبەرەکان (لە سوچی کۆلانەکاندا پێمان دەلێن کەئەمەش بێ سودە)، و هەندێک لە هەلهاتووەکان یان ئەوانەی خێزانەکانیان جێ هێشتووە (ژمارەیەک لەو ژنانەی کەبەخێو کردنی منداڵێکیان کەوتوتە ئەستو بەتاقی تەنها و بەهۆیەوە توشی دەستکورتی و هەژاری بووە، ئەوەمان پێ دەلێن کە بەدڵنیاییەوە ئەمەشیان بێ سودە و سەرناگرێت).

بەلام ئەگەر پرسیار لەهەر یەکێک لەوپیاوانە بکەی کەراست نەبوون لەگەڵ خۆیان و ئەوانەی خۆشیان دەوێن. زیاتر لە

لەئێوە دەمانەوێت، بەبێ ئەوەی چاوەڕێی ئەم بەرپرسیارێتییە سەرەکی و سروشتیە بکەن کە هەموو پیاوێک لەسەرتاسەری جیهان لەسەریەتی و لەئەستۆی گرتووە و داوای ئەکەن، خانمان ئەمە پێی دەوترێت «بەڕێکردن» کە گریمانەو بنچینەیەکی ڕاست و ڕەوایە، (بێگومان ژنیش هەیە ژوان لەگەڵ پیاوێکدا دادەنێت و هاوسەرگیری لەگەڵ دەکات تەنها لەپێناو پارەکانی پیاوان کە هەیانە»، بەڵام ئەوەی کەزۆر هەڵەیە و زۆربەی خەڵک بەهەڵە لیی تێگەشتون سەبارەت بەو ژنانەی کەزۆر بەرونی چاوەڕێی ئەوە لە پیاوەکەی دەکات ئەرک و بەرپرسیارێتیەکانی وەک و پیاو جێبەجێ بکات و ئەبێت ئەمە بزانێت (ئەوە مافێکی ڕەوای خۆتە چاوەڕێی ئەوە لەپیاو بکەیت کەپارەی خواردنەکەت بدات(ژەمی ئێوارەت)، بلیتی سینەمات بۆ بکڕیت و، یان کارتی چونە ژوورەوەی یانەت بۆ بکڕیت، یان هەر شتێکی دیکە کەپێویستە لەسەری بیکڕیت لەبەرامبەر ئەوکاتەی پێت بەخشیوە).

هەمووتان پێویستە بوەستن لەو ڕەفتارە گەمژانەیەی کەئەڵێن (من پارەی خواردنەکەی خۆم دەدەم، تا وەک و پیاو بزانێت پێویستت پێی نیە)، بە نزیکی لەبەشی دواتردا ئاماژەم بەوە کردووە «ئەو سێ شتەی کەهەموو پیاوێک پێویستیەتی «پاڵپشتی، دڵسۆزی(بە وەفایی)، پەیوەندی سێکسی»، پیاوی ڕاستەقینە بەجۆرێک لەجۆرەکان دەیەوێت کەسێک پێویستی پێ بێت(پێویست بێت)، و ئاسانترین ڕێگە تا یارمەتی بدەیت تا بکات بەم پێگە بەرزە، ئەوەیە کەلێی گەڕێیت بۆت دابینبکات (شتێکت بۆ بکات)، ئەمە هەڵسوکەوتێکی دادپەروارانەیە کە بیکەیت.

ئەگەر پیاو خۆشی بوێت...؟ هەر سەنتێک کەپەیدای دەکات

ئەیهێنێتەوە بۆماڵەوە. و ناگەڕێتەوە لەقومارخانەو هەموو پارەکانی بە فیڕۆ دابێت و بلیت ها ئەوە ۱۰۰$ دولارە___ ئەمە هەموو ئەوەیە کە ئەم هەفتە پەیام کردووە، بەڵکو ڕاستەوخۆ بەرەو ماڵەوە دەگەڕێتەوە بە چەکی پارەکەی(هەموو ئەوەی پەیای کردووە)، دوای دابینکردن و کرینی هەموو پیداویستیەکانی تۆ، ئەگەر باقی مابێتەوە ئەیهێنێتەوە، زۆر چاکە.

## پیاوی ئیش ئاوایە چاوەکەم وە هەر واش ئەکات.

لەپاڵ دوخی ماددیدا ڕیگەی جیاوازتر هەیە بۆ دابینکردن. لەوانەیە پیاوەکەت موفلیس بێت، بەلام هەموو شتێک دەکات، بەهەموو توانایەوە بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەمە، بەدابینکردنی پیداویستیەکانت بەڕیگەیەکی دروست، ئەگەر کەموو کورتیت هەبوو لە میوەو سەوزە(پیداویستیەکانی ماڵەوە)، لەوانەیە لەتوانایدا نەبێت پارەت بداتی بڕۆی بۆ فروشگا، بەلام لەوانەیە شتێکی زیادەی کەمی هەبێت لە بەفرگرەکەی و کوگاکەیدا، تا خۆتی پی بەڕی بکەیت و تاچەند دولارێک پەیدابکات و بیدات بە تۆ، بەمانایەکی تر، هەرچونێک نایەڵیت بە برسیتی بمێنیتەوە.

ئەگەر ئوتومبیلەکەت شکا لەوانەیە نەتوانێت پارەی فیتەرت بۆ بدات. بەلام پەیوەندی بەهاوڕیکانیەوە دەکات، تا یارمەتی بدەن و پاڵ بە ئوتومبیلەکەوە بنێن وبیخەنە لایەکی شەقامەکە و تۆش دەگەیەنێتە سەر کارەکەت، هەڵدەدات هەتا ڕیگەیەک بدۆزێتەوە پارەی چاککردنەوەی ئوتومبیلەکەت بدات.

ئەگەر پێویستت بەهەڵواسینی تابلۆیەک بوو، یان کردنەوەی بەلوعەی دەستشورەکەت بۆ کەگیراوە، وە دانانی دەرگایەکی

نوی بۆ گەراجەکەت، ئەو پیاوەی خۆشیدەوێت سەر پەیژەیەکی بیست پلیکانەیی دەکەوێت بۆ هەڵواسینی ئەو تابلویە بۆت، درزی دەست شورەکە بەپارچەیەک پاکەت(مقەبا) دەگرێت تا ئاو دزە نەکات لەکاتێکدا بیر لەدۆزەنەوەی چارەسەرێک دەکاتەوە بۆ چارەسەرکردنی بۆرییەکە، و کون و قوشبنی نامیلکەی ڕێنمایی (کەتەلوگ) دەگەڕێت بۆ فێربوونی دانانی ئەو دەرگای گەراجییە بۆت.

دابینکردن و گرنگیپیدانی ئەو کەسانەی خۆشیدەوێت. ئەگەر بێت و لە لایەنی مادییەوە بێت یان مەعنەویی، ئەمە بەشێکە لە DNA ی پیاو، و ئەگەر پیاو خۆشیبوێت و گرنگیت پێبدات، هەموو شتێکت بۆ دابین دەکات بە بێ سنور.

## پاراستن:

کاتێک پیاوێک بەڕاستی خۆشی بوێت، هەر کەسێک شتێک بلێت و شتێک بکات و یان هەر پێشنیارێک بکات، وە هەتا ئەگەر بیر لەکردنی شتێک کە دژی تۆ بێت و زیانت پێبگەیێنێت. ئەو پیاوەی توی خۆش دەوێت هەموو شتێک لەناو دەبات کەدێتە سەر ڕێگای، بۆ ئەوەی دڵنیابێت کەهەر کەسێک بێ ڕێزیت بەرامبەر بکات، باجەکەی دەدات، ئەمە سروشتی ئەوە، ئەگەر شارزترین پیاویش هەڵبژێریت لەسەر ئەم هەسارەیە هەر هەمان شتە: کەئەگەر تۆ بیریزیت بەرامبەر خێزانەکەی کرد ئەوا ئەبێت باجەکەی بدەیت، یان بەلایەنی کەمەوە شەڕێکی جدیت ڕاگەیاندووە. وشتێکی سروشتیە کەپیاو درکی پێدەکات و ڕێزی لیدەگرێت، هەر لەیەکەم پەیوەندیەوە کەئەویش پەیوەندیەتی

لەگەل دایکی، و لەوانەیە کور نەزانیت خوشەویستی بی مەرج واتا چی، بەلام کور هەرگیز دان بەوەدا نانیت کەدایکی هەلە دەکات یان ریگە بەهیچ کەسیکیش نادات کەشتیک بلیت یان شتیک بکات لەبەرامبەر دایکی. رەگەزی نیر هەر لە سکی دایکییەوە فیر دەبیت کەدایکی بپاریزیت و ریگە بەکەس نادات کە هیچ شتیکی پی بلیت و هیچ شتیکی بەرامبەر بکات.

ئەگەر کەسانیک وایانکرد، ئەوا بابزانن ئیستا کاتی ئەوەیە لەسکی دایکی بیتە دەرەوە بویان، بیگومان منیش لەمالەوە هەر بەو شیوە فیر کراوم، زور باش لەیادمە کاتیک کوریکی بچوک بووم و تەمەنم لەنیوان هەشت سال و ئەو نزیکانە بوو، چاوەریی دایکمم دەکرد تاچاکەتەکەی لەبەر بکات و سواری پاس ببین و بروین بو ناوشار(بازار).

لەوکاتەدا باوکم دەهاتە ژوورەکە و بەسادەیی دەیوت: تو و دایکت دەرۆن بو ناوشار ــــ ئاگات لە دایکت بی. ئەمە یاسای ژمارە یەک بوو لە مالی باوکم: نەگەرییتەوە بو مالەوە بەبی دایکت و خوشکەکانت، باشترە خوت بکوژیت یان سواری پاسەکە ببیت و بروّیت بو شوینیکی تر، بەلام بەبی دایکت و کچەکان نەگەرییتەوە.

ئیستا زور بەباشی دەزانم، کەئەگەر کەسیکیش پەنجەی بو دایکم رابکیشایە نەمدەتوانی هیچ شتیک بکەم، بگرە دایکم ئاگاداری من نەبوو لەپاسەکەدا، بەلام، هاوری، من لەو پاسەدا و لەفروشگاکەشدا سنگە بچوکەکەمم دەرپەراندبوو، سوینم دەخوارد هەموو شتیک دەکەم بو پاراستنی خیزانەکەم ،لەبەرئەوەی پیویست بوو لەسەرم کەوا بکەم، لەراستیدا، هەموو پیاویک لەسەری پیویستە وابکات، و هەموو پیاویک ئامادەیە

وابکات لەپێناو ئەو کەسانەی کەخۆشی دەوێن و دابینکەریانە.

ئەگەر پیاو جاریک وتی کەگرنگیت پێ دەدات، ئەوا تۆ وەکو دیارییەکی بەنرخ وایت بۆی، و ئەو هەموو شتیک دەکات بۆ پاراستنی ئەم دیارییە بەنرخە.

بۆ نمونە ئەگەر، گوێبیست بوو لەگەڵ وەسڵ بردەکە دەمەقالیتە، دەڵیت: «لەگەڵ کێ قسە دەکەی، با دەستبەجێ من قسەی لەگەڵ بکەم»، و ئەگەر خۆشەویستە کۆنەکەت پەیوەندی کرد، و هەراسانی کردیت، پیاوەکەت سەبارەت بەو بابەتە قسەی لەگەڵ دەکات. و ئەگەر بینی منداڵەکانت دادەبرین و لەدەست دەردەچن، ئەوکات قسە بۆ ئەوانیش دەکات، هەرچونێک بێت پیاو پاریزگاریت لێ دەکات و سەرپەرشتی خیزانەکەی دەکات. چونکە دەزانیت کەپیاوی ڕاستەقینە پاریزەرە، هیچ پیاوێکی ڕاستەقینە نییە کە لەژیانیدا ئەوە نەپاریزیت کەخاوەنیەتی. چونکە پەوەندی بە ئابڕویەوە هەیە.

من دڵنییات دەکەمەوە کەئەمە یەکێکە لەو شتە سەرەکییانەی هەموو ژنیک دەیەویت لەپیاوەکەیدا هەبیت، چونکە کچان لەسەر ئەو بنەمایە گەورە بوون کەدەتوانن پشت بەپیاوێکی مەزن ببەستن. کە لەپیناویدا بجەنگیت و لەهەموو زیانیک بیانپاریزیت، گرنگ نییە باجەکەی هەر چییەک بیت. پیموایە هەمووتان باش دەزانن «گرنگییەکی زۆر بەوە دەدەن کەئەو پیاوەی خۆشی دەویت ئاگادار بیت و بزانیت، کاتیک کەسیک مایەی هەڕشە و مەترسییە بۆت» چونکە پیاوەکەت ئەگەر باوکت بیت، یان برات بیت، یان مامت بیت، یان هاوسەرت بیت، یان خۆشەویستت بیت، هەموو شتیک دەکات کە لەتوانایدا بیت، لەپیناو پاراستنی ئابڕوت. و زیاتریش لەوانەیە تەنانەت ئازاری کەسیکیش

بدات لەبەر تو، سەرەرای زانینی دەرئەنجامەکەشی. بو نموونە لەوانەیە تو حەز نەکەیت کەپیی بلییت لەسەر کارەکات چیت لی بەسەر هاتووە، لەبەرئەوەی لەوانەیە بیت بو شوینی کارەکەت و تەنانەت لەوانەیە چەند قسایەکیش بەبەریوبەرەکەت بلیت. و بیگومان هەموومان ئەوە باش دەزانین کەلەوانەیە کوتاییەکەی باش نەبیت.

لەبیرمە جاریک دایکم لەمال بوو، پیاوی باج کوکەرەوە هاتبوو بو پارە، و دایکم پیی نەبوو، باوکیشم لەسەر کار بوو، و چاوی لی نەبوو کاتیک کە ئەم پیاوە چون لەبەر دەرگا وەستابوو و بەدایکمی وت: «جاری داهاتوو کەگەرامەوە، باشترە ئەو پارەت ئامادە کردبیت ئەگەر نا..»، باوکم ئەمەی بیستبوو لەریگەی یەکیک لە خوشک و براکانمەوە، و کاتیک پرسیاری لەدایکم کرد کە دەقا و دەق ئەو پیاوە چی پی وتووی، دایکم دودل بوو. هەندیک مینجە مینجی کرد و تاماوەکی زور و تا لەکوتایدا بە باوکمی وت کە چی روویداوە. دایکم بەراستی نەیدەویست بەباوکم بلیت کە چی رویداوە، چونکە دەیزانی باوکم زور تورە دەبیت(دەتەقیتەوە لە توریدا). لەکوتایدا کەزانیاری تەواوەتی دەست کەوت کە دەیویست، هات بو لام و پرسیاری لیکردم کە چ کاتیک باج کوکەرەوەکە دیت، منیش پیم وت، و جاری داهاتووکە پیاوەکە هات بو مالمان، باوکم چاوەریی بوو، من هەرگیز ئەو وینەی(مەشهەد)ەم لەبیر ناچیت: پیاوەکە لەسەیارەکای دوور نەکەوتبویەوە، کەئیمە لەپەنجەرەکەوە سەیرمان دەکرد، باوکم پیاوەکەی کیشا بەسەیارەکەدا و بەهەردوو دەستی ملی(یەخە)ی پیاوەکەی گرتبوو و پی دەوت: «ئەگەر جاریکی دیکە شتیکی بیریزانە بە هاوسەرەکەم بلییت،

ئەتکوژم››. ئیستا لەوانەیە ئەوە شتیکی زیادەڕۆیی بیت لاتان، بەلام پیاوی ڕاستەقینە بەوشیوەیە دەکات بۆ پاراستنی ئەوانەی خۆشی دەوین.

پاراستن تەنها بەبەکارهینانی هیزی بیمیشکانە نییە(شیتگیری)، یان بەبەکارهینانی توندوتیژی بەرامبەر کەسیک. هەرچەندە پیاویک کە بەڕاستی خەمی توی بیت، دەتوانیت و دەتپاریزیت بەشیوازی تریش، ئەگەر بەئامۆژگاری بیت یان لەجیاتی تو ئەرکیک ئەنجام بدات کە ئەزانیت بۆ تو مەترسیدارە. بۆ نموونە ئەگەر کات درەنگ بوو، یان دەرەوە تاریک بوو، لەوانەیە نەیەویت بەتەنها ئوتومبیلەکەت لیبخوریت و بڕویت، یان سەگەکەت ببەیت بۆ پیاسە لەبەرئەوەی خەمی سەلامەتی تۆیەتی؛ لەجیاتی ئەوە خۆی ئوتومبیلەکە لیدەخوڕیت و پیاسە بە سەگەکەش دەکات، هەتا ئەگەر تازە لەئیش گەڕابیتەوە و زۆر ماندووش بیت(ئەگەر دوو شەفتیش کاری کردبیت)، تا تۆ لەماڵەوە بمینیتەوە و پاریزراو بیت.

ئەگەر تۆ بەلای کەسیدا دەڕۆشتیت و وادیار بوو کەمایەی ترس و هەڕەشەیە بۆت، ئەو پیاوەی خۆشی دەوییت دیتە نیوان تۆ و ئەو کەسە تاوەکو بتپاریزیت، لەبەرئەوە ئەگەر بەنیاز بوو شتیک بکات ئەوا پیویستە سەرەتا پیاوەکەت تیبپەڕینیت تا بتوانیت پەنجەیەک لەتو بدات.

ژنەکەم،(مارجوری)، هیشتا تاساوە کەبیر لەوە دەکاتەوە من چۆن «پاریزکاری»م لیکرد لەگەشتی ڕاوەماسی لە(ماوی) بەم دواییانە. هاوسەرەکەم جلی تایبەت بەمەلەی ژیر دەریایی بەدی کردبوو، بەلام من تیبینیم نەکردبوو، و کاتیک بەناو شەپولەکانی دەریای هیندا گەشتمان کرد، نەمدەتوانی هیچ

پارمەتییەک پیشکەش بکەم، بەلام هەستم بەوە دەکرد کەشتیکی بەسەر دیت، لەناو ئاوەکەدا، هیچ ریگایەکم نەبوو تا بیپاریزم، ژنەکەم خوی ئامادە کرد و هەموو جلەکانی تایبەت بەمەلەی ژیر دەریای پوشی، ئامادە بوو بو چوونەناو ئاوەکە، من بی ئوقرە بووم و دەستمکرد بەجگەرە داگیرساندن، یەک لەدوای یەک، و بە کەشتییەکەدا هاتوچوم دەکرد ،و بەبەریوبەری ژیر دەرباییەکەم دەوت: «ئەبیت ئەم ژنە بگەریتەوە»؟! هەر لەو ساتەدا ژنەکەم چوو بووە ناو ئاوەکەوە. بە پاسەوانە تایبەتییەکەمم وت کەنەیدەتوانی مەلەی ژیردەریایی بکات، و داوملیکرد بتلی ئوکسجینەکە ببەستیت لەخوی

و چاویکی لەسەر هاوسەرەکەم بیت، بەهەموو سەرنشینەکانی سەر کەشتییەکەم وت، لە بەریوبەری کارەوە تا کاپتنی کەشتییەکە، وتم»ئەگەر ژنەکەم لە ماوەی ٢٥خولەکدا نەگەریتەوە ئەوا هەموومان چاکەتی مەلە لەبەر دەکەین و دەچین دەیهینینەوە«.

ئەو پیاوەی کەبەرپرسی گەشتەکە بوو، زور بەبی خەمییەوە وتی»بەریزم، هەمووان ناتوانن دابەزن، تەنها بو رزگارکردنی یەک کەس«، بەلام قسەکانی بو من هیچ مانایاکی نەبوو، زور بەتورەییەوە وتم»من پیت دەلیم، یان هەمووان دادەبەزن بو رزگار کردنی، یان هەموو کەسیکی سەر ئەم کەشتییە دەکوژم. ئەم کەشتییە ناروات بو هیچ شوینیک بەبی ئەو و ئەگەر ئەم کەشتییە بەری کەوت بەبی ئەو، ئەمە کوتایی هەمووتان دەبیت«.

ژنەکەم هەستی کردبوو لەسەر کەشتییەکە شتیک روو دەدات، بویە دەست بەجی گەرایەوە بوسەر ئاوەکە، زانیبووی کەمن سەیر رەفتار دەکەم. بویە بەلایەوە باشتر بوو بگریتەوە

بوسەر کەشتییەکە وەک لەوەی بچیتە ژێر دەریاوە، چونکە دەیزانی کەمن چەند نیگەران دەبم کاتێک دەچیتە ژێر دەریاوە، نەمدەتوانی بەسروشتی رەفتار بکەم، کاتێک شتەکە پەیوەندی بەپاراستنی ئەوەوە بوو، بۆیە تێگەیشت کە پێویستە ئەو مەلەیە(سەرکێشی)یە بخاتە لاوە،ئەرکی سەرەتای من ئەوەیە کە دڵنیابم هیچ شتێکی خراپی بەسەر نایەت، ماجوری ژنێکی زۆر سەرکێشە، بەڵام زۆرێک لەم مەترسیانەی(سەرکێشی) خستوەتە لاوە، وەک _چوونە ژێر دەریا و فڕین بە پەرەشوت_ زۆری لەبەر ئەم هۆکارە، من لەکۆتاییدا ژنی خەونەکانم دۆزیوەتەوە، کەچی ئەو بڕواتە دەرەوە وبۆ خۆشی بەپەرەشوت بفڕێت و پەتی(گوریس)ی پەرەشوتەکە بپچڕێت و وەک بزانم دوای ئەوە خۆی دەکێشێت بە دیواردا، یان بچیتە ژێر دەریاوە و ئۆکسجینەکە لەکار کەوتبێت..؟ ژیانی لەمەترسیدا بێت و من نەتوانم لەوبارەیەوە هیچ بکەم..؟ نەخێر قوربان، نا، ڕێگە بەوە نادەم. چیترنا. فەلسەفەی من بۆ کاتێکی خۆش ئەوەیە کە ژنەکەم کاتێکی خۆش بەسەر ببات و بە ساغ وسەلامەتی بگەڕێتەوە بۆماڵەوە و بەهەمووان بڵێت کە چەند کاتێکی خۆشی بەسەر بردووە، ژنەکەم شتی وا ناکات، تەنها دەڵێت: «زۆر سوپاس بۆ گرنگی پێدانت(خەمخۆریت)، ئازیزم».

بێگومان. گرنگی پێ دەدەم، لەبەرئەوە DNAیم هاوارم بۆ دەکات، تا بیپارێزم و هەموو شتێکی بۆ دابین بکەم، وخۆشەویستی خۆمی بۆ دەربڕم، بەهەر شێوەیەک بێت، هەرچۆنێک بێت، باوکم و باوباپیرانیشم هەروایان کردووە، _بەهەموو هێز وتواناتەنەوە_ و بە یارمەتی خودا_ تەنانەت لە کاتە سەختەکانیشدا کەپاراستن و دابینکردن و خۆشەویستی

دەربڕین کەهێندە ئاسان نەبووە، بەتایبەتی بۆ پیاوە ڕەش پێستەکان.

ئێستا ئێمە ئەو دیمەنەمان لەدەستداوە کەژن داوای شتێک لەئێمەی پیاوان بکات، لەوانەیە بەهۆی ئەوەوە بێت کەزۆرێک لەژنان هەن کە بەتەنها منداڵەکانیان بەخێو دەکەن، یان بەهۆی کەمی ژمارەی ئەو پیاوانەوە بێت کە کورەکانیان فێر دەکەن کە چۆن ببن بەپیاوێکی ڕاستەقینە. و لەگەڵ ئەوەشدا، من بڕوای تەواوەتیم هەیە کەژنی ڕاستەقینە دەتوانێت باشترین شت لەپیاودا دەربخات؛ هەندێک جار تەنها پێویستە ئێمە چاومان بەژنێکی ڕاستەقینە بکەوێت، بێجگە لە دایکمان، تاوەکو باشترین تایبەتمەندی ئێمە بەدیار بخات.

بەهەمان شێوە، لەسەر ژن پێویستە: داواکاری بکات کەپیاو پابەندبێت بە بەڵێنەکەیەوە، لەبەرنامە ڕادیۆیەکەم و پەیوەندییە بەردەوامەکانی ڕۆژانـەم لەگەڵ هاوپۆلەکانم و هاورێکانمدا، بەبەردەوامی گوێ بیستی ژنانێک دەبم کەدەڵێن؛ هیچ پیاوێکی باش نەماوە کە ئەو ئەرکانە جێ بەجێ بکات کەپێویستە هەموو پیاوێک بیکات، بەڵام دڵنیام، پیاوان لەبەرئەوە ئەو کارە ناکەن، چونکە هیچ کەسێک_بەتایبەتیش ژنان_داوای ئەوەیان لێ ناکەن.

(سەیری بەشی »پیاو ڕێزی پێوانەکان دەگرێت« بکە، شتێکی لێوە وەربگرە)

بەکورتی، خانمان، پێویستە بوەستن لەسەپاندنی پێناسەی خۆشەویستی لەڕوانگەی خۆتانەوە بەسەر پیاوێکدا کە بەشێوەیەکی جیاوازتر لە خۆشەویستی تێگەشتووە، چونکە خۆشەویستی

پیاو تەنها سێ خانە پڕ دەکاتەوە، ئەویش: «سێ

بەشەکەی خۆشەویستی، دەربڕینی خۆشەویستی، دابین کردن
پاراستن». لەوانەیە پیاو لەگەڵت نەیەت بۆ بازاڕ ئاعەزییەک
بکڕێت بۆ ئاهەنگی کارەکەت، بەڵام پیاوی ڕاستەقینە دەتبات بۆ
ئاهەنگەکە، و دەستت دەگرێت، وبە شانازییەوە بە هەموو ئامادە
بووانی ئاگەنگەکەت دەناسێنێت وەک خانمی خۆی،(دەربڕینی
خۆشەویستییەکەی). لەوانەیە لەباوەشت نەگرێت و لای
پیخەفەکەتەوە دانەنیشێت و دەستت نەگرێت کاتێک نەخۆشیت،
بەڵام پیاوی ڕاستەقینە کەخۆشیدەوێت، دڵنیا ئەبێتەوە لەلیستی
دەرمانەکانت، و قتویەک شۆربات بۆ لێ دەنێت، وا لەهەموان
دەکات کە لەئامادەباشیدابن تا چاک دەبیتەوە(دابین کردن)؛ و
لەوانەیە دایبی(حفاضە)ی منالەکەی نەگۆڕێت و قاپەکان نەشوات،
و قاچەکانت بۆ نەشێلێت کە لەگەرماو هاتیتە دەرەوە. بەڵام ئەو
پیاوەی بەڕاستی خۆشی دەوێیت بەسەر چیادا دەڕوات و بەناو
ئاودا دەڕوات(بەناو ئاگر و ئاودا دەڕوات) بەڵام ڕێگە نادات
کەسێک ئازارت بدات و زیانت پێ بگەیێنێت (پاراستن)، بڕوا بکە
ئەمە شتێکی زۆرە. و ئەگەر پیاوێکت دۆزییەوە ئەم شتانەت
لەپێناو بکات ئەوا دڵنیا بە کەخۆشی دەوێیت.



## ــ٣ــ

## ئەو سێ شتەی کەهەموو پیاوێک پێویستییەتی

### «پاڵپشتی، دڵسۆزی(وەفا)، پەیوەندی سێکسی».

ژنان بونەوەری ئاڵۆزن. داواکاری زۆرتان هەیە، و ئەتانەوێ پیاوەکەتان دابینی بکات بۆتان، هەتا ئەگەر ڕوونیشتان نەکردبێتەوە کەچیت پێویستە و چیت دەوێت، و تەنانەت ئەگەریش ئەو شتەی ٥خولەک بەر لەئێستا پێویستت بوو و دەتویست، بەتەواوی جیاواز بێت لەگەڵ ئەوەی ئێستا دەتەوێت. لەڕاستیدا، بەبەردەوامی بەشێوەیەکی کۆمیدی(نوکتە) دوبارەم کردۆتەوە، کە تاکە ڕێگە کەژن بەتەواوەتی ڕازی بکرێت، ئەوەیە کەچوار پیاوی جیاواز بۆ خۆی بدۆزێتەوە،»پیاوێکی پیر، پیاوێکی ناشرین، پیاوێکی بەهێز(لە ڕووی جنسییەوە)، پیاوێکی شاز(هاوڕەگەزباز)«. و ئێستا ڕات چییە کەهەر چواریان کۆبکەیتەوە و یەکیان بخەیت..؟ و هەموو شتێکن بۆ دەستەبەر دەکەن.

پیرەکەیان... لەماڵەوە لەگەڵتدا دادەنیشێت، و پارەی

خانەنیشینیەکەی لەتویا سەرف دەکات، لەباوەشت دەگرێت، و ئاسودەت دەکات، وچاوەڕێی هیچ پەیوەندییەکی سێکسیت لێ ناکات چونکە خۆی توانای نەماوە، لەگەڵیدا دەتوانیت لەڕووی ماددیەوە بێ خەم بیت.

ناشرینەکەیان... هەموو شتێک دەکات بۆ یارمەتی دانت؛ منداڵەکان دەبات بۆ کردنی چالاکییەکانی دوای خوێندنگە، و توش ئەگەیەنێت بۆ فرۆشگای سەوزە و میوە، و ئۆتۆمبێلەکەش دەشوات لەکۆتایی هەفتەدا، و ئاگاداری پشیلەکەش دەبێت، و هەر شتێک کەتۆ بتەوێ، چونکە دڵخۆشە بەوەی ژنێکی جوانی وەکو تۆ جۆرێک لەگرنگی بەکەسێکی وەک ئەو دەدات. لەگەڵ ئەودا کات دەبێت بە (کاتی خۆت)، باری شانت سوک دەکات تائەو شتانە بکەیت کەدەتەوێت، بەڵام کاتت پێویستە بۆ کردنیان.
و دوای ئەوە پیاوە بەهێزەکەمان هەیە، تۆ پێویستت بە پیاوێکی گەورە و قەبە هەیە، چونکە دەزانیت چیت لێی دەست دەکەوێت، زلە(گەورە) و زۆریش زیرەک نییە، و بەهرەی قسە کردنیشی باش نییە، و ماسولکەی دەرپەڕیوی هەیە، هەر لەتەوقی سەرییەوە تا پەنجە توتەی پێیەکانی، و کاتێک تەماشای دەکەیت، و باش دەزانیت کە لەسەر پشت ئەتدا بە زەوییدا، ئەمە هەموو ئەوەیە کەتۆ لەو دەتەوێت، و دڵنیادەبێتەوە کە بەشێوەیەکی گونجاو پێی داویت، سێکس لەسەرو مێشکەوە دەبێت، ئەمە هەموو ئەوەیە کە لەپیاوی بەهێز دەتەوێت.

و دواتر هاوڕەگەزبازێکت پێویستە، تاکەسێک هەبێت لەگەڵی بڕۆیت بۆ بازاڕ، هیچی لیت ناوێت تەنها ئەوە نەبێت کەزۆربڵێی و وتی وتی دەکات و وردەکاری دەربارەی ئەوەی کەپیاوە پیرەکە چی بۆ کڕیویت، و پیاوە ناشرینەکەت ناردووە بۆ ج

ڕاسپاردەیەک، و پیاوە بەهێزەکەی کە هەتە بەدرێژایی هەفتەیەک چۆن سێکسی لەگەڵ کردووی. و پیاوە هاوڕەگەزبازەکە هەموو ئەو وتووێژەی پێویستە دەتداتێ (پێبکەنە).

هەر چوار پیاوەکە، یەکێک لەپێداویستییەکانت(داواکاری) دابین دەکـات، کە›پێویستە› دڵخۆشت بکـات، بۆیە دەڵێم «پێویستە» چونکە لای ژنان بەختەوەری گرەنتی نەکراوە.

ئەگەر داواکارییەکانیشتان جێ بە جێ کرابێت.

بێگومان ئێمە دەزانین مافی ئەوەت هەیە گۆڕانکاری بکەیت لەسنوری دەرەوەی ئەو شتانەی کەدڵخۆشت دەکات لەگەڵ ئەو هەلومەرج و تایبەتمەندییانەی کەبەتەواوی بەختەوەرت دەکات، و ئێمە هەوڵ دەدەین لەگەڵ ئەوە ڕابێین (بگونجێنین)، بەڵام بەگشتی سەرکەوتوو نابیین لەوەدا.

وە لەبەرامبەردا پیاوان بونەوەرێکی زۆر سادەن، زۆری تیناچێت تا دڵخۆش بن، لەڕاستییدا، تەنها سێ شت هەیە کەپیاو پێویستیتی تا دڵخۆش بێت کەئەمانەن:

(پاڵپشتی و، خۆشەویستی و، سێکس)، هەر ئەم سێ شتەیە نە کەم و نە زیـاد، وە من لێرەم تا پێت بڵێم: بەڵێ هەر بەو ئاسانییە ئەمە هەموو بابەتەکەیە.

پێویستییەکانی ئێمە جێگیرن و زۆر بەدەگمەن زیادەڕەوی تیدابێت و قورس بێت، من دڵنیام کەزۆر ئاسانە بۆ ژن پاڵپشتی و خۆشەویستی و سێکسی پێ ببەخشێت، لە خۆڕازاندنەوەیاندا پاڵپشتی هەیە و خۆشەویستیش ئەو شتانە دەگرێتەوە کەژن بەئازادی و سروشتی (زگماکی) هەیەتی، وە دەتوانێت شتێکی دیکەی ناو بنێت (بەخێوکردن یان گرنگی پێدان ) و ئەگەر پیاوێکت بەڕادەی بەخێوکردن خۆشویست، ئەو دڵنیات دەکەمەوە کەبەو

ڕادەیە خۆشت دەوێت کەسێکسی لەگەڵ بکەیت، و لەبەرئەوە تۆ لەسروشتیەوە (زگماکی)ییەوە خاوەنی ئەم سێ شتەیت، و ئەمە هەمو ئەوەیە کەپیاوەکەت لێتی دەوێت با بۆتی بپێکم.

## پێویستی ١---- پاڵپشتی تۆ:

ئێمەی پیاو دەمانەوێت هەست بکەین کەکەسێک دەمانپارێزێت و پشتمان دەگرێت، وەکو ئەوەی پادشا بین، یان ئەگەر پادشاش نەبین.

تۆ دەبێت لەوە تێبگەیت کەهەموو جیهان هەوڵی تێکشاندنمان دەدات کاتێک دەڕۆینە دەرەوە لە ماڵ، چ جای ڕەش پێست، یان سپی پێست، یان گەنم ڕەنگ، یان سور پێست (شڵ) بێت، هەموو پیاوێک ماڵ بەجێدەهێڵن و لەئامادەباشیدان بۆ جەنگ، لەوانەیە لەسەر کارەکەی سێ کەس بەلای مێزەکەیدا تێبپەڕن و نامەی دەرکردن لەکارەکەی لەهەر ساتێکدا پێ بدەن، ژیانی لە چاوتروکانێکدا بگۆڕێت. لەوانەیە کەسێکی پلە نزم تر بیەوێت ڕێگەیەک بدۆزێتەوە تا لەپشتەوە زیان بەپیاوەکەت بگەیەنێت لەموچەیەکی زیاتر. هیچ بەلایەوە گرنگ نییە ئەوەی دەیڵێت و ئەوەی دەیکات، کاری پیاوەکەت دەخاتە مەترسییەوە.

پیاوەکەت لەوانەیە لەکاتی شۆفێری کردندا بیر لەکارەکەی خۆی بکاتەوەو ئوتۆمبێلەکەی لەلایەکی شەقامەکەدا ڕابگرێت. چونکە لەوانەیە شتێک ڕووبدات کە لەکۆنترۆڵی ئەودا نەبێت. یان لەوانەیە کەسێک بێت و هەوڵ بدات ئەوەی هەیەتی لێی بسەنێت، بەمانەیەکی دیکە: پیاو هەمیشە لەئامادە باشیدایە. کاتێک پیاوێک بەلایدا تێپەڕی ئامادەبێت بۆ بەرگریکردن لەخۆی و دەسکەوتەکانی (لە وانەیە تۆش بگرێتەوە).

پیاو ئەمەی لەژنەکەی دەوێت، پیاو دەیەوێت ژنەکەی بڵێت: « ئازیزم، ناتوانم پێت بڵێم کەچەندێک سوپاسگوزارم کەچیت بۆمن و منداڵەکان کردوە»، ئەم وشە سادەو ساکارانە هێز بەئێمەی پیاوان دەبەخشێت، بۆ بەردەوام بوون لەکارکردن لەپێناو تۆو خێزانەکەتدا.

هەر لەکارکردنی بەسەختی تاوەکو پارەی موچەکەی بهێنێتەوە ماڵەوە، تا سادەترین شت کەبرژاندنی گۆشتە لەئێوارەی شەممماندا، وە جلەکان دەکاتە جلشۆرەکەوە، ئێمە هەموو ئەمانە دەکەین، ئەگەر ئێوە لە بەرامبەردا پاداشتمان بدەنەوە، ئەم پاداشتەی ئێوە یەک دیناری تێناچێت، کەزۆر بەسادەیی لەناخی دڵەوەیە: سوپاس خۆشەویستم، من سوپاسگوزاری تۆم.

ئێوەی ژنان نازانن ئەمە چەند گرنگە بۆ ئێمەی پیاو، ئەم هاندانە کەمە وا لەپیاو دەکات کەزیاتر هەوڵ بدات، لەوانەیە پێتان وابیت کەئێمە پێویستمان بەم هاندانە نییە، لەبەرئەوەی ئێمە دروستکراوێکی توندو ڕەقین و پێتان وایە پێویستمان بەخۆشەویستی نییە، بەڵام لەڕاستیدا پێویستمانە و کاتێک ژنێک دێت و پێمان دەڵێت: «تۆ زۆر گەورەو بە هێزیت و تۆ هەموو ئەوەی کەمن دەمەوێت». لەبەر ئەم قسانە ئێمە هەوڵدەدەین زیاتر بەدەست بهێنین.

## پێویستیی ٢ــ بەوەفایی:

تکایە لەمە تێبگە، خۆشەویستی ئێمە بەتەواوی جیاوازە لەخۆشەویستی ژن، خۆشەویستی ژن بەسۆزە(عاتفیە)، و چاودێرییە(گرنگی پێدان)، و میهرەبانییە، و لەناخی دڵەوەیە، و جوانە، و هەمووان لەباوەش دەگرێت. کاتێک کە لەخۆشەویستی

تۆدایە زۆر بەوەفایە بۆت،ناتوانێت وێنای خۆی بکات، لەگەڵ هیچ پیاوێکی دیکەدا، چونکە لای ئەو هیچ کەسێکی تر وەک تۆ نییە، ئەمەیە خۆشەویستی ژن.

بەڵام لای پیاو خۆشەویستی وەفادارییە، ئێمە دەمانەوێت خۆشەویستی خۆت دەربڕیت لەڕێگەی وەفاداریتەوە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کەبۆت گرنگ نیە لەگەڵ ئێمە توشی چیدەبیت و چیت بەسەر دێت.

ئەگەر لەکاریش دەربکرێیت، دڵنیابین کەهێشتا هەر لەگەڵمان دەمێنیتەوە ئەگەر بێ موچەش ماینەوە.

لای هاوڕێکانت بەشانازییەوە و بەپەرۆشییەکی زۆرەوە دەڵێیت: «ئەمە پیاوەکەمە و من بەوەفام بۆی». وە ئەگەر (ئدریس ئەلباو دێنزل و ئارشەر)، (ناوی سێ کەسایەتی دەوڵەمەندن) یان کەسانی تریش بێنە ژورەوە و لەچاکەتەکانیانەوە پارە هەڵبقوڵێت، پارە هەڵبدەن بەهەوادا و بێتە خوارەوە وە لەگەڵ بوونی هەموو ئەمانەش! سەرەڕای ئەوە هەر ئێوەی ژنان بەتوندی دەستمان بگرن و وە لەناخی دڵتەوە بڵێیت: «من هیچ یەکێکم لەو پیاوە درەوشاوانە و دەوڵەمەند و باشانە ناوێت، چونکە پیاوەکەی خۆم تاکە پیاوە بۆم» (ئێمە تاکە هیوامان ئەوەیە کەتۆ ئەم قسانە بکەیت –پێبکەنە).

ئەم وەفادارییە، خۆشەویستی ئێمەی پیاوە. پیاوان بێجگە لەیەک جۆر خۆشەویستی زیاتر نازانن. ئەو جۆرە خۆشەویستییەی تۆ داوای دەکەیت جوانە، بەڵام خۆشەویستی ئێمە لەهی ئێوە ناچێت و جیاوازە، سەرەڕای ئەوەش هەر خۆشەویستیە، وەخۆشەویستی پیاو شتێکی زۆر بەهێزە و، ئەگەر وەفاداریتان ڕاست وجێگەی باوەڕ بێت، ئەوا پیاو مەحاڵ

دەکات لەپێناو تۆدا و هەرگیز وازت لێناهێنێت.

## پێویستی سێ ٣-سێکس (جووت بوون):

پێویست بەبیرکردنەوە ناکات، پیاوان پێویستیان بەسێکسە، هیچ شتێک لەسەر زەوی ناکات بەسێکس، زۆر بەتوندی و بە شێوەیەکی بەردەوام دەمانەوێت، وە ناتوانین بێ ئەوە بژین

ئەتوانیت ماڵەکەمان ببەیت، پیشەکانمان لێوەربگریتەوە.(ئیمپالا ٦٩) جۆرێکی ئۆتۆمبێلە، ئۆتۆمبێلەکەشمان ببە، بەڵام تکایە سێکس کردن لەگەڵمان رەت مەکەنەوە، ئێمە هیچی ترمان بەلاوە گرنگ نییە، ئێمە پێویستمان بەسێکسە، ئێمە پێوستمان بەوەیە کە کۆببینەوە(جووت بین) لەگەڵ ئەو ژنەی کەخۆشمان دەوێت و وەفادارە بۆمان و پاڵپشتمانە. بەو رێگایە خۆشەویستی دروست دەکەین.

شتە سۆزدارییەکانی(عاتفیەکان)ی وەک گفتوگۆکردن، لەئامێزگرتن، دەستگرتنی یەکتر، پێکەوە بوون، ئێمە هەموو ئەم شتانە دەکەین چونکە دەزانین بەلای ئێوەوە گرنگن.

بەڵام تێبگە: ئەو رێگەیەی ئێمە پەیوەندی پێ درووست دەکەین سێکسە، نە زۆر و نە کەم. بەم جۆرە شەحن( بارگاوی) دەبینەوە. پیاوێک ناناسم کەپێویستی بەسێکس نەبێت. ئەگەر پرسیار لەهەر پیاوێک بکەیت کە ئایا سێکس لەپەیوەندیدا گرنگە؟ ئەوەی دەڵێت نەخێر درۆ دەکات. من هێشتا پیاوێکی وام بەرچاو نەکەوتووە، ئەگەر تۆ بەرچاوت کەوت بایبخەینە مۆزەخانەوە، چونکە پیاوێکی تایبەت وەدەگمەنە، بەڵام باقی پیاوەکانی تری وەک ئێمە پێویستمان بەسێکسە، وەک چۆن پێویستمان بە

هەوایە، پیاو ناتوانێت زیاتر لەمانگێک بەبێ سێکس بمێنێتەوە. چونکە دواتر هەوڵدەدا لەشوێنێکی ترەوە دەستی بکەوێت، تەنها کاتێک نەبێت کەتۆ دووگیان بیت بەمنداڵی ئەو.

پێت دەڵێت: شەلاتی و سەرسەرییەکانیش لەسەر پاڵپشتی و وەفاداری دامەزراوە، پیاوێکی دڵتەڕ دامەزراوەیەکی شەقاوە دروست دەکات، هەر لەسەر ئەم دوو شتە (وەفاداری و پاڵپشتی) تاکە شت کەلێرەدا ونە سێکسە. وە هەر لەبەرئەوە ئەندامی کچ دێتە ناو دامەزراوەکەوە وە بۆ یانەکانی مۆتۆڕ سواری، ماسۆنیەکان، و ئیلکییەکان، برایەتییە یەککگرتوەکان هەر هەمان شتە، چونکە تەواوی جیهانی پیاو لەسەر ئەم سێ شتە بنیات نراوە، ڕۆژێک نییە لەهەفتەدا بەبێ شوێنەوارەکەی تێپەڕ نەکەین.

بابڵێین تۆ ئەندامێکی باڵای کۆمەڵەیەکی (ئۆمێگا ، PSI,PHI) یت و ڕۆشتویت بۆ کۆمەڵەیەکی دیکە، ئایا دەزانیت کەچی ڕوودەدات ئەگەر کوڕەکانی کۆمەڵەکە پێی بزانن کەتۆ ئەندامی کۆمەڵەکە نیت؟ وە لەسەر بەڵێنی نەمری وخۆشەویستی و پاڵپشتی نەبویت؟ نەخێر، پیاو، نا هیچ ڕۆژێک شتی وانەکەیت، دەزانی چی ڕوودەدات ئەگەر ڕۆژێک هەوڵبدەیت بڕۆیتە یەکێک لەیانەکانی شار و ئەندام نەبیت؟

لەبەرئەوە پیاو لەسەر بنەمای پاڵپشتی وبەوەفای دروست بووە، و کەسیشیان ناتوانن بەبێ سێکس دەرباز بن، پیاو سێکست لەگەڵ دەکات ئەگەر بەدرێژایی هەفتەیەک پشووت وەرگرتبێت لەکارەکەت، و ئەگەر خۆشیبوێت.

ئەگەریش گرنگی پێنەدای، خۆی بێزار ناکات تا سێکست لەگەڵ بکات، دەڕوات و لەشوێنێکی دیکە دەیهێنێت، بەڵام ئەگەر

ئەو ویستی و بە پەرۆش بوو وە تۆش ژمارەی سیکسەکانت کەمکردەوە، وە چیتر ئەو کارانەت نەکرد کە لەسەرەتای پەیوەندییەکەتاندا دەتکرد، ئەوا ئەو ژنێکی دیکە دەدۆزێتەوە کەئەو کارەی بۆ بکات، تکایە بروام پێبکە کاتێک کەدەڵێم ئەو بەهەمووان دەڵێت و: «ئەمە خۆشەویستەکەمە»، بەلام ڕێک لەو کاتەدا ژنێکی دیکەی هەیە کەئەوەی دەیەوێ و پێویستیەتی (سیکسی) پێ بدات.

بەهەڵە تێمەگە_ئێمە ئاژەڵ نیین _دەزانین کەشتەکان گۆڕانکاری بەسەردا دێت، کاتێک منداڵێک لەدایک دەبێت و پزیشک پێمان دەڵێت کە ماوەی ٦مانگ چاوەڕێ بکەین، یان کاتێک تۆ لەسوڕی مانگانەدایت و مەزاجت باش نییە، بەلام ئەم بیانووانە بۆ هەمیشە بەردەوام نابن، تۆ دەتوانیت لەگەڵ پیاوەکەت کەمێک یاری و گاڵتە بکەیت، ئەگەر خۆت بتەوێت.

گرنگ نیە پیاو چەندێک ژنەکەی خۆشدەوێت، یان ماڵەکەی و، ڕۆڵی خۆی وەک و سەرۆکی خێزانەکەی خۆشبوێت، یان پارە دەخاتە سەر هەژماری خێزانەکەی، و لەوانەیە کەمێک زیاتر بخاتە سەر هەژماری بانکییەکەی تۆ، ئەگەر تۆ وازت لێ نەهێنا لەوانەیە کەمێک زیاتر بخاتە سەر هەژماری بەنکییەکەی تۆ ،ئەگەر تۆ وازت لەسێکس کردن هێنا لەگەڵی یان کەمت کردەوە، ئەوا تۆ ڕووبەڕوی کێشە دەبیتەوە.

لە ئەزموونی خۆمەوە قسە دەکەم، بەم دواییانە بووم بە ٥٠سال و ئاگادارت دەکەمەوە کەلەو ڕووەوە یاریم لەگەڵ نەکەی، هەوڵ دەدەم لەم تەمەنەدا بۆ ماوەیەکی کەمێک درێژتر لەگەڵت بەردەوام بم، چونکە من سەرقاڵم، کۆمپانیام هەیە تا بەڕێوەی ببەم، وە خشتەی کارم هەیە کە پێویستە پابەندبم پێوەی،

زۆربەی کات لەگەشتدام یان لەسەر ستەیجم یان لەڕادیۆم، خەریکی کتێب نوسینم و نواندنیش دەکەم، یان خەریکی پرۆژە خێرخوازییەکەمم لەگەڵ ئەوانی دیکەدا، من بەبێ دابڕان خەریکی کارم، تەنانەت بەم تەمەنەشەوە ناتوانم بەرگەی بەهەدەردانی فکری و رۆحی و عاتفی بگرم، چیتر هیچ هەڵبژاردنێکم نییە، من هەموو هەوڵێک دەدەم تا لەو دەرگایە بچمە دەرەوە ئێستا بێت یان هەر ڕۆژێکی تر، ئەگەر کاتم بە فەیرۆ داو کەمتەرخەمیم کرد ئەوا توشی جەڵدە دەبم، ئەگەر هەلی گەڕانەوە بۆماڵەوە لەدەست بدەم، لەوانەیە، بەڵام ڕاستییەکە ئەوەیە ئەگەر نەتوانم بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە و دڵە کەمێک سێکسم لەگەڵ بکەیت وتۆش هێشتا هەر بیانوو بهێنیتەوە کەناتوانیت لەگەڵم جووت بیت. شتێک لێرەدا دەگۆڕێت، من گرەو دەکەم شتەکان لەماڵی تۆش جیاوازییەکی وەهای نییە لەگەڵ ماڵی من و هەمان شتە، لەوانەیە بەدرێژایی شەو بەئاگا بوو‌بیت بۆ ماوەی هەفتەیەک بەدیار منداڵێکی نەخۆشەوە بووبیت و بەیانیش زوو لەخەو هەڵسابیت، تا منداڵەکەی ترت سواری پاسی قوتابخانە بکەیت، وە پێش ئەوەی بڕۆیت بۆسەر کار توشی گرفتی ڕۆشتن بیت، وە لەگەڵ ئەوەی هەشت کاتژمێر بەبێ وەستان لەگەڵ بەڕێوەبەر و هاوپیشەکانت تێبکۆشیت وتەنها ١٥ خولەک پشودانت هەبێت، لەگەڵ خواردنی ژەمێکی کەم و کورتی نیوەڕۆ، وە خۆت دەگەیەنیتە ترافیکەکە تا بگەڕێیتەوە بۆ ماڵەوەو ئیشی دووەمت دەست پێ بکەیت، ئامادەکردنی خواردن وگرنگیدان بەمنداڵەکان، وە دەبێت نانی ئێوارە ئامادەبکەیت و ئەرکەکانی ماڵەوە ئەنجام بدەیت و جلەکان بشۆیت و خشتەی کارکردن بەردەوام دەبێت تا مێردەکەت دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، کۆتا شت لە مێشکدا ئەوەیە

کە بەرپەرچدانەوەیەکی ئەرێنیت هەبێت بۆ قسەی هاوڕێکەت کەوتی؛ «دەست خستنە سەر شان»، تۆ دەزانی مەبەستم چییە، کاتێک لەکۆتاییدا دەچیتە پێخەفەکەتەوە و هیلاک و ماندووی، وە لەنیوەی سەیرکردنی خۆشترین بەرنامەی تەلەفزیۆنیدایت و دەتەوێت هەموو شتێک لەبیر بکەیت و پشوویەک بدەیت لەوکاتەدا پیاوەکەت دێتە ژوورەوە « دەست دەخاتە سەر شانت›› و داوای سێکست لێدەکات، بەڕاستی بێزارکەرە.

بەڵام هاوڕێکەم خۆشی نازانێت کەهاوسەرەکەشی بەهەمان شێوە ماندووە لەدەستخستنە سەر شان، هاوسەرەکەی بیردەکاتەوە کەئەویش بەدرێژایی ڕۆژەکە زۆر کاری کردووە وەکو ئەو.

لەگەڵ ئەوەی ئیشەکانی ماڵەوەی نەکردووە کەژنەکەی ئەم ئێوارەیە کردویێتی، بەڵام ئەویش کارەکانی دەرەوەی ماڵی کردوە. ئەویش وەکو ژنەکەی پێویستی بەشتێکی خۆش و ئارام هەیە، تاهەناسەیەک هەڵبمژێت لەدوای ڕۆژێکی ماندووکەر. ژن حەز دەکات سەیری تەلەفزیۆن بکات، پیاویش حەز دەکات سێکس بکات، ژن هەموو کات ماندووە بەڕادەیەک ناتوانێت سێکس بکات، وە پیاویش ماندووە بەهۆی نەکردنی سێکسەوە بۆیە لەکاتێکدا ژن بەبێخەمی لەبەردەم تەلەفزیۆن دانیشتووەو سەیری بەرنامە تایبەتیەکەی خۆی دەکات، لەو کاتەدا پیاو بێخەمانە لەدەرەوەی ماڵەو لەگەڵ ژنێکی دیکەدایە.

ئێستا من ناڵێم ئەو کارەی پیاو دەیکات کارێکی پەسەندە، یان باشە. بەڵام وەک پیاوێک دەتوانم لەو ڕاستییە تێ بگەم کەکۆتایی پێهێناوە. ئەگەر من لەژووری نووستنی ژنەکەدابم، پێش دەستپێکردنی هەموو ئەم هەڵانە کەبەهۆی خیانەتەوە

تێیکەوتوون، من ئامۆژگارییەکی دانایانەم پێشکەشی هەردوکیان دەکرد:

لەڕێگەی سوپاسکردنی هەموو ئەو کەسانەی خۆشیدەوێن، ئەگەر پیاوێک بینی ژنەکەی بەڕۆژێکی قورسدا تێپەڕی و پێویستی بەهەندێک یارمەتی زیادە هەبوو لەئەرکەکانی ماڵەوە، تاوەکو شەوەکە بەهێمنتر و باشتر بەڕێ بکەن پیاو پێوستە یارمەتی بدات، بۆیە ئەگەر ژن خواردنی ئامەدە کرد، با پیاو قاپەکان بشوا، وە ئەگەر ژن سەرقاڵی ئامادەکردنی جلوبەرگی مناڵەکان بوو بۆ بەیانی تا لەبەری بکەن، با پیاو دڵنیابێتەوە لەوەی کەمنداڵەکان ئەرکی ماڵەوەی قوتابخانەیان جێبەجێ کردووە، ئەگەر ژن سەرقاڵی خەواندنی منداڵەکان بوو، با پیاو سەرقاڵی ڕەخساندنی کەشێکی خۆش بێت بۆ ژنەکەی و تەماشای بکات و گەرماوی بۆ ئامادە بکات، وە بۆی دەردەکەوێ کەهیچی تێناچێت سێکس لەگەڵ ئەو ژنەدا بکات کەخۆشی دەوێت، بەبێ هیچ خۆ دەرخستنێک، تەنها لە ڕێگەی ڕەفتارکردن بەخۆشەویستییەوە، لەوانەیە ئەو کات ژن زیاتر ئامادەو ڕەزامەند بێت بەئاڵوگۆرکردن بەبێ هیچ بێزارکردنێک، چونکە دەزانێت کەچ هەستێکە مرۆڤ ویستراو بێت، بەڵام پێویستە تۆ لەوە تێبگەی خانمەکەم کەهیچ پیاوێک ئامادە نییە هەموو شەوێک خواردن و خواردنەوە پێشکەشی ژنەکەی بکات، ئەمە کارێکی نامەنتیقیە، هەندێک جار پیاو دەیەوێت بەبێ داواکردن و بەرامبەر پێتبگات، بێ ئەوەی وا هەست بکات کەکارێکی زیادە (ئیزافی) بۆ خشتەکە زیادکردووە کە کردوتە، هەموو پیاوێک ئەمەی لەژنەکەی دەوێت، هەر هەموو پیاوێک بە کورتی، ئێمەی پیاو دەبێت ئەم سێ شتەمان دەست بکەوێت:

پاڵپشتی، وەفاداری، سێکس... لە تۆوە دەستمان بکەوێت یان لەژنێکی دیکەوە، تۆ دەتوانیت بازاڕیمان بۆبکەی، وە هەموو ئێوارەیەک خواردنمان بۆ ئامادە بکەیت، وە بزانیت کەخۆشترین (کەرەی پامکەی سۆدانی) لای ئێمە چییە، تاوەکو پێشانمان بدەیت، کەئاگاداریت و گرنگیمان پێدەدەی. بەڵام هەموو ئەوەی کەئێمە لەتۆمان دەوێت ئەوەیە کەکاتێک ڕۆژەکانمان خراپ تێپەڕبوو ئەم سێ شتەمان پێببەخشیت.

کاتێک گەڕامەوە ماڵەوە وئەمانەت پێبەخشیم، ئەوکات منیش دووبارە دەڕۆمەوە دەرەوە و لەپێناو تۆدا دەجەنگم. هەرکاتێک ژن ئەم سێ شتەی بۆ پیاوەکەی نەکرد، بەڵێنت پێدەدەم کەکەسێکی تر دەدۆزێتەوە تابۆی بکات، چونکە ئێمە ناتوانیین بەبێ ئەم شێ شتە بژین، تەنانەت بۆ ماوەی نەوەد ڕۆژیش بێت هەر ناتوانین لەوانەیە ئەوەی دەیڵێم پێت خۆش نەبێت، بەڵام پرسیار لەهەر پیاوێک بکە دەربارەی ئەم سێ شتە ئەگەر ڕاست نەبوو! وە زۆر بەسادەیی پێت دەڵێت: ڕاستە. پاڵپشتی. وەفاداری. سێکس. ئەگەر تۆ ئەم سێ شتەت دابینکرد، ئەوا پیاوێک لە نێو دەستتدایە کەئامادەیە هەموو شتێکت بۆبکات کەدەتەوێت بەپوختی و سادەیی.



## ـــ٤ـــ

## «پێویستە قسە بکەین»
## ئەو وشانەی وا لە پیاو دەکات ڕابکات:

ئێمە پێویستە قسە بکەین لای پیاو، هەندێک وشە وەکو هەڕەشە وایە وەکو ئەم چوار وشەیە، بەتایبەتی کاتێک کەژن ئەم وشانە دەڵێت و پیاو لەوەدایە مێشکی لەدەست بدات. ئەم چوار وشەیە تەنها دەتوانن مانای دوو شت لای پیاو بگەیێنن، یان ئەوەتا شتێکی هەڵەمان کردووە یان لەوە خراپتر ئەوەیە کەتۆ بەڕاستی دەتەوێت قسە بکەین. ئێمە لەوە تێدەگەین ئێمە بێ کەموکوڕی نین و کرۆکی (تـەواوی) نین، کاتیش هەیە تۆ لەئێمە تووڕەی، کەوایە لێگەڕێ بابزانین لەوە تێدەگەین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەپێویستی نازانین بەچڕی و دووروودرێژی وتاری تورەیی خۆتمان بۆ باسبکەی. دەربارەی ئەوەی کەچۆن ئیشەکەمان تێکداوە. هیچ پیاوێک حەزناکات و نایەوێت لەگەڵت دابنیشێت و چەنەبازی و درێـژەدان بەقسەت لەگەڵ بکات، وەک ئـەوەی یەکێک لە هـاوڕێ کچەکانت بێت، تەنها ئەوە لە DNA ی ئێمەدا نییە پشووبدەین و قاوەیەک بخۆینەوەو بە

کلینسێک چاومان بسڕین، وەک ئەوەی ئێمە لە کۆبوونەوەی AA(ئالوودەی مەی) یدا بین، یان لەبەردەم دکتۆرێکی دەروونی بین و باسی بکەین کەچی بێزاری کرردوین.

کاتێک پیاو قسە دەکات، یان بەتایبەتی گوێ دەگرێت لەبەر ئامانجێکی دیاری کراوە. ئێمە تورەیمان ناشارییینەوە، بەلام تەنها دەمانەوێت ئەو بارودۆخە چاک بکەینەوە کەهاوسەنگی لەدەست دەدا، ئێمە دەزانین کە ئەمە دلتان دەشکێنێت، دووبارە و دووبارە بەبەردەوامی، چونکە هەندێک کات دەتەوێت وتوێژ بکەیت تاکەسێکی دیکە هاوبەشی پێبکەیت لە بابەتەکەدا، یان دەتەوێت کەسێک گوێت بۆ بگرێت، بەلام بەجدی ئەوە ئیشی هاورێکانتە نەک من، تۆ کێشەکەی خۆتی بۆ باسدەکەیت و ئەویش دلنەواییت دەکات و ئەم جۆرە شتانەت پێ دەلێت «بەلێ، کچێ›› و «دەزانم ئەوە ڕاستە›› و سەری دەلەقێنێت ولەگەلت هاوڕایە، وە بۆت باسدەکات کەئەویش هەمان شتی تۆی بەسەر هاتووە، وە بەردەوام دەبێت تاچەند نمونەیەکی زیندووت بداتێ، کەهەموو جارێک شتێکی هاوشێوەی ئەمە بەسەر ژنانی دیکەدا هاتووە لەجیهاندا بەدرێژایی مێژوو، دوای چەند کاتژمێرێکی دیکە هەردووکتان هەلدەستن و بێ ئەوەی هیچتان چارەسەر کردبێت و زۆر هەست بەباشتربوون دەکەیت.

## خستنە ڕووی پێشبینیکراوی:A

تۆ: «ئەمڕۆ ڕۆشتمە سەر کار و پێش ئەوەی بچمە سەر مێزەکەم (تانیا )م بینی، ئەڕۆشتە لای ئامێری قاوەکەوە، وە ئەزانی چی! هەمان کراسی منی لەبەردابوو ئەو مانگا بچووکە››؟

کچە هاوڕێکەت: «وا نەڵێیت کام کراسە»؟

تۆ: «شینەکە، ئەها ئەوەی گوڵی پرتەقاڵی تیابوو دەزانی؟ لەو فرۆشگایە کڕیم کەلەو بەری شارۆچکەکەوە بوو، ئەوەی داشکاندنی بۆ کرابوو؟»

کچە هاوڕێکەت: «ئەوە دەڵێیت کە لەپشتەوە بوو بای ٢٩.٩٩$ بوو؟ هەمان ڕۆژ کەمن ئەم پێڵاوانەم کڕی لە فرۆشگایی کۆتایی سەقامەکە»؟

تۆ: «ئەوکراسە دەڵێم، کەچەند هەفتەیەک لەمەوپێش لەبەرم کرد، هات و پرسیاری لێکردم، وەک بزانم ڕای کرد و چوو بۆ فرۆشگاکە و لە کراسەکەی منی کڕی، و بۆ کار لەبەری کرد، باوەڕ بەمە دەکەی؟

**دەزانیت ئەمە چ هەستێکی بۆ دروست کردم...؟»**

کچە هاوڕێکەت: «ئۆوو... بابڕۆین بۆ دۆزەخ... ئەوە بەجدیتە؟ ئەوە زۆر ناخۆشە، نەخۆشی دەرونی هەیە ئەو.....»

بەدڵنیایەوە ئەم گفتوگۆیە چەند کاتژمێرێکی خایاند، دوای ئەوە گفتووگۆکە سەری کێشا بۆ بابەتی لابەلا، کەهیچ پەیوەندییەکی بەباتەکەوە نەبووە: بابەتەکە بوو بەبابەتی ئەو ژنەی کەلەهەمان کراسەکەی تۆی لەبەرکردبوو لەهەمان ڕۆژ و هەمان نوسینگەی کار.

بەڵام ئەگەر لەگەڵ پیاوێک بێت گفتووگۆکە ١٠ چرکە زیاتر ناخایەنێت و کێشەکەت چارەسەر دەبێت.

## پێشبینی Bیت بۆ دەخەمە ڕوو:

تۆ: ئەمڕۆ ڕۆشتم بۆ کارەکەم، پێش ئەوەی بگەمە سەرمێزی کارەکەم، و (تانیا)م بینی ئەچوو بۆلای ئامێری

قاوەکە، ئەو مانگا بچوکە هەمان کراسی منی لەبەر کردووە.
پیاوەکەت: بەڕاست؟ کەواتە چیتر ئەو کراسە لەبەر مەکە.
لەکوتای گفتوگۆکەدا ئەمە شتێکی زۆر سادەیە بۆ ئێمە، لەم باروخۆخە تایبەتەدا، یان نمونەی وەک ئەمە، ناتوانین لەمە زیاتر خۆمان بەم شتانەوە سەرقاڵ بکەین.

هەستت چۆن دەبێت کاتێک لەژورێکدا، دانیشتویت لەگەڵ ژنێکدا کە هەمان کراسی تۆی لەبەردایە، ئەمە هیچ مانایەکی نییە بۆ ئێمە. ئەوەی مانای بۆ ئێمە هەیە ئەوەیە کەکێشەکە بەرەو چارەسەر دەچێت، تۆ دەچیتەوە بۆ ماڵەوە.

چیتر سەیری ئەو ژنە مەکە کە لەکراسەکەی تۆی لەبەردایە، ئەگەر دەتەوێت توشی هەمان کێشە نەبیتەوە لەکارەکەت.

کێشەکە چارەسە بوو، قسەی زیاتری ناوێت. هەموو شتەکە ئەوەیە ئێمەی پیاوان لەکاتی کارکردندا، قسە ناکەین، ئێمە خەریکی چەرەسە کردنی کارەکانمانین، هەر لەوکاتەی لەسکی دایکمان دێینە دەرەوە، فێری پارێزگاری و، بانگەشە کردن، دابین کردن، دەبین. هەروەها، پەیوەندی، چاودێری کردن، گوێگرتن بۆ کێشەکان، دەبین. و هەوڵدان، بۆ تێگەیشتن و چارەسەرکردنی کێشەکان بەبێ ئەوەی هیچ شتێک ناچاریان بکات.

کوڕ بۆ ئەمە لەدایک نەبووە تائەمە بکات، ئێمە ڕێگەیان پێ نادەین بگرین(کوڕان)، دەربارەی هیچ شتێک پرسیاریشیان لێ ناکەین کە هەستان چۆنە، و هانییان نادەین بۆ دەربڕینی خۆیان، بەهەر ڕێگایەک بێت، بەدەر لەپیشاندانی «پیاوەتی»خۆیان.

بابڵێین کوڕێکی بچوک لەسەر پاسکیلەکەی دەکەوێتە خوارەوە، پاشان سەیربکە چۆن هەموان بەخێرایی پێی دەڵێن،

هەستە و خۆت بتەکێنە و بوەستە لەم گریانە نەفرەتییە، ئێمە داوایان لێ دەکەین››پیاو››بە.

هیچ گفتوگۆیەک ناکرێت دەربارەی ئەوەی هەستی بەچی کردووە کاتێک، کەوتوتە سەر زەوی و هیچ کەسێک پرسیاری لێ نەکردووە کە چەندێک، دەترسێت ئەگەر دووبارە سواری پاسکیلەکە ببێتەوە و هەوڵ بداتەوە، کاردانەوەی ئۆتۆماتیکی ئێمە ئەوەیە کەپێی بڵێین کەبەسەریدا زاڵ بێت، و بگەڕێرەوە سەر پاسکیلەکە و فێرببێت کە لێی بخوڕێت.

لەبەر ئەوە جارێکی دیکە ناکەوێتەوە.

ئێستا ئەو کوڕە گەورە بووە و لەپەیوەندیدایە، تۆ چاوەڕێی ئەوە لەو کوڕە دەکەی کەپێی وترابێت بێدەنگ بێت و بەردەوام بێت، تا ببێت بە پیاو، بەتەمای لەگەڵ تۆ دابنیشێت و، گوێت لێ بگرێت و، پەیوەندی و چاودێریت بۆ بکات؟

من ئێستا پێت دەڵێم: پێشبینییەکانت هەڵەیە، ژن مەزاجێکی جیاوازی هەیە، و بیرۆکەی جیاواز هەیە لە مێشکیاندا، چاوەڕێی ئەوە لەئێمە دەکەن کەهەمیشە لەسەر هێڵ بین(بێ کەم و کوڕی بین)، و ئەگەر وا نەبین ئەوە کێشەیە، و بەکچە هاوڕێکەت دەڵێی: «قسەم لەگەڵ ناکات»و «ناتوانم وای لێبکەم کراوە بێت لەگەڵمدا»، بەڵام ئەوە کاری ئێمە نییە کەکراوە بین و باس لەهەستەکانمان بکەین، کاری ئێمە بانگەشەکردنە بۆ خۆشەویستی، و دابینکردن، و پاراستنە، هەموو ئەمانە ژیانی ئێمەن، ئەمە هەموو ئەوەیە کەئێمەی پیاوان فێر کراوین و هاندراوین کە بیکەین، پێمان وتراوە کەپیاو بەم شێوەیە خۆشەویستی خۆی نیشان دەدات، بەڵام کێشەکە لەخانەی «دابینکردن»دایە، بەدڵنیاییەوە دابینکردن تەنها پارە ناگرێتەوە،

ای ئێمە داواییکردن ئەوەش دەگرێتەوە کەهەڵەکان چاک بکەینەوە و مرامین چ شتێک هەمووان بەدڵخۆشی دەهێڵێتەوە، لەبەرئەوەی هەموو پیاوێک هەست دەکات چ کاتێک دایکی دڵخۆش بوو، هەمووان دڵخۆش دەبین .و کاتیکیش دڵخۆش بووین، ئەوە پاداشتێکی مەزنە بۆ ئێمە، و هەر لەبەر ئەم هۆکارانەیە کەئێمە دابین دەکەین و چارەسەر دەکەین.

من هەر ئێستا پێت دەڵێم: ئەگەر چوویت بۆ لای ئەو پیاوەی کە خۆشتدەوێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەیەک کە لەتوانایدایە چارەسەری بکات، بەڵام هەوڵی نەدا چارەسەری بکات، کەواتە ئەوە پیاوەکەت نییە وخۆشیناوێت، فەرموو من تەحەدات دەکەم کەخۆت هەوڵبدەیت، کاتێک پیاوەکەت دێتەوە پێی بڵێ ئەزانی من چیتر بەرگەی ئەم چێشتخانەیە ناگرم بەم حاڵەوە، رەنگەکانی ئەم چێشتخانەیە بێزاری کردووم، وە دۆڵابەکان گونجاونین لەگەڵ فرنەکە، لەبەرئەوە من ناتوانم تەرکیز بکەم (سەرنجم لەسەری بێت) لەکاتی ئامادەکردنی خواردن، کەواتە ئەگەر ئەو هاورِابوو لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی تۆ دەیڵێیت، ئەوا بێ دوودڵبوون دەڵێ: «دەتەوێت چێشتخانەکە چی رەنگێک بێت ئازیزم؟» پێی بڵێ: «رەنگی پەمەیی»، وە دەبینی چێشتخانەکە شەممەی داهاتوو چەند جوان دەبێت بەرەنگی پەمەییەوە، ئەو ماندوری و هیلاکەی تۆ هەست پێدەکات، وە تێدەگات کەتۆ حەزت لەرەنگی دۆڵابەکان و دیوارەکان و کارکردنی فرنەکە نییە، وە کاتێک دەچێتە چێشتخانەکەوە تەلەفونەکە دەگرێت بەدەستەوە و داوای خواردنی ئامادەکراو دەکەێ لەبەرئەوەی ناتوانی پارچە گۆشت و پەتاتە لەفرندا ئامادە بکەیت وەکو ئەوەی خۆت دەتەوێت لەچێشتخانەیەکدا کەبەرگەی ناگری،

بە دڵنیاییەوە ئێمە نامانەوێت ئەمە ڕووبدات، ئەگەر پارەشمان نەبێت بۆ گۆڕینی چێشتخانەکە بۆت، ئەوا دەچینە کۆگاو هەندێک سمارتە بۆ دۆلابەکان و لەوانەیە هەندێک دەسکی تازەش وە هەندێک سمارتەی تر بۆ لابردنی ئەو ڕەنگەی دۆلابەکان کەتۆ بەرگەی ناگری وە دەرکەوتنی بەو جۆرەی تۆ دەتەوێت و حەزی پێدەکەی، ئەو پیاوەی بەڕاستی خۆشیدەوێیت دوا ناکەوێت لەکردنی ئەم کارە بۆ تۆ، لەبەرئەوەی خەیاڵ بەوەوە دەکات کەئەو زەردەخەنەی تۆ ببینێت، وەتۆش لەسەرەوەی مێزی نان خواردنەکە شوێنی بۆ دادەنێیت، وە ژەمێکی نایابی پێشکەش دەکەیت لەچێشتخانە نوێیەکەدا، کەتەنها لەبەر تۆ چاکی کردووە (ئەی خانمان خراپ لەبابەتەکە تێمەگەن: ئێمە هەموومان دەمانەوێت ئێوە بە بەختەوەری ببینین، بەڵام بابەتەکە پەیوەستە بەوەی کەچی لە بەرامبەردا وەردەگرین، بۆیە تکایە لەبەرابەر (المقابل) تێبگەن و ڕێزی بگرن).

بێگومان وای دادەنێین کەهەمووکات بابەتەکە ناگاتە شوێنی ڕاستی خۆی، وە ئێمە لەبارودۆخێکی هاوسەنگدا نامێنینەوە، هەرچەندە ئێمە بەو شێوە وەڵام دەدەینەوە کەبڕوامان وایە مەنتیقە (ڕاستە) ،چونکە ژنەکانمان هەمووکات بەڕێگەیەکی بەسۆز و عاتفی وەڵامدەدەنەوە، کە هەموو ئەوە تێکدەدا کەئێمە هەوڵی تەواوکردنی دەدەین، ئێمە زۆر کات هەست دەکەین وەڵام دانەوەت دیاری نەکراوە، بەڵام بەزۆری هەستی ژن لەڕۆژێکی دیاریکرا و لەساتێکی دیاریکراودا جێگیرە.

ئەم نموونە باشە بۆ تۆ، پیاوەکەت دەتوانێت دەستت لێبدات و چێژ وەربگرن و وات لێبکات کەهاوار بکەیت لە چێژ و خۆشیدا، وە ئەگەر شەوی داهاتوو بەهەمان شێوە ڕەفتاری

کرد تۆ سەیری بکەیت و پێی بڵێی: «چی دەکەیت؟ من ئەمەم ناوێت» ئەوکات پیاوەکەت سەری لێ تێکدەچێت، چونکە کارێکت کرد دوێنێ حەزی لێ بووە، ئەوا حەزی لە هەمان شت دەبێت ئەمڕۆ و بەیانی و ڕۆژانی تریش، ئەم کارە زۆر لەگەڵ تۆ ناگونجێت، لەبەرئەوەی ئەو شتانەی تۆ حەزت لێیە وە چۆن حەزت لێیە دەگۆڕێت لەڕۆژێکەوە بۆ ڕۆژێکی تر، وە بگرە لەوانەیە لەساتێکەوە بۆ ساتێکی تر بگۆڕێت، ئێمە ئەم کارە بەمەنتیق (ڕاستی) دا نانێین، وە ناتوانین هەرگیز لێی تێبگەین، وە ئەگەر ئێمە لەم کارە تێگەشتین، ئەوا شتێکی زۆر گەورەیە، بەڵام زۆرکات ئێمەی پیاو ئەزموون و شارەزایی خۆمان لەکاری گەمژانەدا بەفیڕۆ دەدەین.

بۆ نموونە: وای دابنێ ژنێک دێتە ژوورەکەت و تووڕەیی بەتەواوی بە ڕووخسارییەوە دیارە، وە پیاوێکی کەم ئەزموون لەبابەتی پەیوەندیدا لەوانەیە پرسیار لەخانمەکەی بکات کەکێشە چییە؟ لەوانەیە ئەویش لە وەڵامدا بڵێت «هیچ نییە»، ئەو گێلەش لەوانەیە پێی بڵێ

«باشە جوانە» و هەر خۆیەتی، ژنەکە تووڕە دەکات بەقسەکانی، «نەفرەت تۆ منت بینی کەشپرزە و تووڕەم، هێشتا پرسیارم لێدەکەیت  کە چیمە»؟ بەڵێ ئەم پیاوە پێویستە زیاتر خۆی چاک بکات، بەڵام پیاوی لێزان و شارەزا، کەدەتوانێت مەزاجی ژنەکەی بخوێنێتەوە و پرسیاری لێدەکات، گەر هەڵەیەک هەبێت پرسیاری لێدەکات کە چی ڕوویداوە؟

گرنگ نیە ژنەکەی چەند بڵێت «هیچ نییە»، دووبارە و دووبارە پرسیاری لێدەکات هەتا دڵی خۆی بۆ دەکاتەوە و پەردە لەسەر کێشەکە لا دەبات، لەگەڵ ئەوەی ئەو لەقوڵایی دڵییەوە

لەخودا دەپاڕێتەوە کەکێشەیەک لە ئارادا نەبێت، وە ئەگەر کێشەیەک هەبوو، ئامادەیە بۆی چارەسەر بکات، لەبەرئەوەی نایەوێت بەڕووگرژی و عاجزی بیبینێت. و دوای ئەوەی زانی لەقسەکردن تەواو بوو، زۆری لێدەکات هەتا کێشەکە چارەسەر دەبێت، لەبەرئەوەی ناتوانێت ژنەکەی لەو بارودۆخە بەجێ بهێڵێت، و بڵێت: «ببورە ئەوە ڕوویدا» بگرە خێرا هەوڵ بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە دەدات، ئەوە ئەوە ناگەیێنێت کەگفتوگۆکردن لەگەڵ پیاوەکەت نابێت لەدوو خولەک زیاتر بخایەنێت، چونکە تێدەگەین کەهەندێک شت پێویست دەکات زیاتر وتووێژی لەسەر بکەین لەگەڵتدا، و ناچاردەبین ناخی خۆمان هەڵبڕێژین و ئاشکرای بکەین کە چی لەمێشکماندایە و دەشزانین تۆ دەتەوێت ڕابکشێیت لەباوەشماندا و هەندێک بابەت ڕوون بکەیتەوە، بەبێ ئەوەی بگەین بەهیچ چارەسەر و دەرئەنجامێک، ئێستا دەتوانین ئەمەشت بۆ بکەین، زۆر ئاسان نیە بەڵام پێمان دەکرێت، ئێمە دەزانین دانیشتن و گوێگرتن و تەنانەت بەشدارییپێکردن لەگفتوگۆدا درێژە بە هەستەکات دەدا، کەئەمە شتێکی پێویست ولێنەبووراوە. بەڵام سەرت نەسوڕمێت ئەگەر ئەم گفتووگۆیە کەم بوو لەنێوانتاندا، چونکە ئەم گفتووگۆیانە دەبێت لەگەڵ کچە هاوڕێکەت بکەیت، چونکە پیاوان تەنها دەیانەوێت گوێ لەکێشەکە بگرن و دواتر چارەسەری بکەن، هێشتنەوەی هاوسەنگی هۆکاری ئەوەیە کە لەیەکتری تێبگەن و ئەمەش هەموو ئەوەیە کەپێویستتانە تادڵخۆش بن، بەسروشتی و بۆ ئەوەی هەردووکتان هەست بکەین کەپشتگیری یەکتری دەکەن لەم پەیوەندییەدا.

پیاوان زۆر بەدەگمەن لەوانەیە ناچاربن تا دابنیشن

وبیدەنگ بن و گوێ بگرن، و ژنان پێویستە ڕێزی پیاوەتیان بگرن و داپۆشەری پیاوەتیان بن، ئەوەی ئیمە زیاتر هۆشمان لای ئاسنامە و ئیش و چۆن کاتیکی زیاتر لە دانیشتن و هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی شتێک بەفیڕۆبدەین کەناتوانرێت چارەسەربکرێت؟

بێگومان، بەرەوپێشچونێکی زۆر دەبێت ئەگەر ژنان بوەستن لە وتنی: «پێویستە قسە بکەین»، کاتێک ژن ئەمە دەڵێت بەرگری لەدەست دەدەین، ئارەق دەکەینەوەو چاوێک بەڕووداوەکانی هەفتەی پێشوودا دەخشێنینەوە لەمێشکی خۆماندا، هەوڵدەدەین لەوەتێبگەین کەلەچیدا هەڵەمان کردووە و کەی هەڵەمان کردووە؟ و چۆن چارەسەری بکەین تا نەکەوینە کێشەوە؟ لەڕاستییدا، پێم وایە بیرۆکەیەکی باشە، ئەگەر گفتوگۆکە بەم وشە سادانە دەست پێ بکەین: وەکو «خۆشەویستم، سەیرکە بەڕاستی هیچ کێشەیەک نییە--- تەنها دەمەوێت شتێک بە کەسێک بڵێم»، ئەمە سەرەتای دەستپێکردنێکی باشە، و ئەمە وامان لێدەکات ئاسوودەبین، و لەڕۆڵی گەواهی دەر دێینە دەرەوە و هەموو بەرگرییەکانمان دەخەینە لاوە، بەڕاستی وا دادەنیشین تا گوێ بگرین لەوەی کە دەیڵێیت.

سەرەتا گرنگترین شت، پیاو دەیەوێت لەگەڵتدا بخەوێت،

جەماوەرەکە کەپڕبوو لەژن پێیان دەوتم بەردەوام بم، ووتم با ڕێبکەوین، ووتم هەر ئێستا ئاوڕ بدەرەوە و سەیری دەموچاوی بکەو چاو ببڕە چاوی و پێی بڵێ کەچەند منداڵت هەیە و سەیری کاردانەوەی بکە. پیاوەکە زۆر هێمن بوو، تا ئەو کاتەی خانمەکە وشەی پێنجەمی پێ ووت، پیاوەکە وەک ئەسپێکی تووڕەی لێهات سەرتاپا دەموچاوی گۆڕا، هەرچەندە دەمیشی داخست هەر نەیتوانی سەرسوڕمانی خۆی بشارێتەوە و وشەی «ئۆوە» لە دەمی دەرچوو. لەسەرەتادا نەیدەتوانی شوێنەکەی خۆی لەلای ئەوەوە بەجێبهێڵێت، بەڵام لەناوبڕی داهاتوودا شوێنەکەی خۆی گۆڕی و چووە شوێنێکی ترەوە و، لەلای ژنێکی ترەوە بەدووری پەنجا پێ.

بینیت؟ ئەو شتێکی لەخانمەکە دەویست، بەڵام ئەو شتە پێنج منداڵی تێدا نەبوو، ئەو ئیشێکی باشی هەبوو، وە زۆر زیرەک دەردەکەوت، وە بە منی وتبوو کەپارەیەکی باشی دەست دەکەوێت بەڕوونی، هەر چۆنێک بێت ئەو ئەوەی نەخستبۆیە مێشکییەوە کەپارەکانی بەم شێوەیە بەش بکات (سەرفی بکات)، کاتێک ویستی گەمە لەگەڵ ئەم خانمەدا بکات تاکە شت بیری لێکردبویەوە ئەوە بوو کەبیخاتە داوەوە (هاوسەرگیری لەگەڵ بکات).

خانمەکەم (میوانەکەم) زۆر پێکەنی و لێی پرسیم کەهەموو ئەمانەم چۆن زانی؟

ئەوە ئاسانە: کاتێک پیاوێک لێت نزیک دەبێتەوە، پلانێکی هەیە، پلانە سەرەکیەکەش ئەوەیە کە لەگەڵت بخەوێت، یان بۆ دۆزینەوەی ئەو شتەی کەلەڕێگەیەوە دەتوانێت لەگەڵت بخەوێت.

بەشێوەیەکی گشتی وایە و بەپێی ئەزموونی خۆم، ڕاستە ژنـان حـەزیان لەدانیشتن و قسەکردنە، تەنانەت بەبێ هۆکاریش، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر حەز دەکەن قسە بکەن، بـەڵام ئێمەی پیـاوان حـەزمـان لەچەنەبازی نیە لەبەرامبەر چەنەبازیدا، ئێمە کاتی ئەوەمان نیە.

ئێمەی پیاوان کەسانێکی سادەین: ئەگەر ئێمە ئەوەی بینیمان بەدڵمان بوو(واتە ژنێک)، ئەوا لێی نزیک دەبینەوە، وە ئەگەرهیچ شتێکمان لێی نەویست ئەوا لێی نزیک نابینەوە. تکایە تیشک بخەرە سەر ئەم بەشە کەلێرەدایە، بۆئەوەی بتوانیت جاری داهاتوو خۆتت بیر بێت، کاتێک پیاوێک لێت نزیک دەبێتەوە: پیاو هەمیشە شتێکی دەوێت.

وەکاتێک پیاوێک لەژنێک نزیک دەبێتەوە پلانەکە بۆ زانینی دوو شتە: (١)ئەگەر تۆ ڕازی بیت لەگەڵیدا بخەویت، (٢)وە ئەگەر ڕازی بویت، ئەبێت چەندێک پارە بدات تا لەگەڵت بخەوێت.

ئەوە ئیشی خۆیەتی لەیانەی شەوانەدا، وە هەروەها ئیشی خۆیەتی لە چێشتخانەی کومپانیادا (لە کارەکەی). وە ئەو شتەیە کەدەیکات کاتێک ئەو هەموو کورسییە تێدەپەڕێنێت لەکڵێسەدا بۆ لای تۆ، یان لەسەر قەنەفەیەکی درێژ ڕێک دێتە لای تۆوە دادەنیشێت.

ئەگەر پیاوێک تۆ ببینێت و پرسیارت لێ بکات و بڵێت چۆنیت؟ پێت وایە کە چی لێت دەوێت؟

ئەو لێت نزیک نابێتەوە بۆ فێربوونی هیچ شتێک لە تۆوە یان بۆ زانینی حەزو ئارەزو و پێداویستیەکانت، لەکاتێکدا ژنان گرنگی بەمانە دەدەن(حـەز و ئـارەزو و پێداویستیەکان) کە دەیانەوێت لەکەسێک نزیک ببنەوە.

بەلام بۆ پیاوان ئالوزترە: کاتێک لەوسەری ژوورەکەوە ئەو ژنەی بینی کەحەزی لێیەتی، ئەروات بۆئەوەی لێی نزیک بێتەوە، هەرگیز گوێ بە کەسایەتیت نادات، یان چی ئەکەیت بۆ بژێت، هاوڕێکانتی هیچ بەلاوە گرنگ نیە، ئەگەر بێت و تەنانەت باوەڕیشت بەمەسیح نەبێت، ئەو تەنها ئەوەی دەوێت کەبزانێت ئایا دەتوانێت لەگەڵتدا بخەوێت، هەوڵ دەدات قسەت لەگەڵ بکات تا دیاری بکات پێویستە چەند ببەخشێت تا تۆ بەدەست بهێنێت. کاتێک دەڵێم « ببەخشێت›› تەنها مەبەستم پارە نیە، من مەبەستم نرخی خۆت و داواکارییەکانتە، چونکە ئەو هەوڵدەدات بزانێت ئەگەر «نرخ››ت زۆر بوو، یان ئەگەر گونجاو بوو یان ئەگەر لە ڕووی بیروباوەڕەوە ڕازیت بکات لەهەمان ئەو شەوەدا، وە ئەگەر تۆ هیچ یەکێک لەداواکارییەکانت دیاری نەکرد، ئەوا تۆ ژنێکی هەرزان و بەلاشی، و یارییەکە دەستی پێکرد، ئەو کات دڵنیا دەبێتەوە کەدەتوانێت لەگەڵت بخەوێت بەکەمترین تێچوون، بەلام ئەگەر بەڕاشکاوی پێت وت کە داواکاریت هەیە، واتە تۆ کاتت لێی دەوێت و دەتەوێت کاتت بۆ تەرخان بکات، لەگەڵ چاودێری و ئاگا لێ بوون، ئەو کات دەزانێت کە تۆ کەسێکی بەنرخ و گرانی، واتە ئەو پێویستە تێبکۆشێت تاسێکس بە دەست بهێنێت، لەوانەیە لای هەندێک پیاو ئەم نرخە زۆر بێت، کەتەنها بەدوای کاتێکی خۆشەوەن، وە گرنگی نادەن بە «بەخشین››، کات و ڕێز و بەرپرسیارێتی و پیاوی بێ نرخ تەلەفۆن بۆ هاوڕێکەی دەکات و بەم شێوەیە قسە دەکات: پیاو، دەبێت دوو بۆ سێ جار لەگەڵ ئەو ژنە بڕۆمە دەرەوە خۆ گالۆنێک (دەبەیەک) گاز بەپێنج دۆلارە، ئەو ژنەشم بیر نەچووە کەهاوارم بەسەریدا کرد و ئەبێت پەیوەندی پێوە بکەم و ئەم

جۆرە شتانە، نا، ئەو نرخە لەتوانای مندا نیە، بەڵام بۆ پیاوێکی تر لەوانەیە نرخت گونجاو بێت.

ئەمە زانیاریەکی بەسودە بۆ تۆ، چونکە ئێستا دەزانیت هەر کاتێک پیاوێک ویستی لێت نزیک بێتەوە، تۆ دەتوانیت هەرچی و پەرچییەکان بخەیتە لاوە وداواکارییەکانت دیاری بکەیت (کەدواتر دەربارەی قسە دەکەم)، و دەست بەجێ دیاری بکەیت کەئایا ئامادەیە نرخی ئەوە بدات کەبەدوای دەگەڕێیت، باشە، خانمان ئێستا شتەکە نهێنی نەماو دەتوانن بەپێی ئەوە ڕەفتار بکەن و کاتێک ئێوە ئاگادارنین کەهەموو پیاوان پلانیان بۆ ژنان هەیە، هیچ داواکاری و مەرجێکیان بۆ دانانێن، وەئەگەر هیچ ڕێسایەکی بنچینەیی بۆ دانەنێیت، ئەوا تۆ زۆر بەسادەیی پێی دەڵێیت کەتۆ ئامادەی بەپێی یاساکانی ئەو کار بکەیت، گرنگ نیە بەلاتەوە چەند جار پەیوەندی دەکات یان سەردانت دەکات، چەند جار دادەنیشێت و قسەت لەگەڵ دەکات، یان چەند جار دەرگای ئۆتۆبمێلەکەت بۆ دەکاتەوە: ئەمە مانای ئەوەیە هەرکاتێک ئامادە بوو ئەو کات پەیوەندیت پێوە دەکات، و هیچ دەرگایەکت بۆ ناکاتەوە و تەنانەت کاتێکیش داوات لێکردبوو کاتژمێر حەوت ئامادە ببێت، دڵنیابە تا کاتژمێر هەشت دەرناکەوێت، هەمووی بەهۆی ئەوەوەیە کەتۆ (١)نەتزانی بوو پیاوان هەمیشە پلانیان هەیە. (٢) بەپێی ئەوە ڕەفتار دەکات.

دەقاودەق هەمان شت ئەهات بەمێشکی خەزورمدا کاتێک یەکێک لە کچەکانم هاوڕێ کوڕەکەی هێنایەوە بۆ ماڵەوە بۆ خواردنی ژەمێکی خێزانی، لێرەدا دەمەوێت بڵێم خەزوورم یەکێکە لەو پیاوە زیرەکانەی کە لەژیانمدا بینیومە، پیاوێکە کەحەزم کردووە چاوی لێ بکەم، ژمارەیەکی زۆر کەم پیاو هەیە

کەدەمەوێت وەکو ئەوان بم و چاویان لێبکەم. وە ئەو شتانەی کەهەمیشە لەدەمی دێنە دەرەوە، ئەگەر هەمیشەش وا نەبێت بەلام زۆربەی کات لەجێی خۆیدا بووە و وای لێکردووم بیربکەمەوە و، ئەو ئێوارە ئەمە ڕوویدا: کاتێک خەزوورم کوڕەکەی بانگکرد بۆ ژووری میوانەکە تالەسەر قەنەفەکە دابنیشێت، وە پرسیارێکی ڕوونی لێکرد وەکو ڕۆژی ڕووناک «کەواتە، چ پلانێکت هەیە بۆ نەوەکەم؟ « کوڕە گەنجەکە کەتەمەنی دەوروبەری سی سالان دەبوو، وتی: مەبەستت چیە لەپرسیارەکەت؟ خەزوورم وتی: «تەنها مەبەستم ئەوە بوو کەبپرسم، پلانت چییە››؟ ئەویش وتی: «من هیچ پلانێکم نییە›› وە خەزوورم پرسی: «کەواتە، چی دەکەیت؟›› گەنجەکە بەپێداگرییەوە وتی: «من تەنها هەوڵ دەدەم کەبیناسم›› ، خەزوورم بەتوڕەییەوە وتی: «بەلام پلانت چییە و ئەم کارە بەکوێ دەگات؟ «، لە کۆتایدا، لەژێر گوشاری پرسیارکردن و زۆرلێکردندا، لەلایەن دوو پیاوی ڕەشت پێستەوە (من و خەزوورم) ڕوونیان کردەوە کەیارییەکە دەزانن، لەکۆتایدا گەنجەکە تێکشکاو ئەم چوار وشە کوشندەیەی وت: «ئێمە تەنها چێژ لەوە وەردەگرین›› وە خەزوورم دانیشت بۆ ماوەی خولەکێک سەیری گەنجەکەی کرد، ڕازی بوو، لەکۆتایدا، دوای ئەوەی گەنجەکە ڕاستییەکەی درکاند، خەزوورم بە هێمنی و خوێن ساردییەوە: «باشە، کەواتە چاکە››، با بەنەوەکەم ڕابگەێنین کەتۆ تەنها بۆ چێژ وا دەکەیت، با ببینین کەهەستی چۆن دەبێت کەببێت بەکەسێکی چێژدار، با ئەو بڕیار بدات.

کچەکەم ڕێک شێت بوو، دوای چەند خولەکێک کەپێمان ووت پلانی گەنجەکە چییە «کەتەنها پێی ڕادەبوێرێت و بۆ چێژە» کچەکەم ئەمە دەزانێت بەهۆی گفتوگۆ و دانیشتنە بەردەوامەکانی

ئیمەوە دەربارەی پیاوان، کەکاتێک کارەکە دەربارەی پەیوەندی پیاو و ژن دەبێت، چونکە تۆ(ژن) یان بۆ چێژ و ڕابواردن بە کارت دێنێت، یان کەسێکی گونجاو دەبێت بۆی بۆ ماوەیەکی درێژ، هەردووکیان بەیەکەوە نابێت زۆر بەڕوونی، ئەو گەنجە، پلانێکی جیاوازی هەبوو لەوەی کەکچەکەم دەیویست.

بەختەوەرانە، کچەکەم من و باپیری هەبوو تایارمەتی بدەین لەئاشکرا کردنی پلانی گەنجەکەدا، بەڵام هەموو ژنێک باوکێکی وایان نییە، کە بتوانن یارییەکان و پلانەکانیان بۆ ئاشکرا بکەن و بیزانن، ئێستا، کاتێک ئەو پیاوە بەڕووتەوە پێدەکەنێت و قسەت بۆ دەکات، وەکو ئەوەی گیرۆدەت بێت، تۆش وارەفتاربکە ڕاستییەکە دەزانیت، لەبەرئەوەی تۆ ئێستا دەزانیت: ئەو دەیەوێت لەگەڵت بخەوێت.

## نرخت چەندە؟

ئەگەر بەڕاشکاوی نرخی خۆتت پێ وت، ئەویش بەڕاشکاوی پێت دەڵێت کەئەوە نرخێکی زۆر بەرزەو لەتوانای مندا نییە بیدەم، ئەوکات تۆش بەڕێی خۆتدا برۆ و بەردەوام بە (وازی لێ بێنە).



## ـ٦ـ
# وەرزشی ڕاوی ماسی گەورەتر
# VS
# پاراستنی ماسییەکە
## چۆن پیاوان جیاوازی بکەن لە نێوان ژنی گونجاو بۆ هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێک کە یاری پێ بکات

هەرکەسێک بەڕاستی من بناسێت، حەزیشم دەزانێت دەربارەی ڕاوە ماسی، وە هەمیشەش حەزم لەساتە ئاسودە و هێمنەکانی وەرزشە، وە دانیشتن لەبانک یان ڕازاندنەوەی بەلەم لەدەرەوە، لەئاوێکی کراوە و فراواندا، لەوە خۆشتر نییە. هەروەها، ئارەزووی دەردانی لەپڕی «ئەدرینالین « (هۆرمۆنی خۆشی)، کەکاتێک هەست دەکەم ماسییەکە لەوسەری هێڵەکەی منەوەیە و ناتوانیت وێنای ئەو لەرینەوەیە بکەیت کەدرووست دەبێت، کاتێک کەمن دەبێت هەموو هێز و توانام بەکاربهێنم تا سەیربکەم و بزانم، تۆ بڵێی بتوانم ئەم ماسییە بەقولاپەکەوە بهێڵمەوە و خولخولۆکەکە لوول بکەم و، ماسییەکە ڕابکێشمە ناو بەلەمەکەوە، دوای ئەوە بەشە قورسەکە دێت.

بڕیاردان لەوەی کەماسییەکە هەڵبگرم، یان هەڵی بدەمەوە ناو ئاوەکە، و بەپێی ڕاوە ماسی «بە قولاپ گرتنیان» لولکردنی خولخولۆکەکە هێرشێکی تر دەکەم و هێز بەکاردێنم تاسەیریان بکەم، تابزانم چۆن هەست دەکەن، هەڵسەنگاندنی بۆ دەکەم ئەگەر بیخەمە ناو سەتڵەکەمەوە، یان نا و بڕوا بکە؛ ماسییەک دەبێت تایبەتمەند بێت، تا بیخەمە ناو سەتڵەکەمەوە، ئەگینا ئەگەر وانەبێت دووبارە هەڵیدەدەمەوە ناو ئاوەکە، تا دانەیەکی باشتر ڕاو بکەم.

پیاو لەبەر دوو هۆکار ڕاوی ماسی دەکات: یان ئەوەتا بۆ وەرزشی ڕاوە ماسییە، یان بۆ خواردن، کەئەمەش ئەوە دەگەیێنێت هەوڵدەدات گەورەترین ماسی بگرێت و وێنەیەکی بگرێت، و بەهیوای ئەوەی لەگەڵ هاوڕێکانی بەدڵی بێت و دواتر هەڵیبدەنەوە ناو ئاوەکە، یان ئەو ماسییە دەباتەوە بۆماڵەوە و پولەکەکەی لێدەکاتەوە و لەتوپەتی دەکات و جوان دەیشواتەوە و دەیبرژێنێت و دەیخاتە ناو قاپەکەیەوە و پێم وایە ئەمە باشترین (ئەنالۆژی)(لێکچواندن)ە بۆ شێوازی چۆنیەتی گەڕانی پیاوان بۆ ژنان.

سەیرکە، پیاوان هەر لەسروشتییەوە، خۆیان ڕاوچین، ژنانیش نێچیرن، بیری لێبکەرەوە: لەکۆنەوە وتراوە کەپیاو ژنێکی «هەڵبژاردووە « بۆ خۆی یان پیاوێک «بانگهێشتی›› ژنێکی بۆ خوانی ئێوارە کرد، یان پیاوێک داوای «مۆڵەتی›› لەباوکی کچێک کرد تا هاوسەرگیری لەگەڵ کچەکەی بکات، یان تەنانەت دەشیبات بۆ پیاسە و ژوانی لەگەڵ دەبەستێت، ئێمە بەدرێژایی ژیانمان دوای ژنان کەوتووین، ئەمە تەنها شتێکی باش نییە کەدوای ژن بکەوین، بگرە شتێکی زۆر سروشتییە، و ژنانیش

ماوەی چەندەها ساڵە ئەمەیان قبووڵ کردووە: چەندجار تۆ یان یەکێک لە کچەکانت وتوتانە: « حەزم لەوەیەکە پیاوێک دوام دەکەوێت « یان بڵێن « من دەمەوێت ڕۆمانسی بێت و گوڵم بۆ بهێنێت، و وام لێبکات هەست بکەم کەسێکی ویستراو بم»؟ گوڵ و خشڵ و پەیوەندی تەلەفۆنی، ژوان، و گفتوگۆی شیرین، هەموو ئەمانە چەکێکن لەکارخانەی ڕاوکردنی پیاودا بەکاردەهێنرێت، کاتێک دوات دەکەوێت. بەڵام هەمیشە پرسیارێک دەمێنێتەوە: کاتێک ئێمەی پیاو تۆمان کرد بەقولاپەکەوە دوای ئەوە چیت لێدەکەین؟ فەلسەفەی من لەخۆشەویستیمدا بۆ ڕاوکردنی ماسی دەڵێت: یان بۆ خۆشییە، یان بۆ هەڵگرتن و پاراستنی ماسییەکی گەورەی باش، چۆنیەتی یەکتر بینین و گفتوگۆکردن و جۆنیەتی گەشەکردنی پەیوەندی، و ئەو داواکارییانەی کەبۆ پیاوەکەتی دادەنێیت.

هەموو ئەمانە دیاریدەکات، کەپیاوەکە وەکو ماسی چێژ سەیرت دەکات، یان بۆ پاراستن و هەڵگرتن سەیرت دەکات، و ئەوە ئەوجۆرە ژنەیە کە پیاو خەیاڵ دەکات لەگەڵی بێت، و ڕێگای جیاکردنەوەی ئەم دوو جۆرە زۆر ئاسانە، کەدواتر ڕوونی دەکەمەوە.

## وەرزشی ماسی بۆ چێژ........

هیچ یاسایەکی نییە، و داواکاری و ڕێزی خودی یان بنەمای تیا نییە، و ئێمەی پیاوان دەتوانین لەدووری چەند میلێکەوە بۆنی ئەوە بکەین، کەکچی ئاهەنگە و قومێک لە چا ساردەکەی و خواردنەوەکەی دەدات و دواتر جاڕی خوازبێنی یەکەی دەدات، کەئەو تەنها ویستوویەتی «ژوان ببەستێت و دواتر بزانین چۆن

دەبێت›› و ئەو ژنێکی پۆشتەیە و لە نوسینگەی کار و زۆر لیهاتووە لەبەکارهێنانی کۆمپوتەردا، بەڵام بێ ئاگایەکە کەچۆن لەپیاوێک نزیک بێتەوە، و هیچ پلانێکی نییە بۆ پەیوەندیەکی بەردەوام، و چاوەڕێی هیچ شتێکی دیاریکراو لەپیاوێک ناکات، هیچ شەرت و مەرجێک دانانێت بۆ هەر کەسێک کەلە بەرامبەریدا بێت، ئەو زۆر بەڕوونی دەریدەخات کە ئامادەیە بۆ قبوولکردنی هەر شتێک کەڕوو‌بدات، و بەدڵنیاییەوە وا لەپیاو دەکات کە بزانێت لەڕێگای وتەوە، یان کردارەوە بێت، کەپیاو دەتوانێت هەرچۆنێک بیەوێت مامەڵەی لەگەڵدا بکات، و بێگومان پیاویش هەر وا دەکات، بڕوام پێ بکە هەموو پیاوێک لەڕیزەکەدا دەوەستێت تاسەرەی دێت.

## ماسی هەڵگرتن یان (هێشتنەوە):

ماسییەک کەبۆ هێشتنەوە بێت، هەرگیز بەئاسانی خۆی نادات بەدەستەوە، و پێوانە (داواکارییەکان)ی دیاری دەکات، هەر کەدەمی کردەوە سەیرکە، چونکە ئەو هێزی خۆی دەزانێت و وەکو شمشێرێکی سامۆڕای بەکاریدەهێنێت، ئەو فەرمان دەکات نەک داواکاری، وە ڕێزیش پیشان دەدات بەشێوەی هەڵسوکەوت کردنیدا، و تۆ دەتوانیت لێی نزیک ببیتەوە و باشترین یاریەکانت لەگەڵی بخەیتە گەڕ، و لەگەڵ ئەوەی لەوانەشە بەقسەکانت سەرسام بێت، و مسۆگەر نییە کەبهێڵێت قسەکردنەکە زیاتر بخایەنێت، یان ژمارەی تەلەفۆنەکەیت بداتێ و رازی بێت کەمێک لەکاتە بەنرخەکانی خۆیت پێ ببەخشێت، پیاوان ئۆتۆماتیکی دەزانن هەر لەوساتەی کەئەو ژنە دەمی کردەوە دەزانن ئەگەر بەڕاستی بیەوێت بەدەستی بهێنێت، ئەوا

پێویستە خۆی بگونجێنێت لەگەڵ بنەما و داواکارییەکانیدا، یان بەرێی خۆیاندا بڕۆن، چونکە ئەو یارییەکانی ئاشکرا کردووە و گرنگ نییە بەلایەوە، بەڵام ئەو ژنە هەندێک ئاماژە دەنێرێت کەگوزارشت لەوەدەکات کەدەتوانێت بە وەفا بێت بۆ پیاوێک و گرنگی پێبدات، و ئەوە بەرز دەنرخێنێت کەئەو پیاوە لەپێناو پەیوەندییەکەداچی دەکات، و ئەو کات ئەویش ئامادە دەبێت بۆ خۆشەویستی ـــخۆشەویستییەکی ڕاست و درێژخایەن.

دەنگوباست: پیاو ئەو کەسە نییە کەدیاری دەکات تۆ ماسی چێژ بیت یان ماسییەکی باش بیت بۆ هەڵگرتن، بەڵکو ئەوە تۆی دیاری دەکەیت، (لەبەرئەوە ڕقت لەیاریزانەکە نەبێت بەڵکو ڕقت لەیارییەکە بێت) کە پیاوێک ویستی لێت نزیک بێتەوە، ئەوەی کۆنتڕۆڵی دۆخەکە دەکات تۆی نەک ئەو، هەر تۆش دیاری دەکەیت ئەگەر بتەوێت قسەت لەگەڵ، بکات یان خواردنەوەت بۆ بکڕێت، یان سەمات لەگەڵ بکات، یان ژمارەکەتی بدەیتێ، یان بتباتەوە بۆ ماڵەوە، یان جارێکی تر یەکتر ببیننەوە، و هەموو ئەمانە و بێگومان ئێمە ئەم شتانەمان لەئێوە دەوێت: وە لەبەر ئەم هۆکارە قسەمان لەگەڵ کردی، بەڵام ئەوە تۆیت بڕیار دەدەیت کە ئەو شتانەی دەمانەوێت پێمان ببەخشیت، وە جۆنیش پێمان دەبەخشیت.

ئەگەر تۆ کۆنتڕۆڵی دۆخەکەت کرد، ئەوە پێگەی تۆ دیاری دەکات لە ڕوانگەی ئێمە ،و هەر وشەیەک کەدەیڵێیت یان هەر جوڵەیەک کە دەیکەیت، وە هەر ئاماژەیەک کەدەیکەیت، یارمەتی پیاو دەدات کە ئایا دەبێت یاریت پێ بکات یان ڕاست و ڕەوان بێت لەگەڵت، یان ئەوەتا دەڕوات بۆلای ژنێکی تر، تا ئارەزووەکانی تێر بکات لەڕاوکردندا.

حەز دەکەم ڕێگای هەڵسوکەوت کردنت لەگەڵ ئەم دۆخەدا بچوێنم بە »سەرکەوتنی پلەبەندی لەکاردا«، بیری لێبکەرەوە: ژوان زۆرلـە کارکردن دەچێت: باشترین ڕێگە بۆئەوەی سەرکەوتوو بیت، ئەوەیە کە سەرپەرشتی و کۆنترۆلی ئەوشتانە بکەیت کەبەرپرسیت لێیان. و کاتێک دەستم بەئیشکرد لەبواری پیشکەشکاریدا کرد، دەمزانی دەمەوێت ببم بە سەرتۆپی کۆمیدیەکان، بەڵام بەهۆی ئەوەی خاوەنی یانەکان منیان بە باشی نەدەناسی و هەموو ئەوەی کەدەمتوانی بەدەستی بهێنم ڕۆلی دەست پێکرد بوو___یەکەم پیاو بووم کەدەچوومە سەر تەختەی شانۆکە___و ١٥ خولەکم هەبوو تانواندنەکەی خۆم پیشکەش بکەم و تەختەی شانۆکە بەجێ بهێڵم، و لەگەڵ ئەوەش دەمزانی کەئەگەر پابەندبم بەیاساکانی یاریەکەوە___ واتە ئەگەر لەکاتی دیاریکراودا دەربکەوم و لەگەڵ خەڵکدا تێکەڵ ببم و لەوەش گرنگتر ئەوە بوو ئەگەر نواندنێکی پێکەنیناوی پیشکەش بکەم و کاریگەری جێبهێڵێت لەسەر گوێگران و خاوەنی نادیەکان، تا منیان بیر بمێنێت، ئەوکات دەتوانم ببمە خاوەنی کارێکی سەرەکی وەکو ئەستێرەیەکی کۆمیدی، کەناوی لەسەر___ یانەکە نوسرابێت،٤٥ خولەکیش بەدەست بهێنم تا والە خەڵک بکەم لەپێکەنیندا هاوار بکەن، و من لەسەرەتادا توانیم کۆنترۆلی ٤٥ خولەکەکەم بکەم، و خەڵک بخەمە پێکەنین، بەجۆرێک کەمنیان بیر بمێنیتەوە، دواتر سودم لەڕۆلی خۆم وەکو دەسپێکەری شانۆکە___وەرگرت و بووم بەکۆمیدی، وەکو ئەستێرەیەک «ناسرام» لای هاندەر (جمـوور)، واتـە نواندنکارەکەی کە ٣٠ خولەکی هەیە تەختەی شانۆکە، ودەقاودەق هەمان شتم کرد. لەو ٣٠ خولەکەی کەلەسەر تەختەی شانۆ بەسەرم برد

و بەشێوەیەک خەڵکم دەخستە پێکەنین، کەخاوەنی یانەکان ناچاربوون بمکەن بەئەکتەری سەرەکی کۆمیدی.
ئەبینیت؟ سەکەوتووبووم لەبوون بەیەکێک لەپاشاکانی کۆمیدی بەهۆی خواست وتوانای کۆنترۆڵکردنی بەرهەمەکەم، و بەهۆی نواندنەکەمەوە لە کۆتایدا بووم بەوەی کەرێک خۆم دەمویست ببم، بەو شێوەیە بەتەواوی توانیم ئەوە بەدەست بهێنم کەخۆم دەمویست__سەرکەوتن.
وەهەمان شت بەسەر ئەو ژنەدا دێت کەدەیەوێت «شیاوی هەڵگرتن و دەست نیشانکردن بێت»و باشتربێت لەماسیەکانی تر کەبۆ چێژە، تۆ کۆنترۆڵی ئەوە دەکەیت کەدەتوانیت کۆنترۆڵی بکەیت __ئەویش وێنەی خۆت و چۆنیەتی ڕەفتارکردنت ___و ئەو شێوازەی کەرێگە بەپیاوان دەدەیت قسەت لەگەڵ بکەن و لێت نزیک ببنەوە، ئەوە بەکاربێنە تا ئەو پەیوەندییەت دەست بکەوێت کەخۆت دەتەوێت.
با ئەمەت بۆ ڕوون بکەمەوە: خەیاڵ بکە کەتۆ لەیانەیەکی تەندروستیت و لەسەر ئامێری ڕاکردنەکەی، جلێکی وەرزشی سورت لەبەردایە لەگەڵ بیجامەیەکی مەتاتی تەسکدا و ئارەقت کردۆتەوەو بەردەوام دەبیت لە وەرزش کردن، زۆر گونجاو وسەرنج ڕاکێش دیاریت، پیاوێکی جوان و قۆز دێتە ژوورەوە__لەش و لارێکی شیاوی هەیە هیچ ئەڵقەیەک لە پەنجەیدا نیە ،و کاتێک دێتە سەر ئامێری ڕاکردنەکەی پەنا تۆ و کارلێک لەنێوانتاندا ڕوودەدات. ئەو پێدەکەنێت و تۆش بۆی پێدەکەنیتەوە، تۆ دەچیتە سەر ئامێرێکی تر، ئەویش دەچێتە سەر دانەیەکی نزیک لە تۆ ___ئەو سەرنجت دەداو تۆش سەرنجی دەدەیتەوە، زە کاتێک هەردووکتان لەڕاهێنان تەواو

دەبن بەفر دەهێنێت بۆت تا بەبیانووی ئەوەوە قسەت لەگەڵ بکات وسەیری چاوەکانت دەکات و لەوانەیە بڵێت: وا دیارە ڕاهێنانی باشت کردوە، یان لەوانەیە دواتر چاو ببڕێتە لێوەکانت وبڵێت «تۆ ژنێکی کە گرنگیەکی باش بەخۆت دەدەی، نایابە».

لەڕێگەی چۆنیەتی وەڵام دانــەوەت ـــ و چۆنیەتی کۆنترۆڵکردنی قسەکردنی لێوەکانتان ـــپیاوەکە دیاری دەکات کەژنێکی دیاریکراو بێت (وەکو ماسی چێژ ) یان ژنێکی باشیت تا هەڵتبژێرێت و بتهێڵێتەوە، و ئەگەر شتێکی هاوشێوەی ئەمەت وت»لەڕاستیدا کچ دەبێت سەرنج ڕاکێش بێت « دواتر ئاوڕبدەیتەوە تا لای ئەو خۆت سەرنج ڕاکێش دەربخەیت، ئەوکات ئەو پیاوە بیردەکاتەوە کەچەند دەخایەنێت تا ڕازیت بکات لەگەڵی بخەویت، وە دوای ئـەوە کاتی ڕاهێنانەکانی دەگۆڕێت، تاوەکو چیتر ناچار نەبێت جارێکی تر چاوی بەتۆ بکەوێتەوە، کاتێک ئەوەی ویستی لێت دەستی کەوت.

وە پیاو لەڕێگەی ئەم قسەو کردارانـەوە دیاری دەکات کەتۆ ژنێکی سادەی یان بەئاسانی خۆت بەدەستەوە دەدەیت ـــلەو جۆرە ژنانەی کە دەیەوێت کاتێکی خۆش بەسەر ببات و لەهەمان کاتدا کێشێکی گونجاوی هەبێت تاوەکو لاشەی جوان بێت و سەرنجی پیاوانی پێ ڕابکێشێت چێژی لێوەربگرن، وە دڵنیات دەکەمەوە کەئەم ڕستە کەمانەی دواتر کە لە دەمی پیاو دێتە دەرەوە ئەوە دەگەیەنێت کەچەند هەوڵێکی جدی دەدات تا بتخاتە داوەکەوە، وە ئەگەر تۆ لەو نێچیرانە بیت کەدێت بەرەو خواردنی قولاپەکە ئەوکات قولاپت بۆ هەڵدەدات تا دەست بکات بە ڕاوکردن.

بەڵام ئەگەر تۆ بەم شێوەیە وەڵامی بدەیتەوە: «سوپاس،

من تەندروستیم گرنگە بۆم، ئەنجامدانی ڕاهێنانە وەرزشیەکان شتێکی زۆرباشە تا لە تەندروستیەکی باشدا بمێنیتەوە».

وە ئەوکات بۆی دەردەکەێت کەپێویستە قوڵتر بێتەوە تا زیاتر دەربارەی تۆ بزانێت.

بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیێنێت کەدەیەوێت دەست نیشانت بکات و بتهێڵێتەوە، لەبەرئەوە پێویستە تۆ هەندێک لەم ڕستە سادانە زیاد بکەی بۆ قسەکانت، بەڵام بەلایەنی کەمەوە خێرا فڕێت نەیاتەوە ناو ئاوەکە، وەکو ماسی چێژ. لەوانەیە قسەکانت وای لێبکات دەربارەی ڕاهێنانەکانی خۆی قسەت بۆ بکات، کەلەوانەیە گفتوگۆیەکی گرنگ و واتادار لەنێوانتاندا ڕوودبات سەبارەت بە بەرژەوەندی هاوبەشتان لە مانەوە بەتەندروستی.

وە لەوانەیە پرسیاری زیاتر بکات لەو ژنە شیاوەی کەکۆمەڵێک وەڵامی بۆ پرسیارەکانی هەیە، وە بێگومان مەرج و داواکاری تەواوەتی هەیە، تا ئەو پیاوە بزانێت ژنێکی شیاویت و بەدوای پیاوێکدا دەگەڕێی کەژیانی لەگەڵ بەسەر بەریت و لەگەڵت بمێنێتەوە.

ئێستا، ئەوەش ئەوە ناگەیەنێت کەدەتوانیت گرەنتی ئەوە بکەیت پیاوەکە نـاڕوات، چونکە تۆپیشانت داوە کەژنێکی شیاویت، چونکە هەندێک پیاو تەنها لەپێناو چێژدا ڕاو دەکەن و هیچ نیازێکی زیاتریان نیە لەوەی هەڵت بداتە سەر پێخەفەکە و هیچی تر، وە ئەگەر ئەوە تاکە خەمی ئەو پیاوە بوو ئەوکات وازی لێبێنە با بڕوات___بەتۆچی؟ چونکە ئەو پیاوە نیە کەبۆی دەگەڕێیت، دەزانم تۆو کچەکانت بەدرێژایی چەندین ساڵ پێتان وتراوە: هیچ هەلێک لەدەست مەدەن کاتێک پیاوێک هات بەرەو پیرتانەوە.

چونکە لەوانەیە پیاوە گونجاوەکە بێت. بەڵام من پێت دەڵێم ئەم فەلسەفەیە بەتەواوەتی بێ مانایە ــــ ژنان کەسانی زیرەکن ــــ چونکە کاتێک هاوڕێکەت درۆ دەکات دەزانیت، منداڵەکانت دەناسیت کاتێک شتێکی خراپی کردووە و هاوپیشەکانت ناتوانن شتێک تێپەڕێنن بەبێ ئاگاداری تۆ، وە تۆ خێرا بەهەموویان دەڵێیت کەتۆ گەمژە نیت، و ئاگات لێیانە لــەدووری چەند میلیکەوە چی دەکــەن، و ڕێگایان پێ نــادەی یاریت پێبکەن، بەڵام کاتێک بابەتەکە دێتە سەر پەیوەندی سۆزداری لەگەڵ ڕەگەزی بەرامبەر، هەموو ئەمانە بێ سوود دەبن، هەموو هێزت دەدەی بەدەستەوەو کۆنترۆڵی دۆخەکە لەدەست دەدەیت، خۆت بەدەستەوە دەدەیت بۆ هەر پیرە پیاوێک کەدووجار سەیرت بکات، تەنها لەبەرئەوەی دوو جار سەیری کردی! من داواتان لێ دەکەم لەم بارەیەوە بەزیرەکی مامەڵە بکەن، دڵنیاببەوە ئەگەر بەدوای پەیوەندییەکی جدییەوە نەبوو ،ئەوا تۆ ناتوانیت بۆچونی بگۆڕیت، تەنها لەبەرئەوەی ئێوە ژوان دەبەستن و پەیوەندییەکی قوڵ وپتــەوتــان هــەیە، لــەوانــەیــە باشترین ژنــی ســەر ڕووی زەوی بیت و ــــ تواناى وتوێژکردنێکی سەرنج ڕاکێشت هەیە، ئامادەکردنی نانی بەیانیان و لێهاتووی لەدەرخستنی تواناکانت بۆ ئامادەکردنی ساندویچ(لەفە) و ئەمە ئەوە دەگەیەنێت تۆ مرۆڤێکی سەربەخۆیت و لەژێر جڵەو و ڕکێفی ئەو پیاوەدا نیت ــــ بەڵام ئەگەر ئامادە نەبوو بۆ پەیوەندییەکی جدی لەگەڵت، ئەوا ئەوکات وەکو ماسی چێژ مامەڵەت لەگەڵ دەکات، باشترین نمونە بۆ ئەمە لە «نامەکانی ستراوبێری»دایە، ئەو نامانەن کە لەبەرنامەی ستیڤ هارڤی دا لەلایەن گوێگرانەوە دەنێردرێن، نامەیەک لەلایەن ژنێکەوە نێردرابوو کەبەڕوونی هەستی پێ

کردبوو، کە لەبوکەلەیەک زیاتر نیە کەپیاو یاری پێیدەکات،
ئافرەتەکە دەیوت: من بۆ ماوەی ٦ مانگ چاوم بەو پیاوە دەکەوت،
هەموو شتێک زۆر ناوازە بوو، هەتا مانگی یەکی ئەمساڵ ئێمە
پێکەوە دەچووینە دەرەوە و سەردانی ماڵی یەکترمان دەکرد،
بەڵام لەپڕ وەستا لەپەیوەندیکردن پێمەوە، وە کاتێکیش من
پەیوەندیم پێوە دەکرد وا دیاربوو کەپێی خۆش بێت، بەڵام
دواتر قسەکانی کورت دەکردەوەو زۆر وشک بوو لەگەڵما
و پلانی گەشتی دادەناو دواتر ڕەتی دەکردەوە، و کاتێکیش
پێم دەوت: ئەگەر دەتەوێت باهەموو پەیوەندیەکی نێوانمان
بپچڕێنین، دەیوت»نەخێر«، بەڵام واش ڕەفتاری نەدەکرد
کەنیگەران بێت و نازانم چی ڕوویدا، بەڵام هێشتا هەر خۆشم
دەوێت، بەڵام تەنها ئەوە نیگەرانی کردووم کەشتێک لەمێشکیدا
بێت و بەمن نەڵێت، یان لەوانەیە ژنێکی تری دۆزیبێتەوەو من
لەگیرفانی دواوەیدا بهێڵێتەوە. ئەو پیاوە ڕاوی ماسی دەکرد
تەنها بۆ چێژ، ئەو ژنەش لەدڵی خۆیدا دەیزانی، بەڵام هێشتا
هەر هەوڵی دەدا خۆی پیاهەڵبواسێت، تابزانێت کەئایا ئەو پیاوە
شێوازی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵی دەگۆڕێت یان نا؟ پێویستە
لەسەر هەر ژنێک کەلەم دۆخەدایە دەستبەرداری ئەو پیاوە
بێت و جێی بهێڵێت، وازی لێبێنێت باشترە لەوەی کات و وزەی
خۆت بەفیڕۆبدەیت لە پیاوێکدا کەناتوانێت و نایەوێت لەئاست
پێشبینیەکانتدا بێت، کاتێک پیاوێکی تر هاتە ڕێگات: جڵەو بگرە
دەست و بایاسا و ڕێسا بنچینەیەکانت بەڕوونی بزانێت، سەیری
کتێبەکە بکە لەبەشی (پیاوان ڕێزی پێوانەکان دەگرن ـبکە وـ
شتێکی وەربگرە) من لەدوای ١٠ی شەوەوە وەڵامی پەیوەندییە
تەلەفۆنییەکان نادەمەوە، چونکە منداڵەکانم خەوتوون و منیش

پشوو دەدەم.

«من ڕێزی ئەو پیاوانە دەگرم کەپابەندن بەمەوعیدەوە و کاتێکیش دوا کەوت پەیوەندی دەکات» و «من سێکس لەگەڵ هیچ کەسێکدا ناکەم هەتا دڵنیا ئەبم کەئەم پەیوەندییە پابەندوو جدییە__سێکس کردنی ڕێکەوت لای من بوونی نیە» ئەمانە هەمووی بنەمای سەرەکی قبوڵکراوە لەلای هەر پیاوێک کەدەیەوێت لێت نزیک ببێتەوە. وەئەگەر ڕەتی کردووە پابەندی ئەم بنەمایانەبێت، ئەوکات بەڕێی خۆیدا دەڕوات، چونکە تەنها ئامانجی چێژ بووە.

ئەگەر بەدوای ئەوەوە بوو شتێک بۆ خودی خۆی بنیاد بنێت، دەزانێت پێویستە ژیانی لەگەڵ ژنێکدا تەواو بکات، کەئەو ژنەش دەیەوێت شتێک بۆ خۆی بنیاد بنێت، ئەویش لای ئەو ژنە دەمێنێتەوە و بەردەوام دەبێت لەگفتوگۆکردن لەگەڵی، ئا ئەمە پیاوێکە ئامادەیە کاری جدی بکات____ پیاوێک نیە کەتەنها دلداریت لەگەڵ بکات و ئەوەی ویستی لێت دەستی بکەوێت و بڕوات. ئەوە ئەو پیاوەیە کەتۆ دەتەوێت؟ چونکە ئەو ڕاو دەکات بۆ دەستنیشانکردن و هەڵگرتن، نەک بۆ ڕاوکردنی چێژ، دوای ئەوەی سەلماندی کەشایەنی ئەوەیە تۆ کاتی خۆتی پێببەخشیت، دوای ئەوە دەتوانیت ڕێی پێ بدەی بتباتەوە بۆ ماڵەوە و پاکت بکات و هەندێک بەهاراتت بەسەردا بکات و بتبرژێنێت و بترازێنێتەوە و بتخاتە سەر دەفرێکی بەتام و دواتر بتخوات (وەکو ماسیەکی باش و شیاو بۆ خواردن).

ئایا پێویستت بە نموونەی زیاترە سەبارەت بەجیاوازی نێوان ماسی چێژ و ماسی شیاو بۆ هەڵگرتن، ئەمە بخوێنەوە:

١_ئەو ژنەی کەداوای ڕێز دەکات، ئەوا شیاوی هەڵگرتن

...دەست نیشانکردنە: بەڵام ئەو ژنەی کەڕێگە بەپیاوان دەدات ...بێ ڕێزی بەرامبەر بکەن ئەوا شیاوی هەڵگرتن نیە، دووبارە فڕێ دەدرێتەوە ناو ئاوەکە.

٢_ئەو ژنەی پۆشاکی گونجاو دەپۆشێتو خۆی داپۆشیوە، ...لەگەڵ ئەوەشدا هەر سەرنجراکێشە، ئەوا ئەو ژنە شیاوە ...هەڵگرتن: بەڵام ئەو ژنەی جلی ڕووت و سەرنجڕاکێش ...بەردەکات، ئەویش فڕێ دەدرێتەوە ناو ئاوەکە.

٣_ئەو ژنەی ناهێڵێت هەست بەجەستەی بکەی لەکاتی ...سەماکردندا، ئەوا ژنێکی شیاوە بۆ هەڵگرتن: بەڵام ئەو ژنەی ...گەرمی سەما دەکات و وا لەپیاو دەکات لەشەرما سور ...هەڵبگەڕێت، ئەوا ئەویش فڕێ دەدرێتەوە ناو ئاوەکە.

٤_ئەو ژنانەی ژمارەی موبایل لەپیاوان وەردەگرن، بەڵام ژمارەی خۆیان نایەن بەپیاو، ئەوانە شیاوی هەڵگرتن: بەڵام ...ئەو ژنەی ژمارەی تەلەفۆنەکانی ماڵەوەو کارەکەی و ژمارەی ...تایبەتی خۆی و ئیمێلەکەی و ناونیشانی ماڵەکەی دەدات ...بەپیاوێک کەتەنها خواردنەوەیەکی بۆ کڕیوەو پرسیاری لێ ...کردووە چۆن دەتوانێت پەیوەندی پێوە بکات: ئەم جۆرانەش فڕێ دەدرێنەوە ناو ئاوەکە.

٥_ئەو ژنەی دەتوانێت بەڕێزبێت و گفتوگۆیەکی بەڕێزانە ...بکات لەگەڵ پیاوەکە و دایکیدا، ئەوا شیاوی هەڵگرتنە: بەڵام ئەو ...ژنەی لەترسا دەلەرزێت کەقسە لەگەڵ دایک و داپیرەیدا بکات، ...ئەوە ژنێکی شیاو نیە دووبارە فڕێ دەدرێتەوە ناو ئاوەکە.

٦_ئەو ژنەی کەلەگەڵ هەموو بارودۆخێک دەگونجێت کەتێی ...دەکەوێت ــــوە دەتوانێت خۆی بەڕێوە ببات لەکۆبوونەوەی ...کەس و کاردا، لەکۆبونەوەی کاردا، لەڕێستۆراندا، لەبۆنە

وەرزشیەکاندا، ئەوا ژنێکی شیاوی هەڵگرتنە: بەڵام ئەو ژنەی کەتوانای ڕێکخستنی سادەی و مەعقولی نیە، یان وا دەربیخات کەگرنگی پێ نادات، ئەوا ئەو ژنە فڕێ دەدرێتەوە ناو ئاوەکە.

٧_ئەو ژنەی کەدەزانێت دەیەوێت هاوسەرگیری بکات و خێزان بنیاد بنێت، وە بەڕونیش ڕێگە دەدات کەپیاو ئەمە بزانێت، ئەوە ژنێکی شیاوە بۆ هەڵگرتن: بەڵام ئەو ژنەی کەنازانێت چارەنووسی پەیوەندییەکەی بە کوێ دەگات دوای هەفتەیەک، دووبارە فڕێ دەدرێتەوە ناو ئاوەکە.

٨_ئەو ژنەی کەدەتوانین بەئاسوودەیی بەهاوڕێکانمان و خێزانەکانمانی بناسێنین ئەوە ژنێکی شیاوە بۆ هەڵگرتن: بەڵام ئەو ژنەی کەبەلامانەوە گرنگ نیە بەهاوڕێکانمان و خێزانەکانمانیان بناسێنین، فڕێ دەدرێتەوە ناو ئاوەکە.

٩_ ئەو ژنەی کەپێدەکەنێت و گرنگی بەخۆی دەدات و بەگشتی دڵخۆشە بەژیانی، ئەوا ژنێکی شیاوە بۆ هەڵگرتن: بەڵام ئەو ژنەی کەگرنگی بە خۆی نادات و هەموو کاتێک ڕووگرژە، وە هەمیشە ئەڵێی بارێکی قورس بەسەر شانیەوەیەتی، وە نایەوێت بەسەر ئەو کەسەدا سەربکەوێت کە تاوانێک یان هەڵەیەکی بەرامبەر کردووە، ئەم جۆرە ژنانەش هەڵدەدرێنەوە ناو ئاودکە.

١٠_ئەو ژنەی کەڕێزی خۆی پیشان دەدات لەبەرامبەر هەموو ئەو شتانەی کەبۆت کردووە، ئەوا ژنێکی شیاوە بۆ هەڵگرتن: بەڵام ئەو ژنەی کەوا ڕەفتار دەکات تۆ بۆ دڵخۆشکردنی هیچت نەکردبێ، ئەمجۆرە ژنانە هەڵدەدرێنەوە ناو ئاوەکە.

١١_ ئەو ژنەی کەوەفادارە، شیاوە بۆ هەڵگرتن: بەڵام ئەو ژنەی کە هەمیشە چاوی لەسەر ئەوەیە کەکێ لەتۆ باشترە، ئەم

ژنانەش هەڵدەدرێنەوە ناو ئاوەکە.

١٢_ئەو ژنەی کەتێدەگات پیاو دەیەوێت پیاوەتی خۆی بسەلمێنێت بە هۆی نازناوەکەی و پیشەکەی و موچەکەیەوە، وە ئەو ژنەی دەزانێت چۆن پەیوەندییەکان بەڕێوە ببات و بەلێهاتوویی و کارمەیی وا لەپیاوەکەی دەکات هەست بکات کەکارەکەی چارەسەر کردووە. ئەم جۆرە ژنانە شیاوی هەڵگرتنن: بەڵام ئەو ژنەی کەچەکی بانکەکەی وپارەکانی بەکاردەهێنێت وەکو شمشێرێک بۆ بچوکردنەوە و کەمکردنەوەی پیشەی پیاوەکەی لەگەڵ بەخششە داراییەکانی، ئەم جۆرانەش فڕێ دەدرێنەوە ناو ئاوەکە.

## چۆن بزانیت ئەو کەسەی چاوت پێیکەوتووە بەدوای ماسی شیاو بۆ هەڵگرتن دەگەڕێت یان بۆ چێژ:

١_ئەگەر قسە کردنی ئەو پیاوە لەگەڵت قسەکردنێکی زۆر ڕووکەش بوو، وە نەدەچووە قوڵایی بابەتەکانەوە، ئەوا ئەو پیاوە ڕاوی چێژ دەکات: بەڵام ئەگەر وادیاربوو گرنگی بەپێویستییەکانت و ژیانت و ویستەکانت و داهاتووت دەدات، کەواتە ئەو بەدوای ژنێکی شیاو بۆ هەڵگرتندا دەگەڕێت.

٢_ئەگەر بە پێداویستیەکانت و بەبنەماکانت پێکەنی، ئەوە مانای ئەوەیە ڕاوی چێژ دەکات: بەڵام ئەگەر ئامادە بوو پابەند بێت بە یاساکانتەوە و پەیڕەویان بکات، کەواتە ئەو بۆ ژنێکی شیاوی هەڵگرتن دەگەڕێت.

٣_ئەگەر ژمارەکەتی لێوەرگرتی و زیاتر لە ٢٤کاتژمێری خایاند تا پەیوەندیت پێوە بکات، ئەوا ڕاوی چێژ دەکات: بەڵام

ئەگەر دەست بەجێ پەیوەندی پێوەکردی، ئەوا هەوڵدەدات کەبۆت بسەلمێنێت گرنگیت پێ دەدات، وە زۆر ئاشکرایە کەئەو بەدوای ژنێکی شیاوی هەڵگرتندا دەگەڕێت.

٤_ئەگەر پیاوێک بردیتیە دەرەوە و ڕێگەی دا تۆ پارە بدەی، یان تەنها بۆ خۆدەرخستن دەستیکرد بەگیرفانیدا، ئەوا ئەو ڕاوی چێژ دەکات! بەڵام ئەگەر پارەی لیستی خواردنەکانی دا (حسابەکە)، ئەوا ئەو ئەوە پیشاندەدات کەئامادەیە دابینکەرت بێت، کەئەمەش ئەوە دەگەیێنێت وادیارە بەدوای ژنێکی شیاو بۆ هەڵگرتندا دەگەڕێت.

٥_ئەگەر پێی وتی بەدڵنیاییەوە لەکاتی دیاریکراودا لەو شوێنە دەبم، بەڵام هەموو کاتێک درەنگتر دەرکەوت بەبێ ئەوەی خۆی ماندوو بکات و پەیوەندیەکت پێوە بکات، لەوانەیە ڕاوی جێژ بکات: بەڵام ئەگەر لەکاتی خۆیدا دەرکەوت ئەوا بۆ ژنێکی شیاو بۆ هەڵگرتن دەگەڕێت.

٦_ئەگەر هەرگیز نەیناسانیت بەهاوڕێکانی، خێزانەکەی، هاوپیشەکانی، یان هەرکەسێکی تر کەگرنگە بۆی، کەواتە ئەو ڕاوی چێژ دەکات: بەڵام ئەگەر ناساندیتی بەکەسەکانی، لەوانەیە بەدوای ژنێکی شیاو بۆ هەڵگرتن بگەڕێت.

٧_ئەگەر بەبەردەوامی بیانووی هێنایەوە کەبۆچی بەهاوڕێکانی و خێزانەکەیت ناناسێنێت، کەواتە ڕاوی چێژ دەکات: بەڵام ئەگەر ڕازی بوو بتبات بۆ ئاهەنگێکی خێزانی، یان بۆ بۆنەیەکی کۆمەڵایەتی وە لەوێ بەخێزان و هاوڕێکانی و هاوپیشەکانی ناساندی، ئەوا لەوانەیە ئەو پیاوێک بێت وەکو ژنێکی شیاو بۆ هەڵگرتن سەیرت بکات.

٨_ئەگەر پیاوێک تەنیا بەبیستنی ناوی منداڵەکانت لەترسا

لەرزی، ئەوا ئەو ڕاوی چێژ دەکات: بەڵام ئەگەر ئەو ئامادە بوو چاوی بەمنداڵەکانت بکەوێت و دیارییان بۆ بهێنێت و پەیوەندیان لەگەڵ ببەستێت و وایان لێبکات ئاسوودەبن لەگەڵی، کەواتە ئەو پیاوە تۆ و منداڵەکانت بە شیاوی هەڵگرتن دەزانێت.

٩_ئەگەر لەڕووی مادی و عاتفی و ڕۆحیەوە ئامادە نەبوو، ئەوە لەوانەیە بەدوای ڕاوی چێژەوە بێت: بەڵام ئەگەر توانای دابینکردن و پاراستنی خێزانەکەی هەبوو، هەروەک چۆن پیاوی ڕاستەقینە ئەم کارە دەکات، کەواتە لەوانەیە بەدوای ژنێکی شیاو بۆ هەڵگرتندا بگەڕێت.

١٠_ئەگەر پێشوازی لەهەر پەیوەندییەکی «کراوە» کرد، وە وتی ڕێگری ناکات کەچاوت بەکەسانی تر بکەوێت، کەواتە ئەو ڕاوی چێژ دەکات: بەڵام ئەگەر ویستی پەیوەندییەکانتان تایبەت بێت، ئەو کات تەنها ژوان لەگەڵ تۆ دەبەستێت ، وە ئەو وەکو ژنێکی شیاوی هەڵگرتن سەیرت دەکات.



## __٧__

# _کوڕی دایکی خۆی_

هەموو ڕۆژێک لە بەیانیانی ستیف هارڤی، خۆم و یاریدەدەرەکەم «شێرلی» بڕگەیەکی بەناوبانگمان پێشکەشدەکرد بەناوی «نامەکانی سترۆبێری ٢٣» کە لەڕێیەوە بانگهێشتی گوێگرەکانمان دەکرد، تاوەکو چارەسەری کێشەکانیان بۆ بکەین، وە لەم بڕگەدا هەموو جۆرێکی نامەی نوسراو، نامەی ئەلکترۆنیمان پێدەگەشت، کەلەلایەن ئەو کەسانەوە دەنێردران کەدیاربوو پێویستیان بەئامۆژگارییەکی زۆرە دەربارەی چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ منداڵی سەرەڕۆدا، وە بەڕێوبەرێک کە داواکاری زۆرە لەسەر کار، یان خیانەتی خۆشەویستەکانیان، یان دەربارەی ئەو دایکانەی کەجڵەویان لەدەستداوە بەسەر منداڵەکانیاندا، وە پارە سەرفکردنی زۆر لەلایەن ئەندامانی خێزانەوە، وە هاوڕێیەتییە خراپەکان _یان هەر بابەتێکی تر کەتۆ دەیڵێیت، وە هەندێک پرسیاری زۆر خەمناک، هەندێکیان هێندە کتوپڕ بوون کە سەر و دڵی دەگرتیت، وە هەندێکیان وای لێدەکردی تەنها سەرت بلەقێنیت و پرسیار بکەیت ئەو کەسەی

داوای ئالۆزکارییەکی کردووە چۆن بەرگەی گرتووە.
بەو کێشانەی کە ئەم نامانەیان دەنوسی لە بن ئیشیدا نەبوو:
بۆ هەموو ئەو کێشانەی کەڕووبەڕووی «نامەکانی سترۆبێری
» دەبێتەوە هەزارەها گوێگر ڕووبەڕووی هەمان کارەسات
دەبوونەوە لە ژیانیاندا.
بە ڕای خۆمان دەربارەی بابەتەکە دەڵێین، وە هەندێک
پێشنیاریان بۆ دەخەینەڕوو، دەربارەی چۆنییەتی دەربازبوونیان
لەم بارودۆخە ئاڵۆزەی کەتیایدا دەژین، بەهەیوای ئەوەی
ئەو ئاڵۆزکارییانەی دەیدەین تەنها یارمەتی ئەوکەسە نەدات
کە نامەکەی بۆ ناردوین، بەڵکو یارمەتی ژمارەیەکی زۆری
گوێگرەکانیشمان بدات، کەبەدوای وەڵامـەوەن. وە زۆرێک
لە نامەکانی سترۆبێری›› کاریان تێکردم، بەڵام دیارترینیان
نامەیەک بوو بـەم دواییانـە لـەلایـەن ژنێکەوە نێردرا بوو،
شتێکی مایەی تێڕامانی لەسەر نووسرا بوو، کەئەمە بوو: ئایا
من هاوسەرگیریم لەگەڵ پیاوێک کردووە یان لەگەڵ کوڕێک!
لە نامەکەدا دەیووت: لەتەمەنی ٣٥ ساڵیدایە و هاوسەرگیری
لەگەڵ پیاوێک کرووە کەلە ٣٠ساڵی تەمەنیدایە، بۆ ماوەی ده
ساڵ خۆشەویست بووین، پێش ئەوەی هاوسەرگیری بکەین
٦ مانگ بەر لەئێستا، وە ژنەکە دەیووت خەسووم کۆنترۆڵی
مێردەکەمی کردووە، وە ئەمە وای لێدەکردم مێشکم لەدەست
بدەم، لەگەڵ ئەوەی کەپەیوەندی نێوانمان زۆر باش بوو (خۆم
و مێردەکەم)، ئەمە هەندێک لەنووسینەکەیەتی:
((خەسووم کۆنترۆڵی مێردەکەمی کردووە، وەکو ئەوەی
منداڵێکی بچووک بێت، داوای لێدەکات هەموو شتێکی بۆ بکات،
وردەکاری شەو پەیوەندی دەکات و دەتوانم گوێم لەهاوارکردنی

بێت لە تەلەفونەکەوە، بەهۆی ئەوەی لەهیچ ڕازی نییە، پەیوەندی پێوەدەکات بۆ پارە، بۆ ڕەنگکردنی مالەکەی، بۆئەوەی بهێت بەشوێنیدا تا لەسینەما بیهێنێتەوە، بۆئامادەکردنی خواردن لە بۆنە تایبەتییەکاندا، تەنانەت بۆ شوردنی جلەکانی، ئەوەی وایلیکردم کەئەم نامەیە بنووسم ئەوەیە ئێستا کاتژمێر ۱۰:٤۲ خولەکە و بەتەنها لەمالەوەم، چونکە مێردەکەم دایکی بانگی کردووە بۆ مالەکەی، تاوەکو یارمەتی بدات لەدروستکردنی کیکی ئاهەنگی پرۆژەکەی بۆ بەیانی، من پلانم دانابوو کەئەمشەو کاتێکی خۆش لەگەل هاوسەرەکەم بەسەر ببەم، بەلام جارێکی تر دایکی لێی تێکدام، بەهەلە لێم تێمەگەن، من حەزدەکەم ڕێزی دایکی بگرێت و یارمەتی بدات، بەلام هەندێک کات واهەستدەکەم کەمن پشتگوێ خرابم، بەداخەوە من و منداڵەکانم لەلیستی گرنگی پێدانەکانیدا نین، چونکە هەمیشە سەرقاڵی ئیشکردنە بۆ دایکی، من ماوەی چەندین ساڵە ئەمەم لە دڵی خۆمدا هێشتۆتەوە، بەلام نازانم کەدەتوانم تاچەندی دیکە بەرگەی ئەمە بگرم، دایکی هەمیشە لەڕێگەی خێزانەکەماندا دەوەستێت، من هەندێک کات واهەستدەکەم کەمن شووم بەپیاوێک نەکردووە.... من دەمەوێت پیاو بێت و کۆنترۆل بگرێتە دەست)).

ئێستا، لەمانای ڕستەی «ئایا من هاوسەرگیریم لەگەڵ پیاوێک کردووە وە یان کوڕێک؟» تێدەگەم. کە گوێبیستی دەبم لەو ژنانەی کەهەمان کێشەیان هەیە: مێردەکانیان بەڕادەیەک گیرۆدەی دایکیانن، کە تۆ لەو تەمەنەدا چاوەڕێ دەکەیت بەتەواوی کوڕێکی سەربەخۆبن ـــ پەیوەندیان لەگەڵ دایکیان وا لەدایکیان دەکات کەکۆنترۆڵی ژیانیان بکەن، و هۆکارێکە بۆ لەدەستدانی پەیوەندییە سۆزدارییەکان، دایکی دەڵێت «باز بدە»

کوڕەکەی دەڵێت «بەرزاییەکەی چەند بێت و کەی بکەرێمەوە سەر زەوی؟» هاوڕێکەی یان ژنەکەی چاوی دەسوڕێنێت لەلایەکەوە دادەنیشێت و دەم دادەچەقێنێت و پێکەنینێکی ناچاری دەکات و لەدڵی خۆیدا دەڵێت:

(أ) بۆچی ئەم پیاوە پێگەیشتووە دەمی هەڵناپچڕێت و جارێک ناڵێت نا! (ب) بۆچی ئەم ژنە دەستی بەسەر مێردەکەمدا گرتووە. (ج) پێویستە چی ئامرازێک بکڕێت یان بەکرێی بگرێت، یان هەڵی ببەستێت تاوەکو لێکیان جیابکاتەوە و هەرچی دەڵێن و هەرچی دەکەن و چەند ڕێگای جیاواز دەگرنەبەر تابتوانێت دوبارە لەگەڵ مێردەکەیدا دەست بکەنەوە بە بنیادنانی ژیانیان.

ئەمجۆرە ژنانەی «ئایا هاوسەرگیریم لەگەڵ پیاوێک کردووە یان لەگەڵ کوڕێک؟» وا هەستدەکەن کەناتوانن بەرهەڵستی ژنێکی دیکە بکەن، واتە خەسوی، ئەم ژنانە پاڵنەرو هۆکاری زیاتریان هەیە وەک لەڕاوێژکاری گشتی، تا بەشانازییەوە ئەم نازناوە بەسەر مێردەکانیاندا بسەپێنن (کوڕی دایکی): دایکی ڕەتی دەکاتەوە کەپەتی نێوانیان بپچڕێنێت و ڕێگەی بدات ببێت بە پیاو، دایکی هێشتا پێی وایە کەلەسەر ئەم زەویە ژنێکی گونجاو نیە بۆ کوڕەکەی، دایکی هەمیشە دژایەتیەکی هەیە بەرامبەر ئەو کەسەی لەژیانی کوڕەکەیدا هەیە، وە پیاوەکەش نایەوێت گەورە بێت: ئەو مەحاڵ بۆ دایکی ئەنجام دەدات، چونکە دایکی بەنازی کردووە و گرنگی بەپێویستیەکانی دەدات، گوێمان لەهەموو ئەمانە بوو.

بۆ هەموو ئەو کەسانەی کەدەڵێن» ئایا من هاوسەرگیریم لەگەڵ پیاوێک کردوە یان کوڕێک؟» وە بۆ هەموو ئەو ژنانەی کە لەپەیوەندیدان لەگەڵ «کوڕی دایکی» پێتان دەڵێم: بووەستن

لەهێنانەوەی بیانوو، دڵنیابن مێردەکانتان بۆیە گوێ لەدایکیان دەگرن چونکە ئێوە ڕێگەی پێدەدەن وابکات.

## بەڵێ ئەوە هەڵەی ئێوەیە.

با پێتبڵێم کەپیاو بۆچی لەژێر جێگە گەرمەکەی و لای ژنەکەیەوە هەڵدەستێت و جلەکانی لەبەردەکات و کلیلی ئۆتۆمبیلەکەی دەبات کاتژمێر ١٠:٤٢دەڕوات لەگەڵ ئەوەی ژن و منالەکانی بەتەنهان، دەڕوات بۆ ناوشار بەئوتۆمبیلەکەیەوە تا کێکێکی نەفرەتی بۆدایکی بکرێت لە نیوەی شەودا، تا دایکیشی ڕۆژی دواتر بیفرۆشێتەوە: چونکە دایکی یاساو ڕێسای بۆ ئەم پیاوە داناوە لەکاتێکدا ژنەکەی نەیتوانیوە بیکات.

سەیرکە، پێشتر پێم وتی کەچۆنە: ئەگەر پیاوێک خۆشی بوێت، ئەبێت بەو پیاوەی کەتۆ دەتەوێت، ئەگەر تۆ داواکاری و بنەماو یاسا و ڕێسات هەبوو ئەوا دەبێت بۆی دیاری بکەیت، تا پەیوەندیەکەتان سەرکەوتوو بێت بەوشێوەی کەتۆ دەتەوێت.

پیاوی ڕاستەقینە دڵخۆش و تامەزرۆ دەبێت، کە بەپێی یاساکانی تۆ بژی، وە کاتێک یاساکانتی زانی ئەوکات دڵنیا دەبێت کەبەپێی ئەوانە کاربکات، تا ئەو ژنەی خۆشی دەوێت بەدڵخۆشی بهێڵێتەوە، یەکەم شت کەپێویستە لەسەرت بیکەیت ئەوەیە، ئەم یاسایە بەدەنگێکی بەرز ڕابگەیەنیت لەسەرەتای پەیوەندیەکەتاندا و دڵنیابیت کەپێوەی پابەند دەبێت.

بەلام ئەگەر تۆ هیچ داواکاری و بنەمایەکت نەبوو، ئەوکات دەزانی دوای یاساکانی کێ دەکەوێت؟ بەدڵنیاییەوە دایکی، لەبەرئەوەی تاکە ژن بووە کەپێی وتووە چی قبول دەکات و چی قبول ناکات: پێشبینی بکە ئەم کورە چی دەکات ئەگەر دایکی

پێی بڵێ پێش ئەوەی بێیتە سەر مێزی نانخواردنەکە دەستەکانت بشۆ، یان بڵێ بگەڕێرەوە ماڵەوە پێش ئەوەی تاریک دابێت و ئاگات لەخوشکەکەت بێت کەچونە دەرەوە.

وە هەمیشە گوێ لەدایکی دەگرێت و متمانەی پێیەتی، ئەو دوای ئەم یاسایانە دەکەوێت، چونکە نایەوێت ڕووبەڕوی دەرەنجام و سزا بێتەوە. خۆ ئەگەر وانەکات ئەوا گوێی لەدایکی نەگرتووە و ڕێزی نەگرتووە، ئەو دوای ئەم یاسایانە دەکەوێت، چونکە دایکی خۆشدەوێت ویاساکانی جێگیرن و ناگۆڕێن و گونجاون لەگەڵ تەمەن و بارودۆخیدا، بەڵام دایک هەمیشە چەند یاسایەک دەهێڵێتەوە تا بیسەپێنێت بەسەر کوڕەکانیدا، ئیتر تەمەن و پێگەی هەرچیەک بێت، ئەو یاسایانەش ئامانە دەگرێتەوە: ڕێزی بگرێت_خۆشی بوێت بە بێ هیچ مەرجێک _بیپارێزێت و دابینکەری ئەو ژنە بێت کەژیانی پێبەخشیوە _و هەرگیز دەستبەرداری ئەم داواکاری و بنەمایانە نابێت، و ئەگەر کوڕەکەی کەسێکی بەرپرسیار و خۆشەویست و بەئاگا بوو، ئەوا هەرگیز ئەم یاسایانە ناشکێنێت.

دوای ئـــەوەی پیاوێک ژنێک دەدۆزێـــتـەوە و یەکیان خۆشدەوێت، دەبێت بـەڕادەیـەک خۆشی بوێت کەئامادەبێت هەندێک یاسا و بنەما بۆ پەیوەندییەکەتان دابنێیت، کەگرنگترینیان ئەمانەن:

١_پێویستە ڕێزم بگرێت.

٢_پێویستە لەدوای خوداوە من و منداڵەکانمان لەسەروو هەموو کەسێکەوە بین.

٣_دەبێت هەموو خزم و کەسوکار بزان کەدەبێت ڕێزی پەیوەندییەکەمان و خودی خۆم بگرن.

ئەگەر ئەم یاسایانەت دیاری نەکرد، ئەوا دایکی دەستبەرداری یاساکانی خۆی نابێت و سەرت نەسوڕمێت کە بەڕووتی لەجێگەکەدا بەجێت بهێڵێت و بڕوات کیک بۆ دایکی دروست بکات؟

وە ئەمە ناگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەدایکی جڵەوی کردووە؛ بەڵکو لەبەرئەوەیە کەتۆ هەوڵت نەداوە کۆنتڕۆڵ بگریتە دەست. بیر لەقسەی ئەو ژنە بکەرەوە کە وتی: «ئایا من هاوسەرگیریم لەگەڵ پیاوێک کردووە یان کوڕێک؟›› ئەو ژنە وتی: کە››ماوەی ١٥ ساڵ و نیو پەیوەندی لەگەڵ ئەو پیاوەدا هەبووە و هەرگیز ڕۆژێک بێزاری خۆی دەرنەبڕیوە، کاتێک خەسوی تەلەفۆنی کردووە و ئیشی پێی بووە››، وتی کە «ماوەی چەندین ساڵە ئەمەم لە دڵمدا هێشتوتەوە››. ئەگەر هەرگیز ژنەکەی بەپیاوەکەی نەوتبێت کەحەز ناکات خۆی و منداڵەکان بەجێ بهێڵێت و بچێت بۆ ماڵی دایکی، حەزیش بەوە ناکات وەکو منداڵ فەرمانی بەسەردا بکات، و حەزیش ناکات خواردنی بۆ ئامادەبکات و ماڵەکەی بۆ ڕەنگ بکات، و جلەکانی ببات بۆ جلشۆر، پێویستە پیاوەکەی بەتەواوی بزانێت کە تێکەڵبون و کارلێککردنی لەگەڵ دایکی سەرپێچی کردنە لەیاسا و بنەماکانی ژنەکەی، پیاوان ناتوانن مێشکت بخوێننەوە، و نازانن بەتەواوی چیت لێیان دەوێت، کەواتە تۆ پێویستە قسە بکەی کەچیت دەوێت.

ئەو ژنەی پرسیاری «ئایا من هاوسەرگیریم لەگەڵ پیاوێک کردووە یان کوڕێک؟›› کرد، لەنامەکەدا نەی وتبوو، بەڵام من پێم وابوو کەڕەتی کردۆتەوە دەربارەی خەسووی قسە بکات، کەچۆن جڵەوی گرتوتە دەست. چونکە لەوە ترساوە کەلەوانەیە مێردەکەی جێی بهێڵێت و ترساوە کە مێردەکەی

دایکی هەڵبژێرێت ئەگەر داوای لێ بکات لەنێوان ئەو و دایکیدا هەڵبژاردن بکات، لەگەڵ ئەوەشدا پیاوان بەمشێوەیە ڕەفتار ناکەن: ئەگەر پیاوەکەت بەڕاستی خۆشی بوێت ڕێگا چارەیەک دەدۆزێتەوە تادایکی قبووڵی بکات کەدەیەوێت ژنەکەی دڵخۆش بکات و ڕێگاکەی پاک دەکاتەوە، تا پەیوەندییەکەیان لەهەموو ڕوویەکەوە سەرکەوتووبێت.

یەکەم، دانی پێدابنێ کەناتەوێ بەرهەڵستی ئەو ژنە (دایکی) بکەی، چونکە ئەو دایبییەکانی گۆڕیوە کاتێک منداڵ بووە، و دەشزانێت ئەو خواردنە لێبنێت کەخۆشترین خواردنە لای مێردەکەت، وە زۆربەی هاوڕێکانی دەناسێت ئەگەر هەمووشیان نەناسێت، و لەهەموو کەسێکی تر زیاتر دەیناسێت و خوێنی ئەو بەدەمارەکانیدا تێپەڕ دەبێت، ئەگەر ئەو دایکی خۆشدەوێت و پەیوەندیان زۆر باشە، ئەوا تۆ ناچیتە نێوانیانەوە، بەڕاستی تۆ بۆت دەردەکەوێت کەباشترە پەیوەندیت لەگەڵ پیاوێکدا هەبێت کەدایکی خۆشدەوێت، وەک ئەوەی لەپەیوەندیدابێت لەگەڵ کەسێک کەبەرگەی ئەو کەسە ناگرێت کە هێناوێتیە سەر دونیا، پیاوێک ئەگەر نەتوانێت لەسادەترین پەیوەندی کەپەیوەندی نێوان پیاو ودایکیەتی، لەوانەشە نەتوانرێت پەیوەندییەکی خۆشەویستی جێگیری لەگەڵ کەسێکدا پێ بسپێردرێت، چونکە ئەو پیاوەی دایکی خۆشدەوێت و ڕێزی دەگرێت، دەشزانێت کەچۆن ڕەفتار لەگەڵ تۆدا بکات.

بەڵام تۆ بەدڵنیاییەوە دەتوانیت هەڵسوکەوت لەگەڵ مێردەکەت و دایکیدا بکەیت، لەڕێگەی بەکارهێنانی هێزتەوە، بۆ دانانی ئەو پێداویستی و بنەما و یاسایانەی کەپێویستە پابەندی بێت، چونکە هەردووکتان هەوڵی درووستکردنی خێزان دەدەن،

لەجیاتی نوسینی نامەیەکی توڕەیی بۆ «نامەکانی ستڕۆبێری›› لەنیوەی شەودا، کاتێک پیاوەکەی بێ خشپە (بێدەنگ) لەماڵەوە چۆتە دەرەوە تا یارمەتی دایکی بدات، ئەو ژنەی کەدەڵێت «ئایا من هاوسەرگیریم لەگەڵ پیاوێک کردووە یان کوڕێک « پێویست بوو مێردەکەی لەنیوەی دەرگاکەدە بوەستێنێت ۆ شتێکی لەم شێوەی پێبڵێت: «سەیرکە دەزانم دایکت خۆشدەوێت و هەموو شتێکی بۆ دەکەیت، بەڵام قبولی ناکەم من و منداڵەکان بەتەنها لەنیوەی شەودا بەجێ بهێڵیت، تا بڕۆی کیک بۆ دایکت درووست بکەی، بەڵام گەر هەر سوری لەسەر ئەوەی بڕۆی ئەوا دەبێت شەوەکەش هەر لەوێ بەسەر ببەیت و لەوێ بمێنیتەوە››.

ئەم قسانە شەڕەنگێزانە و تێنەگەشتوانە نین، لەبەرئەوەی تۆ ژن و منداڵەکان بەجێ دەهێڵیت لەماڵەوە لەکاتژمێر چارەک بۆ دوانزەی شەودا، تەنها لەبەر ئامادەکردنی کێک یان لەبەر ڕۆشتن بۆ یانەی شەوانەیەک، ئەمە مایەی قبوڵ نییە، ئەگەر ئەو ژنە وابیر بکاتەوە کە ئەمە شەڕانگێزی و تێنەگەشتوویە، ئەوا هەڵە بیر دەکاتەوە. بەڵام ئەگەر بەپیاوەکە بڵێت ئەوا ئەوکات ئەو(ژن) بنەما و ڕێسای داناوە کە پێویستە پیاوەکەی پێوەی پابەندبێت تاپەیوەندییەکەیان بەردەوام بێت، ئەوکات تۆپەکە لەیاریگای ئەو دایە، یان ئەوەتا دەچێت و کێک بۆ دایکی ئامادە دەکات، یان وەکو پیاو پەیوەندی پێوەدەکات و بەڕاستەوخۆیی پێی دەڵێت: ئەمشەو ناتوانم بێم ــــ بەڵام دەتوانم بەیانی هەندێک کیکی ئامادە کراوت بۆ بکڕم و بۆت بهێنم پێش ئەوەی بڕۆم بۆ کار، لەوانەیە دایکی پێی خۆش نەبێت ــ بەڵام بەتۆ چی؟ جارێکی تر ناتوانی کۆنترۆڵی ئەوە بکەیت کەهەستی چۆنە

دەربارەی کارەکانی کوڕەکەی؟ وە ناشتوانیت کۆنترۆڵی کارەکانی کوڕەکەی بکەیت، بەڵام دەتوانیت کۆنترۆڵی ئەوە بکەیت کەهەستت چۆنە و چاوەڕێی چی لەمێردەکەت دەکەیت.

ئێستا ئەو ژنە وتی «ئایا من هاوسەرگیریم لەگەڵ پیاوێک کردووە یان کوڕێک›› ماوەی نزیکەی ١١ ساڵ چاوەڕوانی کرد، تا قسەی دڵی خۆی بکات، بەڵام ئەگەر تۆ ئێستا لەپەیوەندیدای لەگەڵ پیاوێک پێویستە لەسەرت ئەم شتە بەئاشکرایی بخەیتە ڕوو، پێی بڵی کەهەرگیز ناتەوێت بچیتە نێوان ئەو و دایکی، و ناتەوێ ڕکابەری لەگەڵ دایکی بکەیت، لەبەرئەوە ئەو پێویستە لەسەری ئەوە بکات کەپێویستە، تاوەکو دایکی تێبگات:

١_پێویستییەکانی ژنەکەی هەرگیز لەپلەی دووەمدا نابێت، لەژێر هەر هەلومەرجێکدا بێت.

٢_دایکی پێویستە ڕێزی پێویستی کوڕەکەی بگرێت، کەلەسەری پێویستە و دەبێت دابینکەر و پارێزەری ئەو ژنە بێت کەخۆشیدەوێت.

نیگەران مەبە، ئەو ئەرکی خۆی دەزانێت، تا ئەمکارە بکات: چونکە هیچ پیاوێک لەجیهاندا نیە کەزیاتر پێویستی بەدایکی بێت وەک لەژنەکەی، ئەو زۆر بەباشی هەست بەوە دەکات کەئەو پاڵپشتیانەی کە لەدایکیەوە دەستی دەکەوت، وەکو جلوبەرگ و شوێنی ژیان___پەروەردە_گرنگی پێدان و تا کۆتایی....، پێویستە کۆتاییان پێبهێنێت، کەبوو بەپیاوێکی گەورە و بەتایبەتیش ئەگەر ویستی پەیوەندییەکی خۆشەویستی و ڕاستگۆیانە و هەمیشەیی دروست بکات لەگەڵ ژنێکی تر، جگە لە دایکی، و لەسەری پێویستە پەتی نێوان خۆی دایکی بپچڕێنێت تاوەکو بتوانێت ژیان بەخێزانێکی نوێ ببەخشێت کەئەویش خێزانەکەی خۆیەتی.

هەموو ئەوەی لەسەر تۆ پێویستە ئەوەیە کە قسە بکەیت: ڕاستەوخۆ پێی بڵێ: من لێرە پێویستم پێتە، تا بمان پارێزێت، دابینکەرمان بیت و ژیانمان پارێزراو بێت، و یارمەتیم بدەیت لە بەخێوکردنی ئەم منداڵانەدا، و نمونەیەک بیت بۆ کوڕەکانمان تابزانێت پیاوی ڕاستەقینە چی دەکات؟ و بۆ کچەکەت، تابزانێت پیاوی ڕاستەقینە چۆنە، تاڕۆژێک لەڕۆژان کەسێک بۆ خۆی بدۆزیتەوە، من ئەوەم لێت دەوێت کەسەرۆکایەتی خێزانەکە بکەیت.

بەم شێوەیە بۆی ڕونبکەرەوە و پێی بڵێ، ئەوکات هەموو کات داواکاریەکانی تۆ لەسەر و داواکاریەکانی دایکیەوە دەبێت.



## _٨_
# بۆچی پیاوان خیانەت دەکەن؟

لەڕوانگەی پیاوانەوە، وەڵامی پرسیاری «بۆچی پیاوان خیانەت دەکەن؟» زۆر ڕوون و ئاشکرایە، بەڵام لەوانەیە لای ژنان زۆر ڕوون نەبێت. گرنگ نیە هۆکاری خیانەتەکە چەند گونجاو وماقول بێت، چونکە پیاوان دەزانن کەهەرچەند ڕوونی بکەینەوە ژنان هەرگیز ناڵێن: ئۆو تێگەشتم، هیچ وشەیەکی تەواوەتی نیە و هیچ نارەزایەتیەکی بڕوا پێکەر نیە، کەڕوونی بکاتەوە بەشێوەیەک، زۆربەی ژنان لێی تێبگەن، بێگومان وەکو ئەوە وایە کەوەڵامەکان بۆ پرسیارێکی ملیۆن دۆلاری هاوشێوەبن لەگەڵ وەڵامەکانی دە دۆلاری، کێ مشتومڕی وا دەکات؟ لای زۆربەی ژنان خیانەت کارێکی باوەڕپێنەکراوە، «یەکەم شەرمەزاریە»، کە لێخۆشبوونی نیە، ئێوە تێناگەن و ناشتوانن تێبگەن هۆکاری ناپاکی کردنی پیاوان چییە، وە هەرگیز ڕێگەی پێنادەن، تۆ وادەزانیت کەپێت وت خۆشمدەوێیت، کات و لاشەو مێشکی خۆتت پێبەخشی و گواستەوە بۆماڵەکەی ئەو، خەرجیەکانت لەگەڵی بەش کرد و جلەکانت بۆ شۆرد و خواردنت

بۆ ئامادە کرد، و منالّت بۆ خستەوە و وتت»ڕازیم» لەبەردەم دادوەرو هەمووانداا، کاتێک پرسیاری لێ کردی دەتەوێت ببیت بە هاوسەری، ئەوکات کەمترین شت کەپیاوەکەت بتوانێت بیکات ئەوەیە کە ڕێزی پیرۆزترین شتی تۆ بگرێت، ئەویش ــ پەیمانی دڵسۆزیەــ، پیاو دەتوانێت جارجار درۆ بکات، کاروبارەکانی ماڵەوە و پەروەردەکردنی منداڵەکان پشتگوێ بخات، ڕەزیلی بکات لەخەرجیەکانی ماڵەوەدا، گرنگی زیاتر بەکوڕەکانی و خەسوت بدات وەک لە تۆ، ڕابکات لە ئەرکەکانی وەک مێردێک، دەتوانێت هەموو ئەمانە بکات.

بەڵام کاتێک ژنەکەی خیانەتی لێدەکات ئەگەر هەموو جیهانیش بڵێت ئەو هەر باوەڕ ناکات.

ئەوە ڕێگەی منە تا بڵێم ژنانیش بەهەمان شێوەن، بەرگەی زۆر شت دەگرن، جگە لەخیانەت.

ئێمەی پیاوان لەوە تێدەگەین، دەزانین ئەم ئامۆژگارییە چی دەگەیێنێت، وە دەتوانین ئەو زیانانە بژمێرین کەکەسێک پێی دەگات کاتێک خیانەت دەکات، وە دەشزانین کەبەدەستهێنانی لێخۆشبوونی ئەو ژنەی کە خیانەتمان لێ کردووە و بەدەستهێنانی لێخۆشبوونی دایکی و هاوڕێکانی، یان هەرکەسێکی تر کەدڵسۆزیەتی لەم ڕاستیە ڕوخێنەرەی ژیانی کەبەسەری هاتووە، ڕەنجێکی زۆر و بەدەسەڵاتی دەوێت.

## لەگەڵ زانینی ئەمەشدا هەر خیانەت دەکەین بۆچی؟

من لێرە نیم تا پاساو بۆ خیانەتکردنی پیاوان بهێنمەوە: من هەوڵێکی ڕوون دەدەم تا ئەوە ڕونبکەمەوە کەبۆچی

پیاوان بەدوای شتێکدا دەگەڕێن و لەشوێنێکی دیکە بەدەستی دەهێنن، و ڕونکردنەوەی ئەو شتانەی کەدەتوانیت بیکەیت، ناهەلی خیانەتکردن بەرامبەرت کەم بکەیتەوە. کەواتە بابڕۆین و بچینە ناو بابەتەکەوە، کەپیاوان خیانەت دەکەن لەبەر......

## ئەوان دەتوانن:

هەرچییەک دەڵێی بیڵێ، بەڵام تێڕوانینی پیاوان بۆ سێکس جیاوازە لە تێڕوانینی ژنان بەڕوونی و بەسادەیی، لای زۆربەتان، سێکس بەبەشێک لە عاتفە دەزانن_واتە بەشێک لەخۆشەویستی، لەوە تێدەگەین و ڕەچاوی ئەوە دەکەین کەئەمە ڕەفتارێکی ڕەها و سروشتی ئێوەیە: پێویستە پاڵ بکەویت و ڕێگە بدەیت تەنێکی بێگانە بێتە لەشتەوە، تۆ بەدرێژایی ژیانت وا فێرکراویت کەئەم ساتە زۆر سۆزدارییەت لەگەڵ کەسێک ئەنجام بدەیت کەبەڕاستی لات بەنرخە و کەسێکی گرنگە لەژیانتدا.

وە بەپێچەوانەوە، کاتێک بابەتەکە دێتە سەر پیاوان، سێکس نەهەست و سۆزبوون دەبێت، نە چوونە ژوورەوەی پێویست و هاوسەنگ مانای دەبێت، ئەوە ئاسانە_زۆریش ئاسانە بۆ پیاو کەسێکس بکات و بڕواتەوە بۆ ماڵەوە، و خۆی بشوات و وارەفتار بکات کەهیچ ڕووی نەداوە، سێکس لەوانەیە لای ئێمە تەنها کارێکی سروشتی پوخت بێت _هیچ پەیوەندییەکی بە خۆشەویستیەوە نیە.

سەیری «نامەکانی سترۆبێری» ئەم جارە بکە، کەلەلایەن ژنێکەوە نێردراوە بەخۆی دەگووت «نیگەران» :

((بە درێژای گفتوگۆکردنم لەگەڵ مێردەکەم بۆ ماوەی ٢٠

سال، پرسیارم لیکرد: ئایا بەڕاستی بەس بووە بۆی کەتەنها سیکس لەگەڵ من بکات؟ زۆر دوودڵ بوو پێش ئەوەی وەڵام بداتەوە، هەر وەکو ئەوەی کە پێشبینیم دەکرد کەدەڵێت «نەخێر»، دوای ئەوە ویستی بۆم ڕونبکاتەوە کەمنی خۆشدەوێت و هیچ شتێک ناکات کەمن ئازار بدات، بەڵام ئەگەر ڕێگەی پێبدەم سێکس لەگەڵ ژنانی دیکەدا بکات، بەبێ ئەوەی پەیوەندیان هەبێت، ئەوا دەیکات، وتی کە چۆتە تەمەنەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا پیاوێکی چالاک و هەست بزوێنە لەڕووی جنسیەوە، و گرنگی پێدانی لەلایەن ژنێکی دیکەی گەنجەوە یارمەتیدەرو هاندەرە تازیاتر خۆی لاپەسەند بێت، دواتر پرسیاری لیکردم و وتی: ئەگەر ڕێگەم پێ بدەی سێکس لەگەڵ ژنانی دیکەدا بکەم، ئەوا بەڵێن دەدات کەپێیان بڵێت تەنها گرنگی بەسێکس دەدات، نەک پەیوەندی دانان، وە پێشی ووتم ئامادەیە وەڵامی هەموو پرسیارەکانم بداتەوە دەربارەی چاوپێکەوتنەکانی و ئەگەر نەمویست پێم ناڵێت کەچی ڕوویداوە و کەی ڕووی داوە، ئاشکرایە کەکێشەی هەیە لەگەڵ هاوسەرگیری تاک،»ژن هێنان یەکجار بەدرێژایی تەمەن» ئایا پێویستە ڕازی بم تاوەکو بەنهێنی و شاراوەیی ئەو کارە نەکات؟ چی بکەم تا بیرکردنەوەی بگۆڕێت))؟

## وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەی کۆتایی لەم نامەیەدا زۆری ناوێت.

پیاوەکە ژنەکەی خۆشدەوێت، لەگەڵ ماڵ و منداڵەکەی و ئەو ژیانەی کە بنیاتیان نابوو، پەیوەندییەکی سۆزداری ناوازەی هەیە لەگەڵ ژنەکەی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندی لەگەڵ ژنانی دیکە دادەنێت بەبێ ئەوەی یەک چرکە بیربکاتەوە، چونکە پەیوەندی لەگەڵ ژنانی دیکە هیچ شتێک ناگەیێنێت لای، ئەو شتێکە کەلەوانەیە لەڕووی جەستەییەوە هەستێکی خۆشی پێببەخشێت، بەڵام لەڕووی سۆزدارییەوە دڵی لای ژنەکەیەتی و خۆشی دەوێت و دابینکەر و پارێزەریەتی.

ئێستا، ئەم زانیاریانە لەڕوانگەی ئەو پیاوە بەتواناوە وەربگرە کە ژنێکی هەیە، کارێکی شکۆدار و خوازراوی هەیە، من بانگەشەی ئەوە ناکەم کەبزانن چی ڕوودەدات لەپشتی دەرگاکانەوە لەم جۆرە خێزانەدا، بەڵام بەپێی بۆچوونەکان بەگشتی ژن و مێردەکە وادیارن کەدڵخۆشن و پاڵپشتی یەکترن، بەڵام ژنەکە بەهۆی کارەکەیەوە ناچارە گەشت بکات و کارو بارەکانی ماڵەوە بەمێردەکەی بسپێرێت کەگرنگی بەمنداڵەکان بدات و، ژنەکەی بەردەوام کاردەکات، بەبێ پچڕان بۆماوەی چەند هەفتەیەک، بەبێ ئەوەی پەیوەندییەکی تەلەفۆنی دوورودرێژی خۆش لەگەڵ مێردەکەیدا بکات، تاوەکو کەمێک یارمەتی بدات، تابەرگەی ئەو ماوە دورودرێژە بگرێت کەدەبێت بەسەری ببات بەبێ سێکس، بڕوام پێبکە کاتێک دەڵێم: لەژێر ئەم بارودۆخەدا زۆر ئاسان دەبێت کەبیکەن بەبیانوو، تا لەشوێنێکی تر ئەوەی دەیانەوێت دەستیان بکەوێت، چونکە نە ئەو نە هیچ پیاوێکی تر

ناتوانێت ماوەیەکی درێژ بەبێ سێکس بمێنێتەوە، لەبەرئەوە نییە کەژنەکەی خۆشناوێت، بەڵکو ئەمە کێشەکەیە ئەو دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە بەشەکەتی، دوای ڕۆژێکی قورسی کارکردن و خواردن ئامادە دەکات و گەیاندنی منداڵەکان بۆ قوتابخانە و چالاکیەکانی دوای قوتابخانە، و پێداچوونەوەی ئەرکەکانی ماڵەوەیان، ئەو پیاوێکی ڕەنجدەرە، و زۆربەی ئێمەی پیاوان گوێ لەوەدەگرین کە مێشکمان پێمان دەڵێت: من دەڕۆم بۆ ئەو شوێنەو وا لەو ژنە دەکەم کە نیگەرانییەکانم برەوێنێتەوە، و دواتر دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوەو خواردن بۆ منداڵەکان ئامادە دەکەم و هاتوچۆیان پێدەکەم و کاردەکەم هەتا ئەو ژنەی خۆشمدەوێت دەگەڕێتەوە، لەوانەیە ئەوە بۆ تۆ بێ بەزەیی دیاربێت، بەڵام لای پیاوشتێکی ماقولەو ڕێی تێدەچێت، ئەو هەوڵدەدات بەجۆرێک لەجۆرەکان هەست بەباشی بکات لەبەرئەوە هەوڵدەدات لە شوێنێکی تر سێکسی دەستبکەوێت، ئەگەر نەیتوانی لەتۆ دەستی بکەوێت.

تۆ ئەمە بەخیانەت دادەنێی، بەڵام پیاو تەنها بەڕێگەیەکی دەزانێت پشوو بدات بەتایبەت ئەگەر......

## پیاوان پێیان وایە کەدەتوانن لەسزاکەی دەرباز بن.

بێگومان، پیاو ڕەچاوی مەترسی خیانەتکردن لە ژنەکەی دەکات، بەڵکو زۆربەی کات پیاو پەیوەندی سۆزداری دادەنێت و دڵنیایە کەدەتوانێت لێی دەرباز بێت وپێیان وایە کە حاشاکردن و خۆ بێ بەریکردن لێی یارمەتیان دەدات کاتێک ژنەکانیان پێی زانی، من ڕاهاتووم نوکتە لەم بارەیەوە بکەم کەپیاوانم هاندەدا درۆکانیان بخەنەگەڕ تاوەکو دەرباز بن. پێم دەوتن: «من

بەلامەوە گرنگ نیە ئەگەر کەسێک وێنەی سمتی منی گرتبێت ولەلایەکی وێنەکەوە ژمارەی نهێنی کۆمەڵایەتی منی لەسەربێت، چونکە من بە ژنەکەم دەڵێم: «ئەوە من نیم»___من نازانم ئەو پیاوە کێیە هەمان ژمارەی نهێنی کۆمەڵایەتی منی هەیە و هەمان پێڵاوی منی لەپێدایە، بەڵام «من نیم».

ئا ئەوە نوکتەکەمە، بەڵام زۆرێک لەپیاوان وەک شتێکی پێکەنیناوی سەیری بابەتەکە ناکەن، بە دڵنیاییەوە ئەو پیاوەی خیانەت لە هاوسەرەکەی دەکات لێکدانەوەی بۆ ئەو زیانانە کردووە کەپێی دەگات، کاتێک خیانەتەکەی ئاشکرا دەبێت___ لەوانەیە ژن و منداڵەکان و ماڵەکەی لەدەست بدات ___ دەزانێت لەوانەیە زەبرێکی وێرانکەر بێت بۆ هەموو ئەو شتانەی کە لەژیانیدا گرنگن، ئێمە لەوانەیە زۆربەمان ئەم وتەیەمان بیستبێت کەدەڵێت: «تووڕەیی دۆزەخ هیچ نیە لە چاو تووڕەیی ژندا»،«Hell hath no fury a woman scorned»، پیاوان لەئێوە باشتر لەمانای ئەمە تێدەگەن، ئێمە دەزانین کەدۆزەخ هات ڕووبەڕووی ڕسواییەکی زۆر دەبینەوە ئەگەر ژنەکەمان بۆی دەرکەوت خیانەتمان کردووە، و سەرەڕای ئەوەش پیاوان پێیان وایە کەژنەکانیان ناتوانن بیانگرن، لەبنەڕەتدا پێمان وایە کەئێمە لێهاتووین و هەوڵی تەواوەتی دەدەین تاخیانەتەکەمان بشارینەوە، هەمیشە لەمێشکی خۆماندا وا بیر دەکەینەوە ئەگەر تۆ نەیزانیت، ئەوا ئازار و خەم ناخۆیت، وەئێمە زۆر دڵنیاین کەئامادەی بۆ بنیادنانی پەیوەندی لەگەڵ ئێمە، هەموو ئەو کارانە پوچەڵدەکاتەوە کە گوماناوی و دیارن___لەبەرئەوەی، ئەوەی بەلاتەوە گرنگە ئەوەیە کە لەگەڵ ئێمە بێت بە کەم و کوڕیەکانمانەوە وەک لەوەی بەجێمان بهێڵێت و بەتەنها بێت.

بەلایەنی کەمەوە هیواداریین کەوابیت، و لەسەرەتادا بەزۆری تو ئەو کارە دەکەیت، بەلام لەوکاتەی کە گومانەکان بەرەو جۆریک لە یاسای و شیوازی لیکولینەوەو پشکنین دەچیت، ئەوکات درو دەکەین و نکولی لیدەکەین، بەم شیوەیە دەکەین ئەگەر تومان لا گرنگ بیت.

بەلام ئەگەر وانەبوو ـو پیاوەکە بەبەشیک لەپلانەکانی ژیانی سەیری نەکردی، ئەوکات خۆی ماندوو ناکات بەشاردنەوەی خیانەتەکەی. زۆر بەسادەیی پیت دەلیت کەلەگەل ژنیکی دیکەدا خەوتووە، چونکە.....

## نابێت بەو پیاوەی کە خۆی دەیەوێت وپێویستە ببێت، هەتا ئەو ژنە نەدۆزێتەوە کە بەڕاستی دەیەوێت.

لەوانەیە پێت وابێت ئەم قسەیە بۆ خۆدزینەوە بێت، بەڵام ئەمە ڕاستیە، دەگەڕێتەوە سەر ئەوەی کەپیاوان بە چ شێوازێک لەخۆیان و ئەوانی دیکە دەڕوانن، سەرەتا پێم ووتی و لەچەند شوێنێکی تری پەرتوکەکەدا دووبارەم کردۆتەوە، کە سێ شت نازناوی پیاو دیاری دەکەن « کێ یە؟، چی دەکات؟ ، چەند پەیدا دەکات؟ « وە ئەگەر نەگەشتین بەو پێگەی کە دەمانەوێت، ئەوکات ئامادە نابین لەوە تێبگەین کەچۆن لەگەڵ یەک ژندا جێگیر ببین و ڕازی بێت بەپلانەکانمان، تا ببینە پیاوێکی سەربەخۆ و کارامە و باش و دەوڵەمەند. مەبەستم ئەوەیە چەندجار بیستوتانە کە دووبارە بە بەردەوامی پیاوێک وتوویەتی « کاتێک بووم بە خاوەنی پارە، ئەوکات بیر لەبەستنی پەیوەندی دەکەمەوە» یان «با سەرەتا پلەم بەرز بکرێتەوە، دواتر بیر لەجێگیر بوون

دەکەمەوە».

ئەو پیاوە هێشتا دەیەوێت ببێت بەکەسێکی تەواو، وە کاتێک کار بۆ بەدیهێنانی ئەوە دەکات، خۆی نابەستێتەوە بە دروستکردنی پەیوەندییەوە، و بەسادەیی بەخۆی دەڵێت کاتی تەواوی بۆ پەیوەندی نییە، و یەکێک نییە لە پێویستییە لەپێشینەکانی و، بەم شێوەیە خۆی بەڕێ دەکات.

لەوانەیە هەمان شت ڕاست بێت بۆ پیاوێک کە ژن و منداڵی هەیە و پیاوێکی پێگەیشتووە، و دەزانێت کە کێ یە و دڵخۆش و ڕازییە لە کارەکەی و ئەوەی دەستی دەکەوێت بەلایەنی کەمەوە ژیانی بە شێوەیەکی ڕێک و پێک ڕێکخراوە، چونکە بووە بەو پیاوەی کەخۆی ویستوویەتی ببێت، و پێویستیە لەپێشینەکانی ڕێکخستووە کەئەمانەن: خودا، خێزانەکەی، پەروەردە، کارکردن. و دواتر هەموو شتەکانی تر.

بەڵام ئەگەر خێزان لەدووەمدا نەبوایە، کێشە دەبوو، چونکە ئەو خۆی تەرخان دەکات تاوەکو پێویستیە پێشینەکانی لەشوێنی خۆیدابن و بەو شێوەیەی کەدەیەوێت، تەنانەت ئەگەر پێشتریش بڵێ «بەڵێ» و منداڵەکانی لەباوەش گرت و هەموو کارێکی کرد کەپیاو پێویستە بیکات، تا بیانپارێزێت و دابینکەریان بێت، بەڵام کاتێک بڕیاریدا ئارەزووەکانی خۆی تێر بکات و ژنان ڕاو بکات و بەپێشینەی زانی بۆ خۆی، ئەوکات پابەند نابێت بەپەیمانی وەفادارییەوە بۆت، و لای تۆ باسی ئەو بابەتە ناکات و هەموو هەوڵێک دەدات تاپەیوەندی نێوانتان بپارێزێت، لەگەڵ ئەوەی هەندێک شتی لابەلا دەکات، بەڵام پەیوەندی بە تۆوە نیە.

هاوڕێیەکی سەرکەوتووم هەیە کەپارەیەکی زۆری هەیە و خێزانێکی جوان ــ واتە ژیانێکی نمونەیی هەیە، ئێوارەیەک

ژیان، وە شتی دواتر کەپیاو درکی پێدەکات، ئەوە کە ژنەکەی پێشتر ڕاهاتبوو هەندێک پۆشاک و هەندێک شت بکات تاوەکو پەیوەندیەکەیان بەگەرم و گوڕی بهێڵێتەوە، بەڵام ئێستا چیتر گرنگی بەو شتە سادانە نادات کەڕاهاتبوو پێش هاوسەرگیری بیانکات، بگرە لەڕاستیدا سێکس لای بووە بەشتێکی وەڕسکەر، لە کارەکەی دەگەڕێتەوە لەگەڵ ئەوەی تەنورەیەکی کورتی جوانی لەبەردایە، لەگەڵ پێلاوێکی پاژنە بەرز، وە ئارایشت و ئەم جۆرە شتانە، خەریکە گیانی دەردەچێت هەتا دەگاتە دەرگاکە و، ئێستا دوای ڕۆژێکی درێژ لەکارکردن و تەنانەت پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆماڵەوە کاری زیادەشی کردووە، دواتر دەگەڕێتەوە و دەچێتە جێگاکەیەوە و بەپارچە پەڕۆیەک سەری دەبەستێت و تیشێرتێکی سادە لەبەردەکات، وە ئەگەر بەجۆرێک سەیری بکەی کەدەتەوێت سێکسی لەگەڵدا بکەی، ئامادەیە بڕیاری لەسێدارەدانت دەربکات.

بە دەربڕینێکی تر، ژیان لەماڵەکەدا ناخۆش و دووبارە بوو، ئەو پیاوە جۆش و خرۆشەکەی پێشتری لەدەستداوە کە لەماڵەکەدا بوو، و تۆ گۆڕاویت (و دەزانێت ئەویش گۆڕاوە)، بەڵام ئێمە دەربارەی ئەو قسەناکەین، بەڵکو دەربارەی تۆ قسە دەکەین.

لەوانەیە ئەویش هاوڕابێت لەگەڵت و هەست بکات کەتۆ چیتر پێی سەرسام نیت وەکو جاران، وشەکانی «سوپاس» کەم دەبێتەوە لە نێوانتاندا، مشتومڕی زۆر لەنێوانتاندا ڕوودەدات، وەکو ئەوەی ئاژاوە بەیانی لەگەڵتاندا هەڵبسێت، شەو لەگەڵتان بخەوێتەوە، و ماڵەوە وەکو ئەوە نەماوە کەلەسەری ڕێکەوتبوون کاتی هاوسەرگیری.

ئەگەر پیاو نەیتوانی لەماڵەوە ئەوەی دەستبکەوێت کەلەسەری ڕێکەوتبوو، بە ئەگەری زۆرەوە دەڕواتە دەرەوەو لەشوێنێکی دیکە دەیدۆزێتەوە، ئەزانی بۆ؟

چونکە دەزانێت هەمیشە دەتوانێت لەشوێنێکی دیکە بیدۆزێتەوە، بەتایبەتی ئەگەر......

گەورەترین هۆکار لەسەرو هەموویانەوە: هەمیشە ژنێک هەیە کە هاوبەشی خیانەتەکەی بێت.

ئەمە ڕاستیەکە کەهیچ ژنێک نایەوێت گوێبیستی ببێت، بیهێنە بەر چاوی خۆت کەهەموو ژنێک پێی بڵێت: «تۆ هاوسەرگیریت کردووە__من ناتوانم ئەم کارەت لەگەڵ بکەم» ئایا دەزانیت نائەمڕۆ چەند هاوسەرگیری و پەیوەندی بونی هەیە؟ پیاوان دەتوانن خیانەت بکەن، چونکە ژمارەیەکی زۆری ژن هەیە کەخۆیان پێشکەشی پیاو دەکەن لە کاتێکدا پیاوی ئەوان نین، بێگومان بەئێستاش و داهاتووشەوە ژنانێک هەن کە فریو دەدرێن و نازانن ئەو پیاوەی لەبەردەمیاندایە مێردی ژنێکی دیکەیە. بەڵام لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا بۆی دەردەکەوێت لەگەڵ پیاوێکی ژنداردا خەوتووە، بەڵێ ئەمانە ئەو ژنانەن کەهیچ بنەما و ڕێسایەکیان نیە، کێشەیەکی جدیان هەیە لەگەڵ ڕێزداری خودیدا، و ئامادەیی خۆیان نیشان دەدەن بۆ خیانەتکردن ودواتر ڕەخساندنی هەلێک تاخۆیان خیانەتیان لێ بکرێت.

ئەگەر ئەم ژنانە خۆیان لەبازنەی خیانەت بهێننە دەرەوە، ئەوکات ڕێژەی ڕوودانی خیانەتکردن بەشێوەیەکی بەرچاو دادەبەزێت.

وە بۆ هاتنە دەرەوە لەبازنەی خیانەت، پێویستە بەتەواوەتی ئەوە بکەیت کەمن فێرت دەکەم لەم کتێبەدا، بنەماو دواکاریەکانت

دیاری بکەو ڕوونیان بکەرەوە و بەشی ٩شی پێوە بلکێنە (بۆی زیاد بکە) و پیاو بەباشی بناسەو هەڵی بسەنگێنە لەڕێی کردنی ٥ پرسیاری بنەڕەتی بۆ بەرەوپێشچونی پەیوەندیەکەت،(سەیری بەشی ١٠ بکە) دواتر پابەند بە بە یاسای ژمارە ٩٠وە (سەیری بەشی ١١ بکە)و دوای ئەوە هەموو ئەمانە فێری کچەکەشت بکە، بەڵام ئەگەر نەمانتوانی دوای هەموو ئەم شتانە ئەم بازنەی خیانەتە بشکێنین، زۆر بەداخەوە خیانەت بەردەوام دەبێت.

کەواتە خانمان ئەو هۆکارانەی باسم کردن، هۆکارە سەرەکیەکانی خیانەت کردنی پیاوانن.

بەڵام بڕوا بکە، هۆکاری زیاتر و زیاتر هەن کەپیاوان بەدوای دەگەڕێن تا بیکەن بەبیانووی هەڵەکانیان، وە ئەم هۆکارانە لەپیاوێکەوە بۆ پیاوێکی تر یان لەژنێکەوە بۆ ژنێکی تر دەگۆڕێن، ئەوەی گرنگە لێرەدا لێی تێبگەیت، ئەوەیە بێ گوێدانە هۆکارەکانی پیاو، پیاو ئەوە دەزانێت کە تۆ دەیزانیت، ئەوە ستەمە پەیوەندی لەگەڵ کەسێک پێک بهێنیت و بەڵێن بدەی وەفادار بیت و دوای ئەوە دژی ئەوە ڕەفتار بکەیت و بەڵێنەکەت بشکێنیت، بەتایبەتی کەئەمە یەکێک بووبێت لە دواکاریەکانی هاوبەشەکەت، ژنان دەتوانن بەبەردەوامی دووبارە و دووبارە بیر لەبابەتەکە بکەنەوە و جۆرەها کەموکوڕی و هەڵە لە خۆیاندا بدۆزنەوە ــ»من بەشێوەیەکی دروست ئەو کارەم نەکرد»، «من بەپێی پێویست باش نەبووم»، «من بەوشێوەی پێویست بوو خۆشم نەویست»، «ئەو ژنە لەمن باشتر بوو»ــ بەڵام هەمیشە ڕاستیەکە وەک خۆی دەمێنێتەوە و هیچ لەمانە پەیوەندی بەهۆکاری خیانەتەکەوە نیە، کەواتە ژنان دەبێت لۆمەی خۆیان بکەن لەجیاتی پیاوانی خیانەتکار ــ تەنها لەبەر خۆتان ئەم

کارە بکەن، چونکە هەڵگرتنی ئەم بارە لەوانەیە جوڵانەوەکانتان ئیفلیج بکات و لەپەلتان بخات و ڕێگریتان لێبکات لەجێبەجێکردنی ڕووبەڕووبونەوەی دواترتاندا. چونکە بەسادەیی تۆ ناتوانیت بەرەو پێش بچیت، ئەگەر تۆ بیرت لەلای ئەوە بێت چی ڕوو دەدات لەئاوێنەی پشتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، دەتوانیت سنورێک دابنێیت بۆ هەموو ئەو جارانەی کە مێردەکەت خیانەتت لێ دەکات.

دەتوانیت ئەم کارە بکەی لەڕێگەی بەرز کردنەوەی ئاستی داواکارییەکانت. سەیرکە، تۆ هێزێکی زۆرت هەیە، ئاسنورێک بۆ ئەو شتانە دابنێیت کەبەسەرت دێن_تۆ هێزی قایل کردنت هەیە_ هێزی دانایت هەیە_ هێزی پێشنیار کردنت هەیە، خاوەنی بنەمایت، یارمەتیت دەدات پارێزراو بیت، ئەگەر ڕاستەوخۆ بەپیاوەکەت ووت کەبەرگەی هەموو شتێک دەگریت بێجگە لەخیانەت، ئەوکات بەڕوونی تێدەگات ئەگەر هەنگاوی نا بەسەر یەکگرتوویی هاوسەرگیریەکەیاندا ئەوا لە دەرەوەی ئەو یەکگرتووییە دەمێنێتەوە، ئەگەر پەیمانی شکاند و خیانەتی کرد؟ دەبێت تۆ ئامادەیی ئەوەت تیابێت کەجێی بهێڵیت و وازی لێ بهێنیت، تۆ نابێت خیانەتی مێردەکەتت بۆ دەربکەوێت و ڕووبەڕووی بکەیتەوە و لەگەڵ ئەوەش هەر لەگەڵی بمێنیتەوە، تا چاودێری هەنگاوەکانی بکەیت و بەردەوام سەرزەنشتی بکەیت کە چی دەکات، چونکە زۆر بەڕوونی ئەمە واتای ئەوەیە کەتۆ هەرگیز نەتبەخشیوە، بارودۆخێکی وەهای بۆ ڕێکدەخەیت کەدووبارە خیانەت بکاتەوە.

یان دەبێت وازی لێبهێنیت، یان دەبێت ڕێگایەک بدۆزیتەوە تا لەناخی دڵتەوە لێی خۆشبیت و کار بکەیت تا بەرەو پێشبچن.

هەندێک کات، پێویستە پیاو شتێک لە دەستبدات، یان هەستبکات خەریکە لەدەستی دەدات، تاوەکو نرخی بزانێت. بەڵام ئایا ئەوە هەموو کەسێک دەگرێتەوە؟ هەندێک پیاو خیانەت دەکەن، چونکە دەزانن کە سزاکەی وەرناگرن، بەڵام ئەگەر ئەو پیاوەی خیانەتی لێکردی بینی کە تۆ لەدەرگاکە دەڕۆیتە دەرەوە و گرنگیت بۆی، دڵنیابە لەوکاتەدا لە ساتە هەرە لاوازەکانیدایە و وانەی خۆی وەردەگرێت.

ئەگەر بیەوێت بتگەڕێنێتەوە دەبێ خۆی ڕاست بکاتەوە و بێتەوە هۆش خۆی، چونکە خەریکە ژن و خێزانەکەی لەدەست دەدات، ئەمە ئەوە دەگەیێنێت کەئەو هەموو شتێک دەکات تۆ بیلێیت، تا دووبارە بگەڕێیتەوە بۆ لای، وە کاردەکات بۆ بەدەستهێنانەوەی متمانەت_و مەرجەکانت جێ بەجێ دەکات. ئەگەر پێویستی کرد زوو بێتەوە بۆماڵەوە یان پەیوەندی بکات کاتێک دوابکەوێت، گوڵ بنێرێت بۆت هەموو هەفتەیەک، و دایەنێک بدۆزێتەوە بۆ منداڵەکان بۆئەوەی شەوانە پێکەوە بڕۆنە دەرەوە، یەکشەمان لەگەڵت بێت بۆ کڵێسە، تەنانەت جلەکانیش هەڵبخات و هەموو ئەمانە ئەکات تا بۆت بسەلمێنێت کەگۆڕاوە. کاتێک سزا بوونی هەبوو، ناچارە زۆر لەخۆی بکات و بڵێ «خەریک بوو هەموو ئەو شتانە لەدەست بدەم کە لەژیانمدا خۆشم ویستوون›› وە ئەوەی بەسەری هات دەیکات بە پیاو.

ئایا ئەمە ئاسانە کە بیبەخشیت و گومانی لێ نەکەیت؟

نەخێر، بەڵام لەکۆتایدا متمانەی تۆ بەدەست دەهێنێتەوە و ئامادەیە کارت لەگەڵ بکات، تا کێشەکە چارەسەر بکەن، وە بەدڵنیاییەوە بەدڵی نابێت پرسیاری لێبکەیت لەکوێ بووە، و ڕقی لەو ڕاستیە دەبێتەوە کە ناتوانێت بەسۆزەوە ڕەفتارت

لەگەڵ بکات، لەکاتێکدا تۆ هەوڵدەدەیت تورەی خۆت جڵەوگیر بکەیت، زۆر دوو دڵ دەبێت کە لەگەڵت بێت بۆلای پزیشکی دەروونی، لەگەڵ ئەوەی لەناخی دڵەوە دەزانێت کەئەمە بەشێکە لەکارەکەی تاوەکو دڵت بەدەست بهێنێتەوە. دەزانێت کەئەو هۆکاری ئەمەیە_وە دەزانێت کە چی کردووە و لەئاکام و سەرەنجامە خراپەکەی باش تێدەگات باشتر لەوەی کەتۆ پێت وایە. ئێمە لەسزاکان تێدەگەین و دەشزانین دەکەوینە دۆزەخەوە، بڕوا بکە من زۆرباش دەزانم، چونکە خۆم بەسەرم هاتووە و بەسەر زۆربەی پیاوانیشدا دێت. ناتوانیت پیاوێکی دەوڵەمەند بیت و خیانەت نەکەی، من پیاوێک ناناسم کەخاوەنی پارە بێت و خیانەتی نەکردبێت، وە لەوانەیە پیاوێکی وا بوونی هەبێت، بەڵام من تائێستا چاوم پێی نەکەوتووە، بێجگە لەوە پیاوانێک دەناسم کەخاوەنی پارەن و کەچی ڕاهاتوون کاری باش بکەن و بڕۆنەوە بۆ ماڵەوە و گرنگی بەخێزانەکەیان بدەن، لەکۆتایدا هەر یەکێکیان ئامادە دەبن ئەو کارە بکەن. منیش ئێستا ئامادەم وابکەم، چونکە ئێستا دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە، چونکە لەسەرم پێویستە وابکەم و دەزانی چی؟ من زۆرێک لەو پیاوانە دەناسم لەهونەرمەند و یاریزان و جێبەجێ کار و تا دواتر___کە بوون بەباشترین مێرد و باوک لەجیهاندا. لەبەرئەوەی بەرپرسیارێتییەکانیان بەشێوەیەکی گونجاو ڕێکخستووە، خودا، خێزان، دواتر کار، ئەی چی دەربارەی ژنەکانیان؟ ژنەکانیشیان بوون بەباشترین ژن لەڕێگەی هەوڵدانیان بۆ دروستکردنی کەسێکی ئەفسوناوی، کە لەسەرەتای پەیوەندیەکەدا دەیانکرد. ژن دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە و پێڵاوە بەرزەکانی دانەکەنێت و پچرپێنێت بە گوێی مێردەکەیدا، پێی بڵێ لەژووری نوستنەکە دەتبینمەوە تاوەکو

ژەمێکی سوک پێکەوە بخۆین پێش نانی ئێوارە، یان دەتوانێت کەمێک پێبکەنێت و وا ڕەفتار بکات کەدڵی خۆشە و کەمێک بە ئەرمونیانی ڕەفتار بکات و کەمێک بەمێردەکەیدا هەڵبدات.

وە بەدڵنیاییەوە ئەمە چیرۆکی یەکێک لەهاوڕێ باشەکانمە، کەژنەکەی بۆی دەرکەوتبوو لەگەڵ ژنێکی تر خیانەتی لێدەکات جێی هێشتبوو و ڕۆشتبۆیەوە ماڵی باوکی و کوڕەکەشی لەگەڵ خۆی بردبوو بۆ ماوەی ٧ مانگ، پیاوەکەی زۆر کڵۆڵ و خەمبار بوو و کێشی لەدەستداو لاواز بوو، ئێمە دەچوین بۆلای و پێمان دەوت؛ «با برۆینە دەرەوەو کاتێکی خۆش بەسەر بەریت» کەچی ئەو پێی دەوتین:»ئێ، من نامەوێت بێمە دەرەوە»، و پێشنیاری ئەوەمان بۆ دەکرد کەبچێت چاوی بەژنەکەی بکەوێت، کە دەچوو بۆ لای تاکەمێک حاڵی باشتر بێت، بەلام ئەو ڕەتی دەکردەوە بچێت و بەتوڕەییەوە دەیوت: «من تیاچووم، هاوسەرگیریەکەم لەناو چوو، کوڕەکەم ڕۆشت و ئەوکەسانەی بۆم گرنگ بوون جێیان هێشتم، من دەمەوێت بگەڕێتەوە».

ساڵ و نیوێکی پێچوو تا ژنەکەی بهێنێتەوە، من نازانم چی ڕوودەدات لـەدوای دەرگـاکـەیـانـەوە، بـەڵام شتێکت پێ دەڵێم: ئێستا ژنەکەی مێردێکی نموونەیی هەیە، و هەر پیاوێکی خێزاندار دەتوانێت پەند لەمەوە وەربگرێت ،بەڵام پێش ئەوە دەبێت دوو شتی بەسەر بێت: دەبێت بزانێت کە چ شتێک بۆی گرنگە، چ هەستێکە کە لەدەستی بدەیت، دووەم دەبێت فێر ببێت کەبەرپرسیارە لەپێشینەکانی ڕێک بخات. یەکەم خودا دواتر خێزانەکەی.

ئەزانی چی؟ ئێستا هەموو شەوێک دێتەوە ماڵەوە و پارە

پەیدا دەکات و ژیانێکی خۆشی هەیە، خێزانەکەی نیگەرانی هیچ
نین، و گوێم لێ بوو ژنەکەی دەیوت: «پیاوە تازەکەم شتێکی
ترە»

وە ئێستا ئەوان بۆ ماوەی ٣٣ ساڵە بەدڵخۆشی دەژین
پێکەوە، ئەو پیاوێکی نمونەیی و مەزنە___و ژنەکەشی خانمێکی
بە بەختە.



# بەشی ٣
# پەرتووکی یارییەکان
# چۆن یارییەکە ببەیتەوە



## _٩_
## پیاوان ڕێزی بنەماکان دەگرن:

هەندێک شت هەیە دەبێت بیزانیت دەربارەی هاوسەرەکەم (ماجوری). ژنێکی لێهاتوو پاڵپشتە، لەناخەوە زۆر جوانە، هەروەک چۆن لەدەرەوە جوانە، خودای خۆش دەوێت و دایکێکی مەزنە بۆ منداڵەکانمان ـــو شۆخ و شەنگ و زیرەکە، گرنگیم پێدەدات و ڕێزم دەگرێت و زۆری خۆش دەوێم.

وە دەبێت بشزانی ژنەکەم کۆمەڵێک بنەما و یاسای تایبەت بەخۆی هەبوو، کەمن هەر لەیەکەم بینینمانەوە زانیم و ڕێزم لێگرتن. چیرۆکەکە ئەوکاتە دەستی پێکرد کەبەرنامەم پێشکەش دەکرد لە(مەمفیس)، ماجوری لەگەڵ ژنێکی سەرنجڕاکێشیی دیکەدا هاتە ژوورەوە، نەمتوانی خۆم بگرم لەناوەڕاستی نووکتە کردندا بووم ووتم: «بەیارمەتی، دەزانم تۆ من ناناسیت، بەڵام ڕۆژێک لەڕۆژان هاوسەرگیریت لەگەڵ دەکەم››. پێکەنی و ووتی: «تۆ من ناناسیت››، لەگەڵ ئەوەی من گرنگ نەبوو بەلامەوە و قسەی دڵی خۆمم پێ ووت و دەمزانی کەڕۆژێک لەڕۆژان هاوسەرگیری لەگەڵ دەکەم (بە دڵنیاییەوە ئەوە لەهیوایەک

زیاتر بوو، دڵنیا بووم لێی---پێبکەنە)

لەوانەیە ئەویش زانیبێتی، یان بەلایەنی کەمەوە ئەوەی بەدڵ بوو کە بینی، چونکە لەگەڵ ئەوەی ئەو شەوە کەپلانی خۆمم پێ ووت و دیار نەما، بەڵام دوای دوو شەو دەرکەوتەوە لەیەکێک لەبەرنامەکانمدا، ئەو کاتە داوام لێکرد تا بێتە پشت کامێرا (کوالیس) و کەمێک قسە بکەین و ئەویش ڕازی بوو، دواتر بووین بەهاوڕێی ئازیزی یەکتری، و بۆ ماوەیەکی دیاری نەکراو ژوانمان بەست، و لەکۆتایدا هەریەکەمان بەڕێگای خۆیدا ڕۆیشت، هێشتا من و مارجوری ئەو هاوڕێیەتیەمان لەیادە کە کۆیکردینەوە و جارجاریش هەواڵی یەکترمان دەپرسی،و دوای ماوەیەک، من و مارجوری دووبارە پەیوەندیمان درووستکردەوە و ژوانمان دانا، شتەکە بوو بەجدی، چونکە دەمزانی کەهەلێکی باشمان لەدەستدا تا پەیوەندی ببەستین، لەبەرئەوە نەماندەویست جارێکی دیکە سەرکێشی بکەین، و لەگەڵ ئەوەی دەمزانی من ئەو ژنەم خۆشدەوێت و ئەویش منی خۆشدەوێت، کەچی هێشتا من پەیوەندیم لەگەڵ هەندێک لەژنە هاوڕێکانمدا هەبوو، کە لەدوای جیابوونەوەکەیان ناسیبوونم، و کاتێک بەڕاستی دەستم کردووە بە ژوان دانان بۆ جاری دووەم.

جارێکیان مارجوری سەردانی کردم و هات بۆ ماڵەکەم، لەشەوێک لە پشووی ڕۆژی ڤالانتاین دا، یەکێک لەو هاوڕێیانەم پەیوەندی پێوەکردم، منیش زۆر درێژەم پێنەدا و_ پێم ووت: «سلاو، دواتر قسە دەکەینەوە و هەرکاتێک کەگەڕامەوە بۆ شار دێم و دەتبینم››، دواتر دامخستەوە، پێم وانەبوو کە مارجوری گوێی لێ بوو بێت _لەکۆتایدا بەو شێوەیە ڕەفتاری نەدەکرد کەگوێی لێ بوبێت، بەڵام ئەبێت ئاماژە بە بەشێک

بکەم، کە ئەو هەستێکی باشی بیستنی( دایک )ی هەیە و هیچ شتێکی لەدەست دەرناچێت، و بێگومان کاتێک شەو هەستام و ڕۆشتم بۆ گەرماوەکە__ نزیکی ۳:۰۰ ی شەو بوو__ماجۆری لە ڕاڕەوەکەدا وەستا بوو، چاکەتە فەرۆکەی لەبەردا بوو، و جانتای سەفەرەکەی بەدەستەوە بوو، و بەتەمابوو کە جێم بهێڵێت_ئێمە جێبهێڵێت.

پێم گووت: «بۆ کوێ دەڕۆی؟›› و وەڵامدانەوەکەی لەو ساتەدا و لەو شوێنەدا لەناوەڕاستی ڕاڕەوەکەدا، وای لێکردم کە بۆم دەربکەوێت ئەو خانمە گونجاوەکەیە، و زۆر بە واقیعی «بێ پێچ و پەنا›› وەڵامی دایەوە و جانتاکەشی هەر بەدەستەوە بوو، وتی: من نابم بە یاری دەستی هیچ کەسێک و خۆم بەکەسدا هەڵناواسم›› ، «و پێم وانیە تۆ ئامادە بیت بۆ ئەوەی کەمن دەمەوێت››. « من ئەو منداڵانەم هەیە و ژیانێکی نایاب دەژیم، و پیاوێکم دەوێت کەخێزانەکەم تەواو بکات. و ئەگەر تۆش هەمان شتت دەوێت، ئەوا لە(مەمفیس) چاوەڕێت دەکەم››.

دوای ئەوەی دەمم هەڵپچڕی، داوام لێکرد کەهەلێکی ترم بداتێ، و جانتاکەم لێسەند و خێرا تەلەفۆنەکەمم دۆزییەوە و کردم بە دوو پارچەوە، من جارێک لەدەستم دابوو، نەمدەویست جارێکی دیکە لە دەستی بدەمەوە__ئەو ژنێکی جوان و زیرەک و شیرین بوو__وە هیچ ژنێک ناتوانێت وەک ئەو میهرەبان و تایبەتمەند بێت بۆ من و منداڵەکانم، من لەو کاتە و لەو شوێنەو ڕێک لەو ڕاڕەوەدا بۆم دەرکەوت کە بێجگە لەو هیچ کەسێکی ترم ناوێت.

بەجۆرێکی تر، من بووم بەو پیاوەی کەئەو دەیویست بیم، چونکە هۆشی تەواوەتی هەبوو، تا بنەما و داواکارییەکانی

دیاری بکات، کەدەیویست لەپەیوەندیەکەیدا تاوەکو پەیوەندیەکی سەرکەوتووی هەبێت و دەیزانی کە هاوسەرگیریەکی تاکی دەوێت «یەک جار هاوسەرگیری لەتەمەندا» (Monogamous) واتا پیاوێکی دەوێت کە هاوسەرێک و باوکێکی تایبەتمەند بێت و دەیویست پیاوەکەی باوەڕدار بێت و خودای خۆش بوێت، وە ئامادەبێت هەرچی پێویست بوو بیکات تا خێزانەکە پێکەوە بمێنیتەوە، ئاماژەشی بەوەکرد کەچاوەڕێی ئەوە لەمن دەکات، هەمیشە وەکە خانمێک ڕەفتاری لەگەڵ بکەم ـــ مەبەستم ئەوەیە دەرگای ئۆتۆمبێلەکەی بۆ بکەمەوە، و کورسیەکەی بۆ بجوڵێنم کاتێک لەسەر مێزەکە دانیشت، وە دیاری بۆ بکڕم لەیادی لە دایکبوونی و ڕۆژی دایکاندا، قسەی ناشرینی پێنەڵێم، وە ئەم داواکاری و بنەمایانە بەلایەوە گرنگن، چونکە ئەمانە شێوازی مامەڵکردن لەگەڵیدا دیاری دەکات، ئەمانە بۆ منیش گرنگن، چونکە ئەمە نەخشەیەکی گریمانەیی بۆمن دادەنێت، بۆ هەموو ئەو شتانەی کەپێویستە بیکەم، تا دڵنیابم ئەوەی دەیەوێت و پێویستی پێیەتی دەستی دەکەوێت، لەسەروو هەموویەوە هەموو دنیا دەزانێت کەدایک دڵخۆش بوو هەمووان دڵخۆش دەبن، لەبەرئەوە من دڵنیام کەئەرکی من لەژیاندا ئەوەیە کە ماجوری دڵخۆش بێت. پیاوان ناتوانن ئەم ئەرکە بەجێ بهێنن بۆت، بەبێ یارمەتی تۆ، بەهەرحاڵ ئێمە ناتوانین پێوانەی ئەو شتانە بکەین کە ژن پێویستیەتی و دەیەوێت، لەبەرئەوەی پێویستی و داواکاریەکان لە ژنێکەوە بۆ ژنێکی تر دەگۆڕێت، وەکو گۆڕان لەشارێکەوە بۆ شارێکی تر.

پیاوان زۆر سادەن و کەسانی لۆژیکین، ئەگەر تۆ وتت کە حەزت لەچیە و حەزت لەچی نیە، ئەوکات ئێمە هەموو

شتێک دەکەین تا لەئاستی پێشبینیەکانت بین، بەتایبەتی ئەگەر بەتەما بووین پەیوەندیت لەگەڵ دابنێین. (ئاگاداربە لەیەکەم چاوپێکەوتنتاندا هەموو ئەو شتانەی پێ بڵێ کەحەزت لێیەتی، لەبەشی دواتردا هۆکارەکەیت پێ دەڵێم).

بەڵام بەڕاستی، ئێمە وا دروست نەکراوین تا بزانین حەزەکانت چین. بەڕاستی دڵخۆش دەبین کاتێک داواکاریەکانت دەخەیتە ڕوو. ئێمە دەمانەوێت پێشتر ئەو کارە بکەیت، تا ئێمەش بڕیار بدەین کەئایا ئامادەین بۆ ڕکابەری کردن یان نا. دوای دوو هەفتە یان دوو مانگ یان دوو ساڵ و دانانی پەیوەندی، دەبێت هاوسەرگیری ڕووبدات.

وە داواکاریەکانت لەبەرچاو دەگرێت، مادەم تۆ دیاریان دەکەیت و لەسەر مێزەکە دانیشتویت و ئەو خواردنەوە قۆخە دەخۆیتەوە کە بەیەکەوە کڕیتان، چونکە تۆ ئێستا نەخشە ڕێگاکەت پێداوین کەچۆن ڕەفتارت لەگەڵ بکەین، بەتایبەتی ئەگەر بەلامانەوە گرنگ بێت پەیوەندیت لەگەڵ دابنێین.

بەڵام لەوە تێبگە کەئەم بەشە بۆ ئەوە نیە کەتۆ لیستی داواکاریەکانت بەم ڕستانە دەست پێ بکەیت: «من ناتوانم»، و» نامەوێ»، و باشترە.......نەکەیت» کە کاتێک پیاوێکی باش لێت نزیک بۆیەوە.

ئێمە حەزمان لەجۆرێک لە لێهاتوییە، پێویستە تۆ بەکارامەیی و لێزانانە ڕەفتار لەگەڵ دۆخـەکـەدا بکەیت، داواکاریەکانت بە پیاودکە بڵێ، بەبێ ئـەوەی واهەست بکات کەتۆ لیستێک لەداواکاری دەخەیتە بەردەمی. شتەکە کەوتۆتەوە سەر ئەوەی کەتۆ چۆن پەیامەکە دەگەیەنیت، ئەوا تۆ داواکاریەکانت لەجێی خۆیدا بوو لەکاتی گفتوگۆکەدا، ئەوکات جێ بەجێ بوونیان

ئاسانە، و ئەگەر بەزمانێکی نەرم و نیان داواکاریەکانت داواکرد، بۆ ئەویش ئاسانتر دەبێت کە لێیان تێبگات، و گرنگتر لەوەش جێبەجێی دەکات، بیر بکەرەوە چۆن شێت دەبێت ئەگەر تۆ پەنجەت بەڕوویدا بەرزبکەیتەوە و دەم و چاو بدەیت بەیەکدا و بڵێی:»بەرگەی پیاوێک ناگرم کە لەڕۆڵم وەک دایک تێنەگات و ئەگەر تۆ کیشەت لەگەڵ منداڵەکانم و باقی خێزانەکەم هەیە ئەوا کیشەت لەگەڵ مندا هەیە« وەکو ئەوە وایە کە لەباشترین باردا بە دەرزی بیروشێنیت، کە تۆ تورەیت، یان خراپتر، وا دەزانێت شێتیت و خێزانەکەشت بەشێت دەزانێت.

بەڵام وا دابنێ کە کاردانەوەی چۆن دەبێت ئەگەر بە ڕووخۆشیەوە بڵێی: «ئۆو، دەزانی من منالّم هەیە و ئەوان هەموو شتێکن بۆ من و پلە یەکن لە ژیانمدا، چونکە خێزانەکەم وا پەروەردەیان کردووم کە لەگرنگی خێزان تێبگەم» وە ئیستا دەزانێت کەتۆ یەکێکیت لە کچە باشەکان و شیرینەکان و هەڵگری بەرپرسیاریتیت و ڕووناکی خێزانەکەیت. ئەگەر لەو جۆرە پیاوانە نەبوو، ئەوا دەڕوات بۆ لای ژنی دواتر، کە هیچ داواکاریەکی نیە و سەرشۆڕ دەکات بۆ هەموو شتێک، بەڵام ئەگەر پیاوێک بوو بڕوای بەگرنگی خێزان هەبوو، بەردەوام دەبێت لە وتووێژ کردن لەگەڵت وگوێگرتن بۆ داواکاری و خەرجیەکانت.

بگرە ئەمە کۆمەڵێک نمونەیە کە دەتدەمێ تا بزانیت چۆن داواکاریەکانت ومەرجەکانت بپێچیتەوە بەکاغەزی ڕەنگاو ڕەنگ.

لەجیاتی وتنی» ناتوانم بەرگە بگرم»، کاتێک پیاوەکە دردنگ کەوت، شتێکی لەم شێوەیە بڵێ: هەمووان سەرقاڵن لەم ڕۆژانەدا__بەڵام کات بەنرخە وانیە؟ من هەموو هەوڵی

خۆم دەدەم کە لەکاتی دیاریکراودا ئامادە بم، ئەگەر پێم بڵێیت کاتژمێر ۷:۰۰ی ئێوارە ئامادە بە، ئەگەر زووتر ئامادە نەبم ئەوا ۷:۰۰ ئامادە دەبم، لەبەرئەوە دەتوانین ئەوە بکەین کە دەبێت بیکەین لەکاتی دیاریکراودا، و ئەگەر دوا بکەوم هەوڵدەدەم پەیوەندیت پێوە بکەم بۆ پۆزش هێنانەوە.

وەرگێڕان، تۆ ئێستا پێت وت کەدواکاریت لەو پیاوەی کە لەژیانتایە ئەوەیە لەکاتی خۆیدا ئامادە بێت، کە دەڵێت ئامادە دەبم و ئەگەر خاوەنی ڕەفتاری باش و تەواوەتی بێت، ئەو پەوەندیت پێوە دەکات، ئەگەر دواکەوت. ئێستا دەزانێت ئەگەر چەند خولەکێک زووتر بەڕێکەوت دەتوانێت لەکاتی دیاریکراودا ئامادە بێت، و دڵنیا دەبێتەوە کە مۆبایلەکەی شەحنی تەواوەتی تێدابێت تا کاتێک دواکەوت پەیوەندیت پێوەبکات و پێت بڵێت.

لەجیاتی وتنی»ئەگەر دڵداری لەگەڵ ژنێکی تر دەکەیت و دەخەویت ئەوا من گونجاو نیم بۆت»، شتێکی لەم شێوەیە بڵێ» من ڕاستگۆم لەگەڵ ئەو پیاوەی پەیوەندی لەگەڵ دادەنێم و ئەگەر هەستمکرد بێجگە لەو پەیوەندیم لەگەڵ کەسانی تردا هەیە ئەو کات پێی دەڵێم تا بڕیار بدات کەئایا دەیەوێت پەیوەندیەکە بەردەوام بێت یان داوام لێبکات تەنها پەیوەندیم لەگەڵ ئەودا هەبێت».

وەرگێڕان، تۆ ئێستا پێت وت، داواکاری لەو پیاوەی لەژیانتدایە کە ڕاستگۆ و ڕاشکاو بێت دەربارەی دیاریکردنی پەیوەندی نێوانتان ___و ئەگەر مەبەستی یاریکردن بێت، دەبێت پێت بڵێت تاوەکو تۆش بتوانیت بەزیرەکی و هۆشداری بڕیار بدەیت کەچۆن مامەڵە لەگەڵ ئەم دۆخەدا بکەیت. و تۆ پێشت وتووە کەئەمە پێویستی بە وتووێژ هەیە___تا هەردووکتان

پێکەوە بڕیار بدەن چیتان لە پەیوەندیەکەتان دەوێت لە جیاتی ئەوەی داواکاریەکانتی بەسەردا بسەپێنیت.

لەجیاتی ئەوەی بڵێیت «ئەگەر پیاوەکەم بڕوای بە خواو مەسیح نەبێت، کەواتە پێویست ناکات قسەی لەگەڵ بکەم».

دەتوانیت شتێکی لەم شێوەیە بڵێیت «یەکشەمە خۆشترین ڕۆژی هەفتەیە لای من، چونکە دەچم بۆ کڵێساو هاوەڵی ئەو کەسانە دەکەم کە هاوڕان لەئاینەکەمدا، و کاتێک ئەم خزمەتکردنی ئاینیە تەواو دەکەم زۆر هەست بەباشی دەکەم و دەزانم ڕۆژەکانی تریش بەشێوەیەکی نایاب تێدەپەڕن لەهەفتەکەدا.

وەرگێڕان، تۆ ڕوونت کردەوە کەژنێکی لە خواترسیت، خواناس و باوەڕداریت، هەلێکت بۆ ڕەخساند تا بیر بکاتەوەو باسی هەستەکانی بکات لەبارەی بابەتە ڕۆحیەکانەوە.

لەجیاتی ئەوەی بڵێیت «من سێ منالم هەیە و دوو کار دەکەم، چونکە باوکی ئەم منداڵانە تەنانەت شایەنی نەفرەت لیکردنیش نیە و بەخێویان ناکات، لەبەر ئەوە هەرپیاوێک هەوڵدەدات لەمن نزیک بێتەوە، باشترە پارەی تەواوەتی هەبێت، تا منداڵی بۆ بەخێو بکرێت، ئەگینا دەرگاکە کراوەیە».

شتێکی لەم شێوەیە بڵێ »بوون بە دایکێکی باش زۆر گرنگە بۆ من، و بەشێک لەبوون بە دایکێکی باش ئەوەیە کە دڵنیابم منداڵەکانم باوکێکی باشیان هەیە، من مرۆڤێکی سەربەخۆم و باوەڕم بە خۆمە، بەڵام هەست دەکەم کە چەند باشتر دەبێت بۆ من و خێزانەکەم ئەگەر پیاوێکی باش لەژیانماندا هەبێت».

وەرگێڕان، تۆ ڕوونت کردەوە کە لەگەڵ ئەوەی توانای ئەوەت هەیە ئاگات لە منداڵەکان بێت، بەڵام دەشزانی کە گرنگە

پیاوێک لە خێزانەکەتاندا هەبێت___ ئەمە وا لەپیاو دەکات
ئامادەبێت تێبگات کە تۆ ڕێزی دەگریت وەکو هاوسەرێک و
یارێکی باش. هەموو پیاوێک ئەمەی دەوێت___کە ڕێزی
لێبگیرێت لە ئێستا و لە داهاتووش.

ئێستا تێگەشتیت؟ ئێستا ئەوەم پێدایت کە بیری لێدەکەینەوە.
ئەمانە زانیاری بەسوودن دەربارەی ژنێک کە ئارەزووی
دەکەین، بەڵام لەوە گرنگتر تۆ مەرجەکانی خۆشت پێ ووتین،
لە ڕێگەی کردنی زۆرێک لە قسەی جوان و مانادارەوە کەوەکو
شروبی کۆکەیە بەتامی تریێ: لەگەڵ ئەوەی دەرمانە بەڵام
تامێکی خۆشی هەیە کە قوتی دەدەی.

ئێستا پێویستە ئەمە زیاد بکەم بۆ قسەکانم، مادام پیاوان
ڕێز لەو کارەی ژنان دەگرن کەبەڕاست و ڕەوانی داواکاری و
مەرجەکانیان دەڵێن، لە پەیوەندیەکەیاندا، من بڕوای تەواوەتیم
هەیە کەپێویستە ژنان جار بە جار هەنگاوێک بکێشنە دواوە
تا پیاوان خۆیانت بۆ بسەلمێنن، (خۆیانت پیشان بدەن)___بۆ
نموونە بیسەلمێنیت کە شایەنی ئەوەیە کاتەکانی خۆتی پێ
بیەخشیت.

من پێم وایە گەورەترین هەڵە کە ژن دەیکات لەسەرەتای
پەیوەندیدا ئەوەیە کە وردەکاری هەموو ئەو شتانە دەخاتە ڕوو
حەزی لێیەتی پیاو بۆی بکات، بەبێ ئەوەی هەلێک بەو پیاوە بدات
کەنیشانی بدات ئارەزووی چی دەکات کە بۆت بکات، مەبەستم
ئەوەیە، ڕاستە، ئەوە جوانە کە ئێوە حەز دەکەن لە کەناری
دەریادا پیاسە بکەن، و حەزتان لەخواردنی شوکلاتەیە لە ڕۆژی
ڤالانتاین دا، وە حەزت لە سەوسەن و(زەنبەق)ە لە وەرزی
هاویندا، بەڵام چۆن دەتوانیت بزانیت کە ئەو پیاوە داهێنەرە یا

بە جۆش و خرۆشە یان کەسێکی ئاڵۆزە، ئەگەر تۆ نەخشەی چۆنیەتی کێشانی پێکەنین لەسەر ڕووخسارت دابنێیت بۆی و پێی بدەیت بەبێ ئەوەی داوای لێ بکەیت خۆی بیدۆزێتەوە؟ دڵنیابە کە تۆ: ئەگەر بە پیاوەکەت ووت حەزت لەگوڵی سورە لەسەر کارەکەت، وە حەزت لەخواردنی ژەمی ئێوارەیە لەڕێستورانتێکی ناوازە، وە حەزت لە وەرگرتنی جانتایەکی چانێلە لەڕۆژی لە دایکبونتدا، ئەویش بەتەواوەتی ئەوەت بۆ دەکات ــــ بەبێ زیاد و کەم، و تۆ لەوانەیە لە سەرەتادا دڵخۆش بیت بەوە ــــ بەڵام دوای ٤٥ ڕۆژ دەبینیت دەوەستێت لە کردنی ئەو کارە، چونکە پێی وایە ئەوەی پێویستت بوو کردویەتی تا ئەوەی دەست بکەوێت کە دەیەوێت، وە تۆش پێتوایە گۆڕاوە، چونکە چیتر ئەو کارانەت بۆ ناکات و دەچیت بە کچە هاوڕێکەت دەڵێی: «نازانم چی بووە ــــ ئەو ڕاهاتبوو ئەو هەموو شتانە بکات کەمن حەزم لێی بوو››

ئەو هەموو ئەو شتانەی دەکرد کەتۆ حەزت لێی بوو، چونکە تۆ پێت وتبوو کەحەزت لەچیە.

فەلسەفەی من لەم بارەیەوە: لەجیاتی ئەوەی پێی بڵێیت کەحەزت لە چیە، پێی بڵێ کەحەز بەچی ناکەیت، دواتر کاردانەوەی دەبینیت: لێی گەڕێ با بگەڕێت و قوڵ بێتەوە و بیدۆزێتەوە، چۆن بگات بەتۆ. و تەشریف بفەرموو ئاشکرای بکە: بڵێ «من لەو جۆرە کەسانە نیم کە پشووی هەفتە لەماڵەوە بمێنمەوە›› یان « حەزم لەوجۆرە پیاوانە نیە کە وەکو خاتونێک ڕەفتارم لەگەڵ ناکەن›› یان « حەز ناکەم دووبارە و دووبارە بچم بۆ هەمان ڕێستۆرانت›› وە دوای پەرەسەندنی پەیوەندیەکەتان سەیری کاردانەوەکانی بکە چۆن

دەبێت، بەدڵنیاییەوە لەشێوازی هەڵسوکەوتکردنی تێدەگەیت__ و دەبینیت کە ئامادەیە خۆی بگونجێنێت، تۆ حەز ناکەیت بڕۆیت بۆ هەمان ڕێستورانت؟ دانەیەکی نوێ دەدۆزێتەوە و گرنگی پێوە دەدات کە بتبات بۆ ئەو شوێنانە، تۆ حەز ناکەیت لەماڵەوە دابنیشیت لەڕۆژانی پشوودا؟ ئەو هەوڵدەدات کە بتباتە دەرەوە بۆ کۆنسێرتێک، یان بتبات بۆ مۆزەخانەیەکی نوێ، یان بەلایەنی کەمەوە سەیری ڕۆژنامە دەکات تا ببینێت دەنگوباسی شار چییە، تا بیرۆکەیەک وەربگرێت بۆئەوەی شتێک پێکەوە ئەنجام بدەن، وە ئەگەر بزانێت تۆ ئەو کەسانەت خۆشناوێت کەخێزانیی نین؟ ئەو کات شت بۆ منداڵەکان دەکڕێت کە بیبینی، تەنانەت پێشنیاری ئەوەت بۆ دەکات کە تۆ و منداڵەکانیش ببات بۆ پیاسە بۆ پارک، تا منداڵەکان کەمێک یاری بکەن و سواری جۆلانە بن، هەرچەند پێشی وابێت کەچەند  نارەحەتە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش لەماڵی دایکت گۆشت دەبرژێنێت، چونکە دەزانێت کەتۆ پیاوێکت دەوێت لەگەڵ خێزانەکەیدا تێکەڵ بێت، ئاسودەبەو سەیری بکە: ئەگەر دەرگای ئۆتۆمبێلەکەی بۆ کردیتەوە، یان کورسیەکەی بۆ جوڵاندی کاتێک لەسەر مێزەکە دانیشتیت، یان مۆبایلەکەی کوژاندەوە کاتێک لەگەڵ تۆ بوو تاوەکو هەموو کاتەکە بۆ تۆ تەرخان بکات. بەڵام ئەگەر ئەم کارانەی بۆ نەکردیت___ ئامادەیی خۆی نیشان نەدا تا ڕێگایەک بدۆزێتەوە کەزەردەخەنە بخاتە سەر لێوەکانت___ئەو کاتە تۆ دەبێت بڕیار بدەی کەئایا ئەو دەتوانێت ئەوەت پێ ببەخشێت کەپێویستە یان بەلایەنی کەمەوە کەمێک لەو شتانەی دەتەوێت.

بێگومان، بۆ پێشکەشکردنی مەرج و داواکارییەکانت بۆ پیاو، وە دەرخستنی گرنگی پەیڕەوکردنی ئەم داواکاریانە، دەبێت

تۆ سەرەتا بەتەواوەتی بزانیت داواکاریەکانت چیە و دیاریان بکەیت. من کۆمەڵێک پرسیارم بۆ ئامادە کردوویت لێرەدا، تا بەچاوی سەرنج و تێرامانەوە سەیری بکەیت و لێی بڕوانیت و ١٥ داواکاری خۆت دیاری بکەیت لەڕێگەیانەوە، من لەژێر هەر پرسیارێکدا بۆشایم بۆ بەجێ هێشتوویت تا لیستەکەت پڕبکەیتەوە:

١_ ئەو پیاوەی بە دوایدا دەگەڕێیت چ تایبەتمەندیەکی تیا بێت؟ بۆ نموونە (هەزەلی؟ ، کۆڵنەدەر؟ ، بەخشندە؟)

........................................................................................
........................................................................................
........................................................................................
........................................................................................
........................................................................................
........................................................................................

٢_چاوەڕێ دەکەیت چۆن شوێنت بکەوێت؟ (ئایا دەتەوێت یەک لەدوای یەک پەیوەندیت پێوە بکات؟ یان نامەت بۆ بنێرێت؟ بەلایەنی کەمەوە ٣ جار لەهەفتەکەدا بچن بۆ ژوان؟ یان دەتەوێت بەردەوام دوات بکەوێت؟)

........................................................................................
........................................................................................
........................................................................................
........................................................................................

٣_تا چ ڕادەیەک هەڵگری بەرپرسیارێتی بێت؟ پەیوەندییەکی کراوەت لێی دەوێت؟ یان ژوانی سەردەمیانە؟ یان پێویست بکات

ڕتوریژی لەسەر بکەن؟

..............................................................................

..............................................................................

..............................................................................

..............................................................................

٤_دەتەویت لەڕووی مادییەوە چۆن بێت؟ (دەتەویت دەوڵەمەندبێت؟ یان دەتەوێت ئەو پارەت بۆ پەیدا بکات لەجیاتی ئەوەی خۆت پارە پەیدا بکەی؟ یان ئایا ڕازی دەبیت کریکاریی بکات؟)

..............................................................................

..............................................................................

..............................................................................

..............................................................................

٥_ئایا پیاوێکت دەوێت حەزی لەمنداڵ خستنەوە بێت و کەسیکی خێزانی بێت؟

..............................................................................

..............................................................................

..............................................................................

..............................................................................

٦_ئایا دەبێت کەسێکی باوەڕدارو دیندار بێت؟

..............................................................................

..............................................................................

..............................................................................

..............................................................................

٧-ئاساییە بەلاتەوە ئەگەر لەژنەکەی جیابووبێتەوە یان منداڵی هەبێت؟

..........................................................................

..........................................................................

..........................................................................

..........................................................................

٨_لە تواناتدا هەیە یارمەتی دەری بیت لەبەدیهێنانی خەونەکەیدا؟ ئایا دەتوانیت خۆت بگونجێنیت لەگەڵ پلانەکەیدا؟

..........................................................................

..........................................................................

..........................................................................

..........................................................................

٩_چاوەڕێ دەکەی خێزانەکەی چۆن بێت؟ (ئایا لەگەڵ دایکی تێکەڵ بیت؟ یان بەلاتەوە گرنگە ئەگەر گرنگی بەدایکی نەدات و زۆر تێکەڵی نەبێت؟ یان لەباوکییەوە نزیک نەبێت)

..........................................................................

..........................................................................

..........................................................................

..........................................................................

..........................................................................

١٠_ئارەزوو دەکەی چی بکات بۆت، تا لێت نزیک بێتەوە؟ (ئایا دەبێت دوات بکەوێت یان دیاری گرانبەهات بۆ بکڕێت)؟

..........................................................................

..........................................................................

..........................................................................



- ١٠ -

## پێنج پرسیار کەهەموو ژنێک پێویستە بیپرسێت، پێش ئەوەی پەیوەندیەکەی قوڵبێتەوە:

من ئێستا گەیشتووم بەشاری «هۆڵیود» و هێشتا لەتەمەنی ٣٨ساڵیمدام، ئەوەندەی لەم شارە شتم بینیوە بەدرێژایی تەمەنم نەمبینیوە، دیارترینیان شێوازی ژیانی ئەو پیاوە بەناوبانگ وبەڕێزەیە کەناوەکەی ناڵێم و لای خۆم دەیهێڵمەوە، بەڵام تەنها ئەوە بەسە کەبۆت باس بکەم: کە ئەو پیاوە هەموو شتێکی هەبوو، هەر لەپارە، ناوبانگ، پۆلێک لە ژنی جوان، کەوای لەو پیاوە دەکرد سەری ڕابوەشێنێت و پرسیار بکات چۆن ئەمەی دەستکەوتووە، مەبەستم ئەوەیە ئەو پیاوە بەژنی جوان دەوردەدرابوو. من سەرم سوڕما بوو، چونکە نەمدەتوانی تێبگەم کەچۆن تاکە کەسێک دەتوانێت ئەم هەموو ژنە جوانەی دەست بکەوێت، چونکە ئەو زۆر جوان نەبوو، کەسانی دیکە هەبوو کەپارەی لەو زیاتریان هەبوو وە ناوبانگی زیاتر و لەویش جوانتر بوون، کەچی هێشتا ئەو دەیتوانی دەست بەسەر ١٥ ژندا بگرێت، بەبێ ئەوەی هیچ تایبەتمەندیەکیان پێ ببەخشێت،

لەگەڵ ئەوەی بیستبووم دەربارەی ئەکتەرە بەناوبانگەکان، کە نمایشکەری جلوبەرگ لەنیو باوەشیاندا بوو، وە هەموو شتێکیان هەبوو، بەڵام کاتێک خۆم لەنزیکەوە بەچاوی خۆم بینیم زۆر سەرسام بووم بەشێوازی پەیوەندیەکانی و مانەوەی ئەم ژنانە لەگەڵ ئەم پیاوەدا، لەگەڵ ئەوەی دەشیانزانی کەیەکێکن لەو ژنانەی باوەشی. من پێویست بوو بزانم چۆن ئەمە دەبێت (لەبەرئەوە نەبوو کەمنیش دەمویست وەکو ئەو نمایشکاری جوان لەدەوروبەرم بن، بەڵام ئەم دیاردەیە کەریگەری لەسەر جێهێشتم)، لەبەرئەوە دانیشتم قسەم لەگەڵ ئەم پیاوە و هاوشێوەکانی وەک ئەم پیاوە کرد، کە لەهەمان «پەیوەندی» هاوشێوەدا بوون و زۆر بەڕاشکاوی پرسیارم لێکردن: چۆن وا لەم ژنانە دەکەن لەگەڵتان بمێننەوە و هەر هەموویان پێبکەنن، سەریان ڕادەوەشاند و هەموویان هەمان شتیان ووت: ئەم ژنانە پارەیان دەوێت، لەگەڵ ناوبانگ و ژیانێکی خۆش و ئامادەن بەرگەی هەموو شتێک بگرن___ کە زۆربەیان شتی باش نین___ تا ئەمانەیان دەست بکەوێت. زۆر بەجدی پرسیارم لێکردن «ئایا ئەو ژنانە دەزانن ئەم پەیوەندیانە بەرەو کوێ دەڕوات؟»» یەکێکیان سەری ڕاوەشاند و بەسادەیی ووتی: ئەوان هەرگیز نازانن چارەنووسی ئەم پەیوەندییە بەرەو کوێ دەڕوات، چونکە هەرگیز پرسیاری لەبارەوە ناکەن، وتیشی»من ئەبێ چیان پێ بڵێم_ئەبێ چی بکەم_ئایا دەبێت پێیان بڵێم کە بەکاریان دەهێنم لەپێناو سێکس و دەرکەوتن لەگەڵیان لەبۆنەکاندا؟ ئەوە ڕاستیەکەیە.»» ئەمە زۆر کاری تێکردم، بەتایبەتی کەپرسیارم لەوجۆرە پیاوانە دەکرد و هەموویان هەمان شتیان دەوت، وە هەرکاتێک پرسیارم لێدەکردن « چی جیاوازییەکی هەیە بۆ ئەو

ژنانەی کەپەیوەندی لەگەڵ دادەنێن « هەر هەموویان هەمان شتیان دەووت «ئەگەر ژنەکە خۆی مەبەستی بوایە، پێم دەووت کەمن بەدوای پەیوەندییەکی جدییەوە نیم›› ئەوان ئەو پرسیارە ناکەن، لەبەرئەوەی پێیان وایە ئەگەر بپرسن ئەوا ئەو پیاوە لە دەستیان رادەکات. بەڵام ئەو پیاوە بەناوبانگەی کە یەکەمجار باسم کرد دەستێکی باڵای هەبوو لەم بوارەدا، زۆر بەسادەیی ووتی:›› ژمارەیەکی زۆر لەژنان شک دەبەم بەجۆرێک کەناچار نیم وەڵام بدەمەوە، کاتێک پرسیاریان لێکردم، چونکە لەبەرامبەر هەر ژنێک کەپرسیار دەکات، دوو ژن هەیە کەنایکات››.

ئەمە نـاو دەنـێیت چـی؟ نـاوی بـنـێ: گـەمـژە،چـەپـەڵ، لێخۆش بوونی نیە_هەرچیەک بێت، بڕوام پێ بکە ئەمجۆرە بیرکردنەوەی پیاوان تەنها لای بەناوبانگەکان نیە، بگرە لای پیاوە ئاساییەکانیش هەیە، وەک: دکتۆر، پاریزەر و شۆفێری بارهەڵگر وگوێزەرەوەکانیش، هەندێکیان هێندە ژنیان هەیە بەئەندازەی ژمارەی هاوڕێکانی من، هەندێک لەو ژنانە هێندەی ئەو نمایشکاری جل و بەرگانە جوان بوون کە لەگەڵ بەناوبانگەکاندا بوون. بەڵام ئەگەر یەکێک بێت لەو سێ ژنانە، یان یەکێک بێت لەو کۆمەڵە ژنانە، لەکۆتایدا تۆ هەر یەکێک دەبیت لە کۆمەڵەکەیان کە شوێنێکی باش نیە بۆ تۆ.

ئامانجی تۆ ئـەوەیـە یەکێک نەبیت لـەم کۆمەڵەیە، پێم وایە یەکەم هەنگاو: ئەوەیە ڕووبـەڕووی ئەو پیاوە ببیتەوە و زاڵبیت بەسەر ترسی لەدەستدانیدا، واز لەترسنۆکی بهێنە، چونکە کەسانی سەرکەوتوو لە جیهاندا دەزانن کەبەکارهێنانی هەڵەکان بۆ دەستکەوتنی ئەوەی کە دەیانەوێت زیاتر باشتر و بەرهەمترە لەدانیشتن و ترسان لە هەر هەوڵدانێک. دەتوانین

هەمان فەلسەفە جێبەجێ بکەین بەسەر بابەتی پەیوەندیدا؛ ئەگەر خستنەڕووی داواکاریەکانت ببێتە هۆکاری لەدەستدانی ئەو پیاوەی خۆشت دەوێت، ئەوا پێویستە لەسەرت ئەم سەرکێشیە بکەیت، چونکە ئەم ترسە دەتوانێت هەموو کاتێک قاچ و دەستت ببەستێتەوە؛ زۆربەتان ڕێگا بەپیاو دەدەن بێڕێزیتان پێ بکات و سزاکەی وەرنەگرێت و لەسەر بەڵێنی خۆی نەبێت، چونکە تۆ دەترسیت بەجێت بهێڵێت و بەتەنها بمێنیتەوە. بەڵام ئێمەی پیاو؟ ئێمە ئەوە دەزانین و زۆربەی کات لەبەرژەوەندی خۆمان بەکاری دەهێنین، ئەمە بزانە: ئەم یاریە کۆنە و هەرگیز ناگۆڕێت، کوڕە منداڵەکانیش هەمان شت دووبارە دەکەنەوە، چونکە لەدەستیان دێت، ژمارەیەکی زۆر لەژن هەیە ڕێگە بەوە دەدەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تۆ پێش ئەو قسە دەتوانیت یاسا و بنەمای خۆت بخەیتەڕو و شێوازی خۆت بگۆڕیت، تاوەکو پیاو نەتوانێت یاریت پێ بکات.

بەڵام چۆن ئەمە بکەیت؟ وا لەپیاوەکە بکە کە ڕوون و ئاشکرا بێت لە بارەی ژیان و پەیوەندیەکەیەوە لەگەڵتدا، دەتوانیت ئەمە لەڕێگەی ئەم ٥ پرسیارەوە ــــ ئەو پرسیارانەی کەیارمەتیت دەدات ڕاستەوخۆ دیاری بکەیت کەبەهای ئەم پیاوە چەندە، ئایا پلانەکانی گونجاوە لەگەڵ تۆ. من ئەم ٥ پرسیارەم داهێناوە لەڕێگەی چاودێریکردنی پیاوانەوە کە یاریان بەژن کردووە وە ژنانیش کەوتوونەتە داوەکەیانەوە، وە پرسیارکردنی بەردەوام لەخۆم و هەندێک لەهاوڕێکانم کە دەستێکی باڵایان هەبووە لەم یارییەدا: ئەمانە پرسیاری نایابن ــــ کە وەڵام دانەوەیان هەموو ئەوەت پێدەڵێت کەپێویستە بیزانیت لەبارەی ئەو پیاوەی کە لەژیانتدایە، یان حەز دەکەی لەژیانتدا بێت. کردنی ئەم پرسیارانە

پارمەتیت دەدات دیاری بکەیت ئایا سەیربکەی پەیوەندیەکەتان بەرەو کوێ دەچێت، یان بەتەواوی پێچەوانەی ئەوە بڕۆیت.
تێبینی: پێویست ناکات ئەم پرسیارانە دوابخەیت__هەر کەچاوت بە پیاوێک کەوت و هەستت کرد بەدڵتە خێرا ئەم پرسیارانەی لێ بکە، ئەگەر بەپرسیارەکان بێزاربوو جا چیە: تۆ مافی ئەوەت هەیە کە زانیاریەکان بزانیت. ئەگەر ئامادە نەبوو وەڵام بداتەوە، ئەوە هەر لە سەرەتاوە دەزانیت کە کەسێکی گونجاو نیە بۆت.
کەواتە با دەست بەپرسیارەکان بکەین، بەڵام بیرت بێت بەبێ ترس:

## پرسیاری یەکەم(١):
## ئامانجە کورتخیانەکانت چین؟

ئەگەر نیازی بەستنی پەیوەندیت هەیە لەگەڵ پیاوێک، ئەوا پێویستە بزانیت پلانەکانی چین، و ئایا دەگونجێت لەگەڵ بنەما بنەڕەتیەکانی پیاو ___نازناوەکەی پیاو، ئیشەکەی، چەندێک پەیدا ددکات ،ئەم سێ شتە هەروەک چۆن من پێشتر پێم وتی، چونکە ئەم سێ شتە زۆر گرنگە بەلای پیاوێکی پێگەشتوو کارامەوە، تۆ دەبێت بزانیت ئێستا چی دەکات و پلانی بۆ سێ ساڵ و پێنج ساڵی داهاتوو چییە، تا ببێت بەپیاوێکی پێگەشتوو، وەڵامەکەشی یارمەتی تۆ دەدات تا بزانیت دەتەوێت بەشێک بیت لەپلانەکانی یان نا، وە دەشزانی کەی پێویستە ئاڵای سور بەرزبکەیتەوە، ئەگەر هیچ پلانێکی نەبوو.

ئەگەر پلانی هەبوو زۆر نایابە، وا ڕەفتار بکە کەزۆر گرنگە بە لاتەوە و دواتر پرسیارەکانی تر بکە ــــ وا ڕەفتار بکە کەلیکۆلەرێکی بە پەرۆش و خۆهەڵقورتینەری ـــ چونکە وەکو دەزانیت پیاوان حەز دەکەن قسەبکەن و خۆیان هەڵبکێشن، چونکە دەزانین دەبێت سەرنجت ڕابکێشین و ڕاوت بکەین، لەبەرئەوە ڕێگەمان پێبدە سەرنجت ڕابکێشین، هەرچەندە تۆ زیاتر بەپەرۆش و فزوڵبیت، پیاو زانیاری زیاترت دەداتێ، شتی لەم شێوەی پێ بڵێ: «چۆن دەستت بەم کارە کرد لەم بوارەدا؟ یان چەند سەرنج ڕاکێشە ـــ چۆن ئەوا سەرکەوتوو بویت؟» و بە وریایەوە گوێبگرە. لەڕێگەی قسەکانیەوە بۆت دەردەکەوێت ئەگەر پیاوێکی ئیشکەر و کۆڵنەدەر بێت یان پیاوێکی تەمبەڵ بێت و هەر خەریکی قسەی هەڵیت و پەڵیت بێت، دەبینیت و ئەوەت بۆ دەردەکەوێت کەخۆت دەبینیتەوە لەم پلانە کورتخایەنەدا یان نا، ئەگەر بۆتدەرکەوت پلانی چیە، ئەتوانیت ڕاستەوخۆ دیاری بکەیت کەدەتەوێت بەشداربیت تیایدا و ئەو ڕۆڵە چیە کەدەتبێت لەم پلانەدا. یان دەتوانیت دیاری بکەین ئەگەر بتەوێت بێیتە دەرەوە لەم پلانە، بۆ نموونە: ئەگەر پێی ووتی «من تەکنیککارم لە کۆمپانیای کێبڵ وایەر، بەڵام شەوان دەڕۆم بۆ زانکۆ تا بڕوانامەی بەکالۆریۆس بەدەست بهێنم لەئەندازیاریدا، تاوەکو لەکارەکەمدا بەرەو پێشبچم» ، ئەو کات دەزانی کەئەم پیاوە پلانی هەیە و کار دەکات بۆ بەدیهێنانی. وە خۆت وادەبینیتەوە یارمەتی بدەی لەخوێندنەکەیدا، یان لەئاهەنگی دەرچوونەکەیدا، پێشنیاری بۆ دەکەین کەبگوازێتەوە لە تەکنیککاری کێبڵەوە بۆ ئەندازیار، تا یارمەتی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای کۆمپانیا بدات، گرنگ ئەوەیە پلانی هەیە و بەپێی ئەو کار دەکات. کە ئەمەش

ئاوە دەگەیەنێت ئەو هەوڵ دەدات ببێت بەو پیاوەی کەخۆی دەیەوێت ببێت__ئەم ئەو جۆرەیە کەتۆ بۆی دەگەڕێیت و گونجاوە تا هاوسەرگیری لەگەڵ بکەیت و پشتی پێ ببەستیت.

بەڵام ئەگەر دەربارەی ئامانجە کورتخایەنەکانی پرسیارت لێ کرد، شتێکی شێتانەی لەم شێوەت پێدەڵێت « من دەرمان فرۆشێکی سەر شەقامم، یەک دوکانم هەیە، بەڵام ئامانجم ئەوەیە لەسالانی دواتردا ١٥ دوکانم هەبێت لەڕۆژئاوای شەقامی «هینری»یەوە تا شەقامی «براون»، دوای ئەوە خێرا دەزانیت کەدەبێت بەڕێگای خۆتدا بڕۆیت بەردەوامی بە ژیانت بدەی.

هەمان شتیشە بۆ ئەو پیاوەی کەئامانجی کورتخایەنی هەیە، بەلام هیچ پلانێکی نیە بۆ جێبەجێ کردنی، بۆ نمونە: « لەوانەیە بڵێت دەیەوێت ببێت بە بەرهەمهێن، بەڵام هیچ هەوڵێک نادات تا بەدەستی بهێنێت__گرنگی نادات و هەوڵ نادات تا کاربکات لە کومپانیایەکی فیلم یان چیرۆک بنوسێت و بیخوێنێتەوە، یان هەندێک پەیوەندی تەلەفۆنی بکات تا دەرگایەک بەڕوویدا بکرێتەوە__ بۆ ماوەی ٤ مانگ ئیشی نەکردووە و هیچ هەلێکی نیە لەو بوارەی کەخۆی ئارەزووی دەکات ئیشی تیا بکات__ وە ئەگەر هیچ پلانێکی نەبێت ئەوا ئامانجە کورتخایەنەکانیشی بەدی ناهێنێت، لەڕاستیدا لەوانەیە هەر ئامانجیشی نەبێت، چونکە خۆشی نازانێت چی ئەڵێت، لە هەردوو بارەکەدا تۆ ئامادە نیت واز لەسەر پلانەکانی بکەیت، تەنها لەگەڵ پلانەکانی خۆتدا دەیکەیت بە یەک، بێگومان لەوانەیە ڕۆژێک لەڕۆژان پلانێک دابنێت و سەرکەوتوو بێت، بەڵام بۆچی دەبێت تۆ وازۆی بکەیت؟ ئەگەر ئەو وا دیاربوو خەونی ئاسمانی هەیە، بزانە ئەو هەر دادەنیشێت سەیری ئەستێرەکان دەکات، یان فڕۆکەیەک

لەپشتی خۆی دەبەستێت و دەچێت بۆ ئاسمان و بەدوای خەونەکەیدا دەگەڕێت.

## پرسیاری( ٢)
## ئامانجە درێژخایەنەکانت چین؟

متمانەم پێ بکە کە دەڵێم: پیاوێک بەڕاستی تێڕوانینی هەبێت بۆ ئەو شوێنەی کەدەیەوێت دوای دە ساڵ بەدەستی بهێنێت، ئەوە پیاوێکە بیری لەداهاتووی خۆی کردۆتەوە، کەپێویستە بەتەواوی چی بکات، تا پێی بگات، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت تێڕوانین و نەخشە ڕێگای بۆ هەنگاوەکانی هەیە بۆ داهاتوو. بەڵام ئەگەر شتێکی گەمژانەی لەم شێوەی ووت: « من وردە وردە بەدەستی بهێنم›› ، خێرا ڕاکە، وە ئەگەر ئامانجە درێژخایەنەکەی هەمان شت بوو لەگەڵ ئامانجە کورتخایەنەکەی، هیچ دوودڵ مەبە خێرا لێی دووربکەویتەوە، چونکە ئەم وەڵامەی ئەوە دەگەیەنێت کەبەتەواوی بیری لەداهاتووی ژیانی نەکردۆتەوە، یان ئەوەتا تۆ لەم داهاتووەدا نابینێتەوە، لەبەرئەوە هیچ هۆکارێکی نیە تا ڕوونکردنەوەت بۆ بکات و هەموو ئەوەی کەهەیەتی بۆت دەتەوێت لەنزیکی بمێنیتەوە، بە هەرحاڵ؟ یاریکردنە، و ئەگەر هیچ پلانێکی نەبوو، کەواتە تۆ بۆچی

ئەو پیاوەی کەدەبێت بیری لێ بکەیتەوە و کاتی خۆتی تیا تەرخان بکەیت، ئەو پیاوەیە کەپلانی هەبێت ــــ پلانێکی زۆر تۆکمە و باش، کە بتوانیت خۆتی تیا ببینیتەوە. تکایە بڕوام پێ بکە کە پێتدەڵێم ــــ هەر وەک چۆن لەبەشی پێشتریشدا پێم

ڕۆنیت ـــ پیاو هەمیشە پلانی هەیە، چونکە من کە دەستمکرد
بەکاری کۆمیدیا پلانم هەبوو، وە تەنانەت پێش ئەوەی یەکەم
ڕکێنە بکەم لەپێش هاندەراندا، دەمزانی ئامانجی ٥ ساڵی
ئامانجم ئەوەیە ببم بە ئەستێرە و ٢٥٠٠ دۆلار کۆبکەمەوە
لە هەفتەیەکدا بەلایەنی کەمەوە، تامەزرۆیم بۆ بردنەوەی ئەم
دیاریبەبوو هەر زوو توانیم هەفتانە ٢٥٠٠ دۆلار کۆبکەمەوە و
زۆر دڵخۆش بووم بەوە، هێشتا هەر ئەمویست ببم بە سەرتۆپی
ئەستێرەکان، لەبەرئەوە دەستمکرد بە بەرزکردنەوەی نرخ،
هەوڵمدەدا و دەمویست ٥٠٠٠ بۆ ٧٥٠٠ دۆلار لەهەفتەیەکدا
پەیدا بکەم، هەشت ساڵی خایاند، بەڵام من سەر کەوتوو بووم
لەبەدیهێنانی ئامانجی پارە پەیاکردنم و زۆر دڵخۆش بووم
بەوە.لەو کاتەدا چاوم بە (سندباد) کەوت.

ئەوکاتە، سندباد لەنادی کۆمیدی کاری دە کرد لە(بیرمینگام)،
و بڕێکی زۆر زۆری پەیاکرد کە لە نێوان ٥٠،٠٠٠بۆ٧٠،٠٠٠$
دۆلار بوو لە هەفتەیەکدا، واتە لە ٧ ڕۆژدا، دەمزانی منیش
شتێکی وام دەوێت، سەرکەوتنەکەی ئەو وای لێکردم کە درک
بەوە بکەم شتێکی شاراوە لەکاتی کۆمیدیدا هەیە ــــ وە من
پێویستە پلانێکی درێژخایەن دابنێم، تا بگەم بەو جۆرە ژیانەی
کە لەئەکتەرێکی کۆمیدیدا دەیبینم، هەوڵمدا لەسەر شاشەی
تەلەفیزۆن دەربکەوم، تا ژیانێکی گونجاو بۆ خێزانەکەم
دابینبکەم و شانازی پێوە بکەین، بەم شێوەیە بیرم لەژیانی
خۆم کردەوە، دواتر پلانم دانا کەچۆن بەدیبهێنم.

دەمزانی ئەوە ئاسان نابێت ــــ و کاتیشی دەوێت، چونکە
ژمارەی ئەو یانە کۆمیدیانە کەم بوون بڕە پارەیەکی وا زۆری
تیا پەیدا بکەی، وە دەبوو پەیوەندی گرنگت هەبووایە لەگەڵ

تیمێکی نایابی کارکردن تا یاریدەدەرت بێت و سەرکەوتوو بیت، بەڵام لەهەمووی گرنگتر من پلانی درێژ خایەنم هەبوو، و دەمزانی چۆن هەنگاو بنێم بەرەو سەرکەوتن، و لەکۆتاییدا من ئەو ئامانجانەم هێنایەدی و بگرە زیاتریش.

کاتێک گوێت لەهاوسەری داهاتوت بوو، وەڵامی یەکەم و دووەمی دایەوە، بەتەواوی تێدەگەیت کەمامەڵە لەگەڵ چ جۆرە پیاوێک دەکەیت، ژیانی خۆت مەبەستەوە بەژیانی کەسێکەوە کەهیچ پلانێکی بۆ داهاتوو نیە، لە کاتێکدا ئەو لەجێی خۆیەتی و هیچ بەرەو پێشناچێت، تۆش زوو بێت یان درەنگ هەست بەوە دەکەیت کە لەگەڵ ئەودا هیچ بەرەو پێشنەچوویت.

## پرسیاری (٣):
## تێڕوانینت چییە لە پەیوەندییەکاندا

ئەم پرسیارە چەند بەشێک لەخۆ دەگرێت، کە لەڕێیەوە دەتوانیت هەستی ئەو پیاوە لێک بدەیتەوە لەبارەی جۆرەها پەیوەندیەوە____وەک هەستی بەرامبەر دایک و باوکی، یان منداڵەکانی، هەتا دەگاتە پەیوەندی لەگەڵ خودا، وە هەر پرسیارێک زیاترت بۆ ئاشکرا دەکات لە بارەی ئەوەوە و تاچەند جددیە لەبارەی پەیوەندیەوە، وە لە چ جۆرە خێزانێکدا گەورە بووە، و دەبێت بە چ جۆرە مێردێک و باوکێک لە داهاتوودا، وە چی دەربارەی خوداو ئاین دەزانێت. وە تاکە ڕێگا بۆ دەستکەوتنی وەڵامەکان ئەوەیە پرسیار لەبارەیەوە بکەیت وپێش ئەوەی ئەو پیاوە ماچ بکەی، یان تەنانەت پێش ئەوەی ڕازی بیت ژوانی لەگەڵ ببەستیت، پرسیاری لێبکە. وە هەرگیز

دوودڵ مەبە و شەرم مەکە لە کردنی ئەم پرسیارانە، چونکە ئەگەر تۆ پرسیاری لینەکەیت و قسەی لەگەل نەکەیت، ئەی بەتەمای چی بکەیت؟ ئەگەر ئەو پیاوە کیشەیەکی هەبوو لەگەل قسەکردندا، ئەوە دلنیابە کەهەلەیەک لەئارادایە و خیرا رابکە.

یەکەم شت، بزانەکە هەستی چۆنە لەبارەی خیزانەوە؟ چۆن لەخیزان دەروانیت؟ و ئایا دەیەویت خیزانی هەبیت؟ هەستی چۆنە بەرامبەر مندال؟ ئەگەر مندالت هەبوو بەڕاشکاوی پیی بلی بابزانیت، چونکە ئەوە مافی خۆیەتی، و گرنگتریش لەوە مافی تۆیە بزانیت کەئەو خەیالی ئەوە دەکات ببیت بە باوک، یان ئەگەر ئەو نەیویست مندالی هەبیت و تۆ ویستت ئەوا هەر ئیستا نەبیت ئەمە بوەستینیت. (تکایە ئەوە بزانە کە وتی مندالم ناویت، ئەوە دلنیابە کە ڕای خۆی ناگۆڕیت، بە بی گویدانە ئەو هەستە قولەی بەرامبەرت کە هەیەتی)، بیجگە لەوەش، ئایا چارەنوسی ئەم پەیوەندییە چی دەبیت، ئەگەر ئەو مندالی نەویت و تۆش لەهەمان کاتدا خاوەنی مندال بیت؟ دوای ئەوەش پرسیاری لیبکە لەبارەی پەیوەندی لەگەل دایکیدا، ئەوە یەکەم پەیوەندی پیاوە لەگەل ژندا، ئەگەر پەیوەندییەکی باشی هەبوو لەگەل دایکیدا، ئەوا بە خۆشحالیەوە ئەو دەزانیت بەڕیزەوە مامەلە لەگەل دایکیدا بکات و خاوەنی جۆریک لەبیرکردنەوەیە، کەچۆن خۆشەویستی دابینکردن و پاراستن دەرببڕیت، نەک تەنها بەرامبەر ژن، بەلکو بەرامبەر هەموو خیزانەکە.

من کوڕیک ناناسم دایکی خۆی خۆش نەویت، ئیمە فیر دەبین کە بپاریزین و دابینکەری بین، ئیمە لەدایکمانەوە فیری کرۆکی خۆشەویستی دەبین بەرامبەر ژن. بیگومان، ئەگەر پیاویک ناکۆکی لەگەل دایکی هەبیت، دلنیابە ناکۆکی لەگەل تۆش

دەبێت. ئەگەر گوێت لێبوو وتی: من ودایکم!؟ ئێمە زۆر پێکەوە ناگونجێین......، ئەوا ژمارەکەی ونامەکانی لای خۆت بسڕەوە و بەڕێگای خۆتدا بڕۆ.

دوای ئەوەی کەزانیت هەستی چۆنە بەرامبەر دایکی، دوای ئەوە پرسیار لەبارەی باوکیەوە بکە، ئەگەر پەیوەندیەکی پتەوی لەگەڵ باوکی هەبوو، ئەوە بێگومان لەسەر کۆمەڵێک بنەمای بنەڕەتی گەورە بوە و ئەم بنەمایانەش لەگەڵ خۆیدا ئەهێنێت تا لەماڵەکەی خۆتاندا جێبەجێی بکات، من لەوەش تێدەگەم کەژمارەیەکی زۆر لەمنداڵان بەبێ باوک گەورە بوون، لێرەدا دوو گریمانە هەیە، یان ئەوەتا ئەو پیاوەی گرنگی پێدەدەی، باوکێکی هەبووە کەپێوەرو مەرجەکانی پیاوەتی فێرکردووە، یان لەنەبوونی بێ باوکیدا خۆی کۆمەڵێک شت فێر بوبێت، کە کاتێک بوو بەباوک بیەوێت بیکات، لەهەموو حاڵەتەکاندا، پرسیاری لێبکە لەبارەی پەیوەندی لەگەڵ باوکیدا، بێگومان وەڵامەکانی بۆت ئاشکرا دەکات کەدەبێت بە چ جۆرە پیاوێک.

دەبێت پرسیاریشی لەبارەی پەیوەندی لەگەڵ خودا لێبکەی،با ڕاشکاوبم: ئەگەر چاوت بەپیاوێک کەوت پەیوەندی لەگەڵ خودادا نەبوو، نە دەچوو بۆ کڵێسا، وە حەزیشی لێ نەبوو بچێت، و هیچ بیرو باوەڕێکی نەبوو، کە وەک و هێزێکی ڕێنیشاندەر پەیڕەوی بکات لە ژیانیدا، ئەوکات ئەوە کێشە دەبێت، و لەکۆتایشدا بێجگە لەخودا بە چ پێوەرێکی تری ڕەوەشتی وەڵام دەداتەوە؟ وەچی وای لێدەکات بیر لەوەبکاتەوە بەوەفا بێت بۆت؟ وە چی وای لێدەکات کە بەشیاوی مامەڵە لەگەڵ تۆو منداڵەکاندا بکات؟ وەچی وای لێدەکات کەوا هەستبکات مرۆڤێکی تەواوە؟ من ناڵێم نابێت ژوان لەگەڵ پیاوێکدا ببەستێت

کەناچێت بۆ کڵیسا، یان بیروباوەڕی جیاواز بێت لەگەڵت. بەلام ئەگەر ناوەڕۆکی بیروباوەڕی لەگەڵ تۆ جیاواز بوو ئەوکات تۆ لەکێشەدایت.

وەدوای تێپەڕبوونی ماوەیەک بەسەر ژوانەکەتاندا، و قسەکردن لەگەڵ یەکتردا، دوو پرسیاری تری لێبکە، وا باشترە پێش ئەوەی پەیوەندیەکەتان قوڵبێتەوە ئەم پرسیارانە بکەیت، بەڵام تەنانەت ئەگەر پەیوەندیەکەشتان قوڵ بۆیەوە هەر دەتوانی ئەم پرسیارانەی لێ بکەیت، لەوانەیە وەڵامەکان زۆر ئازارت بدات، بەڵام بەلایەنی کەمەوە لەکۆتایدا ڕاستییەکانت بۆ دەردەکەوێت.

## پرسیاری (٤):
## ڕات چییە سەبارەت بە من؟

---

پێویستە لەسەرت دوای چەند ژوانێک ئەم پرسیارە بکەیت، چونکە پێویستی بەکاتە تا بتناسێت، بەڵام وەڵامەکەی گرنگ دەبێت، چونکە بۆت ئاشکرا دەبێت کەپلانەکەی چییە بۆت، ئەگەر ئێوە چەند جارێک چاوتان بەیەکتر کەوت و قسەی زۆرتان پێکەوە کردوو کۆمەڵێک شتت دەربارەی زانی، بەڵام گرنگترین شت ئەوەیە کەتۆ دەتەوێت ڕای ئەو بزانیت دەربارەی خۆت، مافی ئەوەت هەیە بیزانیت، بڕوابکە ئەو هەر لەیەکەم جار شتێکی تێدا بەدی کردووی، تۆش دەبێت ئەوە بزانیت، شتێکت سەرنجی ئەوی ڕاکیشاوە ــــ بۆ نمونە حەزی لەقژتە، یان چاوەکانت، یان قاچەکانت، یان جلوبەرگەکانت، چونکە ئەو تەنها بۆ نزیکایەتی لێت نزیک نەبۆتەوە، و دوای ئەو تێکەڵبوونە سەرەتاییە، پیاو

دەیەوێت بزانێت کەئەگەر تۆ لەو جۆرە ژنانە بیت ئاسان خۆت بدەی بەدەستەوە، دواتر بەجێت بهێڵێت، یان دەمێنێتەوە لات تا زیاتری لێت دەست بکەوێت، ئەوکات دەتوانێت هەموو ئەمانەت بۆ دەربکەوێت لە ڕێی وەڵام دانەوەیەوە.

جوان گوێ لەوەڵامەکەی بگرە: دڵنیات دەکەمەوە کەوا دەبێت، چونکە پیاو هەموویان بەهەمان شێوە وەڵام دەدەنەوە: «من پێم وایە تۆ ژنێکی نایابی، و دایکێکی باشیش دەبیت لەداهاتوودا، و تۆ ڕووخۆش ومیهرەبانیت و بەڕاستی تۆ جوانیت، و تۆ هەست بزوێنی و چالاک و نەرم و نیانیت، ئیشکەریت و زۆر زیرەکیت، وە تۆ لەو جۆرە ژنانەی کەمن دەتوانم وێنای خۆمی لەگەڵدا بکەم» و هەموو ئەم شتە پڕوپوچانە دەزانین کەتۆ حەز ئەکەی گوێت لێی بێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە ئەو وەڵامە نیە کەتۆ بەدوایدا دەگەڕێیت. تۆ شتی تایبەت و دیاریکراوت دەوێت، تۆ دەتەوێت بزانیت کەڕای چییە بەرامبەرت، نەک بەشێوەیەکی ڕووکاریو ڕوکەش، لەبەرئەوە بەردەوامبە لەقسەکردن لەگەڵی، وە بەدوای ئەم شتانەدا بگەڕێ: «ئۆو، پێت وایە کەمن میهرەبانم؟ چی وات لێدەکات وابیر بکەیتەوە؟» دوای ئەوە دانیشەو گوێبگرە، ئەگەر نەیتوانی نمونەیەکی دیاریکراوت بداتێ کەمیهرەبانیتی پێ گوزارشت بکات، کەواتە ئەوە ڕایەکی ڕووکەش بووە، بەڵام ئەگەر وتی» ئەو ڕۆژەت بیرە کەپەیوەندیت پێوەکردم لەڕۆژی لەدایک بوونی دایکمدا، بیرت خستمەوە کەکارتی پیرۆزبایی بۆ بکڕم؟ ئەوە هەڵسوکەوتێکی میهرەبانی تۆ بوو» ئەگەر وتی «تۆ دەبیت بەدایکێکی نایاب» بڵێ ئەو شتانە چیە کەوات لێدەکات من دایکێکی نایاب بم، وە بەم شێوەیە لەگەڵ باسکردنی هەر تایبەتمەندیەک بۆت، ئاستی ئەم سیفەتە

تایبەتانە ئاماژەیەکی ترت دەداتێ لەبارەی نیازی ئەو پیاوەوە سەبارەت بە پەیوەندیەکەتان. ئەگەر لەتوانایدا بوو تایبەتمەندیت پێ ببەخشێت، ئەوە مانای ئەوەیە گوێت بۆ دەگرێت و زانیاریت لەسەر کۆدەکاتەوە، وێنای ئەوە دەکات کە ئەگەر پەیوەندیت لەگەڵ ببەستێت، و ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە بەلایەنی کەمەوە هەردووکتان بەهەمان شێوە لەپەیوەندیەکەتان دەڕوانن.

## پرسیاری ٥:
## هەستت چۆنە بەرامبەرم؟

پێویستە تۆ «ڕای خۆت» و «هەستی خۆت» تێکەڵ نەکەیت، چونکە ئەم دووانە دوو شتی جیاوازن، و ئەگەر پیاو نەیتوانی هەستی خۆیت پێ بڵێت دوای یەک مانگ لە ژوان، چونکە ئەوە دەگەیەنێت کەهیچ هەستێکی بۆت نیە__تەنها شتێکی لێ ویستوویت، پرسیار لەو پیاوە بکە کەهەستی چۆنە بەرامبەرت، دواتر دەبینیت کەچۆن سەری لێدەشێوێت و دەشڵەژێت، و دەست دەکات بە ووتنی ئەم شتانە: پێشتر پێم ووتی، پێم وایە تۆ.....›› خێرا قسەکەی پێ ببڕە و پێی بڵێ: «نەخێر، نەخێر، من دەمەوێت بزانم هەستت چۆنە بەرامبەرم» سەیری بکە کەچۆن کورسیەکەی ژێری دەلەقێنێت و سەری دەخورێنێت، یان جگەرەیەک دادەگیرسێنێت__یان هەر شتێکی دیکە تا خۆی لەوەڵامدانەوە بدزێتەوە، یان تەنانەت بیردەکاتەوە کەتۆ چاوەڕێ دەکەی چیت پێ بڵێت، بەڵام تۆ دەبێت وای لێ بکەیت وەڵام بداتەوە.

نیگەران مەبە ئەگەر دەستبەجێ وەڵامی نەدایەوە: چونکە

ئەو نایەوێت بچێتە ئەو بەشەی خۆیەوە کە حەزی لێی نیە بچێت، ئەویش بەشی سۆزە، چونکە پیاوان زۆرباش نین لەڕەفتارکردن لەگەڵ عاتیفەدا و ئاسان نیە دەری ببڕن. پیاوان وەڵامی پرسیار دەربارەی خودا و منداڵ و دایکیان دەدەنـەوە، بەڵام تۆ بەم پرسیارەت داوای لێ دەکەیت کەبچێتە قوڵایی ناخیەوە و (دی ئین ئەی) ئێمەش وا درووسـت نەبووە کە هەست و سۆزی خۆمان بۆ هەموو کەسێک دەربڕین. بەڵام ئەوە ناگەیەنێت کە واز لەپرسیارکردن بهێنیت. ئـەوەی تۆ بۆی دەگەڕێیت لەناو وەڵامەکەیدا شتێکی لەم شێوەیەیە کە بڵێت: کاتێک ناتبینم، تامەزرۆم قسەت لەگەڵ بکەم، و هەمیشە دەڵێم ئەبێت ئێستا چی بکات، کاتێکیش دەتبینم هەست بە باشی دەکەم__تۆ ئەو ژنەی کە هەوڵی دۆزینەوەیم دەدا››

بەشێوەیەکی تر، وەڵامەکەی دەبێت وات لێ بکات هەست بەخۆشی بکەیت،. لەوانەیە هێشتا نەکەوتبێتە خۆشەویستی تووە، بەڵام شێتی تۆیە و بەلایەنی کەمەوە بیر لەوە دەکاتەوە پەیوەندیەکی درێژخایـەنی لەگەڵت هەبێت، چونکە کاتێک دەستیکرد بەدەربڕینی خۆشەویستی خۆی بۆت، دەتخاتە پەنای ئەو کەسانەی کە دەیانپارێزێت و دابینکەریانە ، داهاتویەک لەگەڵ تۆدا دەبینێت و ئەمە ئەو شوێنەیە کەتۆ دەتەوێت لەگەڵ ئەم پیاوەدا لێی بیت.

وەڵامی «پێم وایە تۆ زۆر نایابیت›› مەبەستەکە ناپێکێت، ئەگەر دوای ئەوەی پرسیارت لێ کرد و هەستەکانی زۆر قوڵ نەبوون بەرامبەرت__بەڕوونی ئەو هیچ تۆی بـەلاوە گرنگ نیە__ تۆش دەبێت لە نزیکی نەمێنیتەوە.

پشوویەک بدە و چاوەڕێ بکە، تا ئەو شتانەی لات گرنگە

و دەتەوێت هەستی پێ بکەیت و گوێت لێیان بێت، لەو پیاوەی کەنارەزووی پێکهێنانی پەیوەندی دەکەیت لەگەڵیدا.

ئێمەی پیاو ئاگادارین کەدەبێت وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە، و هەر پیاوێکی ڕاستەقینە توانای وەڵامدانەوەیانی هەیە، لەوانەیە زۆر وەڵامەکانت بەدڵ نەبێت، بەڵام ئەو وەڵامیان دەدانەوە، ئەگەر ڕەتی کردەوە وەڵام بداتەوە، کەواتە خۆتی پێوە سەرقاڵ مەکە و پێت وا نەبێت کەدەتوانیت دواتر چارەسەری بکەیت___وە چاوەڕێ بکەیت تا زیاتر ئاشنا بێت لەگەڵت___ چونکە ئەمە جگە لەهیوایەکی کوێرانە هیچی تر نیە. وە پێش ئەوە زۆر بەخراپی بۆت دەردەکەوێت کەئەم پیاوە بۆ تۆ نابێت، دوای ئەوە قسەی دڵی خۆت بۆ هاوڕێکەت دەکەیت وەکو ئەمە: «ئەزانی چی، من لەگەڵی خەوتووم، ئەویش بەتەمای هیچ نیە، و من تەنانەت ناشزانم منداڵی خۆشدەوێت یان نا....» مەهێڵە ئەمەت بەسەر بێت.

چاونەترس بە___مافی خۆتە پێشتر ئەم وەڵامانە بزانیت لەگەڵ یاسای ٩٠ ڕۆژی، کە لەبەشی دواتر ئاماژەی پێ دەدەم. تۆ پێویستە ئەم پرسیارانە بکەی لەسەرەتای پەیوەندیەکەتان و لەڕۆژەکانی سەرەتای دڵداریتان.

ئەگەر تۆ ئێستا لەپەیوەندی دایت لەگەڵ کەسێکدا، ئەم پرسیارانە هێشتا بەسودن، ئەگەر تۆ وەڵامەکان نازانیت دەتوانیت داوای ڕوونکردنەوەیان بکەی، یان حەز دەکەیت ئەم پرسیارانە بکەیت، تاوەکو دڵنیا ببیتەوە لەو زانیاریانەی سەبارەت بەو دەیزانیت، تاوەکو بزانیت ئایا پێویستە کۆتایی بە پەیوەندیەکەتان بهێنیت یان بەئاڕاستەیەکی ڕاستی ببەیت، لەوانەیە وەڵامەکە یارمەتیدەرت بێت تاوەکو زیانەکانت کەم

بکەیتەوە پێش ئەوەی ساڵی زیاتر بەفیڕۆ بدەی لەپەیوەندیەکدا کە بەو شێوەیە نیە تۆ دەتەوێت، یان لەوانەیە وەڵامەکان وات لێ بکات کە بڵێی «ئۆو، من خۆشحاڵم کەلەگەڵ ئەم پیاوەدام».

وە ئـەوەش بـزانـە: کەئێمە بۆیە وەڵامـی پرسیارەکان دەدەینەوە، چونکە حەز دەکەین باسی خۆمان بکەین، و وەڵام دانەوەمان وامان لێ دەکات کە تێڕوانینمان جیاوازبێت سەبارەت بەو ژنەی کە پرسیارەکەی لێ کردووین.

بێگومان دەمانەوێت بۆچوونی ژنەکانیشمان بزانین لەو بارەیەوە، بەڵام ئەگەر نیازمان پاک نەبوو بەرامبەرتان، ئەوکات حەز ناکەین بزانین بۆچوونتان چیە. پیاوەکەش لەوانەیە بەهۆی ئەم گفتوگۆیەوە تۆی بۆ دەربکەوێت و واهەست بکات کەمامەڵە لەگەڵ ژنێکی ژیـردا دەکـات، بۆ نموونە: لەوانەیە پێت بڵێت کەدەیەوێت ببێت بەئەندازیار و شەوانە دەچێت بۆ کۆلێژ تاوەکو بڕوانامە بەدەست بهێنێت، تۆش پێی بڵێی کە چەند هاوڕێیەکی ئەندازیاریت هەیە و ئـامـادەی بەیەکیان بناسێنیت تاوەکو یارمەتی بدەن و ئامۆژگاری بکەن، وە هەوڵی دەستکەوتنی کارێکی نوێ دەدات، و کاتێکیش تۆ دەستی یارمەتی بۆ درێژ دەکەیت بەم شێوەیە بیرت لێدەکاتەوە؛ « نایابە، ئەم ژنە گرنگی بەئامانجەکانم و ئاواتەکانم دەدات، و دەستی یارمەتی بۆ درێژ کردم، لەوانەیە ئەو کەسە بێت کە وام لێ بکات بەرەو پێش بچم» ، لەوانەیە مەبەستی لە بەرەوپێش چوون ئەوەبێت کەتۆ خۆت لەو نێوەندەدا دەبینیتەوە، تۆ زانیاریت دەستکەوت لەبارەیەوە و لەپلانەکانیدا ببینیتەوە کورتخایەن و درێژخایەنەکانی دا، وەکو بەشێک لە خێزانەکەی و منداڵی بۆ بخەیتەوە، یارمەتی بدەی لەکارەکانیدا، پەیوەندیت ـــ ئایا من خۆم دەبینمەوە لەپلانە

پێەو بکەیت لەگەڵ دایکی و پاڵنەری باوکی منداڵەکانم بم،
هەموو ئەم شتانە؟ ئەویش زانیاری دەستدەکەوێت، دڵنیابە کە
ئەو کوڕەی پرسیاری لێدەکەیت بەزیرەکی و بەمەراقەوە گوێ
بۆ پرسیارەکانت دەگرێت و لێکدانەوەی ئەوە دەکات کەئایا تۆ
ژنێکی باشی بۆ هەڵگرتن یان ژنێکی شیاویت بۆ ڕاوی چێژ.

## یاسای ٩٠ ڕۆژ

١٩٧٧ ساڵێکی باش بوو، من لە (کلیڤلەند) دەژیام،
شوقەیەکی نوێم هەبوو، کە پێکهاتبوو لەژوورێکی نووستن،
هێشتا نەمتوانی بوو ئەو سەیارەیە بکڕم کەخۆم حەزم لێی
بوو، بەڵام من هەوڵم دەدا و کارم دەکرد بۆ بەدەستهێنانی
و ئیشم دەکرد لەکۆمپانیای فۆرد بۆ ئۆتۆمبێل، زۆربەی کات
لەوێ ئیشم دەکرد، وچەندین کاتژمێرم لەکارکردندا بەسەر برد،
وە توانیم پارەیەکی زیاتر پەیدا بکەم کەلای کەسێکی وەک من
وەک خەونێک وابوو، بەڵام لەوە گرنگتر، ئەوە بوو کەکۆمپانیای
فۆرد بەخشش(سود و قازانجی زیادە) ی هەبوو، کە نەتدەتوانی
وەری بگری هەتا ماوەیەکی زۆر خزمەتت نەبوایە، دەتوانیت
موچەکەت وەربگریت، بەڵام نەتدەتوانی بەخشش وەر بگریت:
هەتا فەرمانبەرێکی چالاک نەبیت وکاتی تەواوەتی خزمەت
نەکەیت و هەتا بەخشش وەر نەگریت نابیت بەیەکێک لە
کارمەندە هەمیشەییەکان.

دابینکردنی بیمەی دڵنیایی تەندروستی: ئەوەیە کەئەو
شوێنی کارکردنە بڕێک لەموچەی کارمەندەکە دەبڕن تاوەکو
هەموو خەرجیە تەندروستیەکانی بگرنە ئەستۆی خۆیان، بەڵام
دەبێت لەوماوەی کە ئەوان دیاریان کردووە بۆی، تاخزمەتی

تەواوەتی بکات، تاوەکو ئەم هەلە بیگرێتەوە.

سیستەمی کارکردنی کۆمپانیای فۆرد وابوو، کەدەبێت بەلایەنی کەمەوە بۆ ماوەی ٩٠ ڕۆژ کار بکەیت، پێش ئەوەی دڵنیایی تەندروستیت بگرنە ئەستۆ: بەڕێوبەرایەتی کۆمپانیاکە پێی ووتم: ئێمە قازانجی زیادەت بۆ دابین دەکەین. دوای ئەوەی کەمن بەسەختی کارم کردو خۆم سەلماند، لە کاتی دیاریکراودا ئامادەبم و گوێڕایەڵی فەرمانەکان بم و خۆم بگونجێنم لەگەڵ هاوپیشەکانم بۆ ماوەی ٩٠ ڕۆژ، دوای ئەوە دەتوانیت چارەسەری پزیشکی و تەندروستی وەربگریت، وە دەتوانیت داوای پزیشک بکەیت بۆ پشکنینی چاوەکانت_کێشە نیە_ ئێمە گرنگیت پێ دەدەین گەر توشی هەر گرفتێکی تەندروستی بویتەوە، ئێمە گرنگی بەتەندروستی تۆ چاو و ددانی منداڵەکانیشت دەدەین، ئەگەر ژنیشت هەبوو ئەوا گرنگی بەتەندروستی ئەویش دەدەین، وە ئەگەر کێشەی ددانی هەبوو چارەسەری دەکەین، گرنگی بەهەر منداڵێکی دیکەش دەدەین کە لە داهاتوودا دەیخەنەوە، لەگەڵ ئەوەش گرەنتی خێزانەکەت دەکرێت پاکێجی قازانجی زیادەشت بۆ دابیندەکەین.

ئەزانی چی؟ هەموو ئەمانە بۆمن ڕوون بوو. من تەحەدام کرد تانیشانی هەموو کارمەندەکانی بدەم کەمن جدی و ئامادەم بۆ کارکردن، تا موچە وەربگرم و سودمەندیش بم لەدابینکردنی خەرجیەکانی تەندروستی پزیشکی و ددان، منیش وەکو پیاوێک پێویست بوو وە دەشمویست خۆم بسەلمێنم کەئامادەم بۆ تەحەدا و شایەنی وەرگرتنی پاداشتم. ڕازی بووم بەمەرجاکانی کۆمپانیای فۆرد، و واژۆم لەسەر ڕێکەوتنەکە کرد، دەمویست ببم بە بەشێک لەخێزانی فۆرد.

ڕۆژی یەکەم کە موچەکەمم وەرگرت، سەرپەرشتیارەکە هات بۆ لام و ووتی: «ئەوە چەکی پارەکەیە، سوپاس بۆ ئامادەبوونت›› چەکی پارەکە نایاب بوو، بەڵام نەمدەتوانی چاوپێکەوتنی دکتۆر دابنێم لەکاتێکی نزیکدا، من هەوکردنی ددانم هەبوو_نەفرەت ،دوو ددانی پێشەوەم دەلەقی و خەریک بوو دەکەوتنە ناو دەمەوە___بەڵام نەمتوانی هیچ چاوپێکەوتنێک دانێم بۆ لای دکتۆری ددان لەماوەی ئەو ٩٠ ڕۆژەدا___ چونکە کۆمپانیای فۆرد پێشتر پێیان وتبوم کەخۆم بسەلمێنم بۆ ئەو کەسانەی کەئیمزا لەسەر چەکی پارەکە دەکەن، لەپێناو بەخشش وقازانج.

هاوکێشەیەکی زۆر سادە بوو: بەسەختی کار بکە، خۆت بسەلمێنە و قازانجەکە وەربگرە.

ئەزانی چی؟ هەمان شتیشە بۆ کارە حکومیەکان، وەکو نوسینگەی پۆستە و فەرمانگەکانی تۆمارکردنی تۆتۆمبێل ___ تەنانەت هەندێک لە کۆمپانیاکانیش دەبێت خۆت بسەلمێنیت تا شتی باش و شتی زیادە و پاداشتی زیاتر بەدەست بهێنیت.

کەواتە ئەگەر کۆمپانیای فۆرد و حکومەت هیچ بەخششێک نەدەن بەپیاو هەتا ئیش نەکات و خۆی نەسلمێنێت، کەواتە ئێوەی خانمان بۆچی بەخشش ئەدەن بەپیاوان پێش ئەوەی خۆیان بسەلمێن کەشایەنی ئەوەن؟

دەی، ئێوە دەزانن مەبەستم لەچییە لە( بەخشش). مامەڵەی باش و خواردن دروست کردنە بۆی، یان چونەدەرەوە لەگەڵی بۆ نانی ئێوارە یان یارمەتی بدەی لەهەڵگرتنی جلەکانیدا و بانگێشتیماڵەوەی بکەی تا بە دایکتی بسەلمێنیت، مەبەستم ئەم شتانە نیە، ئەم شتانە لەمیانەی سەرەتای پەیوەندیەکەتاندا

ڕوودەدات___هەردووكتان شتی تایبەت بۆ یەكتر دەكەن چونكە گرنگی بەیەكتر دەدەن.

من مەبەستم لەبەخشین پەیوەندی سێكسیە، ئەگەر تۆ بەخشش بدەی بەپیاوێك كەتەنها هەفتەیەك یان دوو هەفتەیە ناسیوتە، ئەوا هەڵەیەكی زۆرگەورە دەكەیت. تۆ ئەو پیاوە ناناسیت___هەرچۆنێك بێت زۆریش نازانیت لەبارەیەوە. ئەو ناتناسێت، خۆی نەسەلماندووە بۆت، و لەوانەیە لەهەر ساتێكدا بێت جێت بهێڵێت، بێجگە لەخۆت سەرزەنشتی كەسی تر مەكە.

بیری لێبكەرەوە: ئەو پیاوەی كە لەگەڵی خەوتی پێش تێپەڕبوونی ٩٠ ڕۆژ بەسەر یەكەم چاوپێكەوتنتاندا، ئێستا لەكوێیە؟ گرەو دەكەم كە چیتر پەیوەندیت لەگەڵی نەماوە. ڕاستە هەندێ كەس هەن، لێرەو لەوێ زوو پەیوەندی سێكسیان كردووە و كەچی تا ئەمرۆش هەر پێكەوەن ماون، بەڵام ئەم جۆرانە زۆر دەگمەنن.

زۆربەی كات ئەو پیاوەی كەسێكس لەگەڵ ژنێك دەكات، بەبێ ئەوەی هیچ هەوڵێك بدات تاخۆی بسەلمێنێت، ئەو ژنە بەجێدەهێڵێت و دەڕوات، بنیادنانی بۆ پەیوەندیەكی ڕێك و پێك لەگەڵ ژنێكدا كە بەجۆرێك لە جۆرەكان تاقی دەكاتەوە بۆ ماوەیەكی درێژ، تا زیاتری لەبارەوە بزانێت.

من دڵنیام كەئەو ژنە هەر زوو یاساو بنەمای خۆی داناوە لەسەرەتاوە و دەسگیرانەكەی سەرپشك كردووە كە بەبنەماكانی ڕازی دەبێت، یان بڕوات بەڕێی خۆیدا، ئەم جۆرە زانیاریانە، ئاماژەیەك دەدات بەپیاو كە تۆ یاری دەستی هیچ كەسێك نیت___و لە ڕێی ئەم زانیاریانەوە تێدەگات كە ئەو شتانەی هەتە___بەخششەكانت___ شتگەلێكی تایبەتن لای

تۆ، تۆش پێویستت بەکاتە تا ئاشنای ئەو پیاوەو شێوازەکانی ببیت، تا بڕیار بدەی بزانیت ئایا شایەنی بەخششەکانتە یان نا.

ئەو پیاوەی کەئامادەیە کاتی خۆی بۆ داواکاریەکانت تەرخان بکات، ئەوە ئەو پیاوەیە کەدەتەوێت لەگەڵی بمێنیتەوە، چونکە ئەو پیاوەش بە هۆشەوە بڕیار دەدات، ئەویش کاتی نیە لەیاریکردندا بەفیڕۆی بدات، و لەگەڵ ئەوەش هەموو شتێک دەکات نەک بۆ مانەوەی کارەکەی، بگرە بەرەو پێشی دەبات وشانازی دەکات کە سودمەند بێت لە بەخششەکانت.

لەو کاتەدا تۆ خەڵاتە گەورەکە دەبەیتەوە، پارێزگاری لەگەورەیی خۆت دەکەیت و ڕێزی خۆت دەهێڵیتەوە، و ڕێزی ئەو پیاوەش بەدەست دەهێنیت کەدەزانێت تۆ بەڕاستی شایەنی ئەوەی کەچاوەڕێت بکات، هەرچەند کات بخایەنێت.

بێگومان، دەبێت ٩٠ ڕۆژەکە بەدانایییەوە(ئاقڵیەوە) بەکاربهێنیت: ئەمە ماوەی تاقیکردنەوەیە، هیچ سودێکت پێناگەیەنێت ئەگەر ئەم پیاوە هەڵنەوەشێنیت و بۆت دەرنەکەوێت کە کەسێکی چۆنە، لەماوەی ٩٠ ڕۆژدا تۆ پێویستە بیپشکنیت: کاتێک دەڵێت دێم و کاتێک دوادەکەوێت وپەیوەندی ناکات، ئایا هاوڕێکانتی خۆش ئەوێت، ئایا گرنگی بە هاوڕێکانت دەدات: ئەگەر منداڵت هەبوو ئایا خۆشی دەوێن و گرنگیان پێدەدات: ئایا خۆشی دەردەبڕێت لەبەرئەوەی ئێستا لەگەڵ تۆدایە؟ بەلام لەهەمووی گرنگتر ئایا ئەو پیاوەیە کەوێنای خۆت بکەیت پەیوەندیت لەگەڵیدا هەبێت؟ یان ئایا ئاماژەیەک هەیە کەهەستێکی بەهێزت پێ ببەخشێت و وات لێبکات لەژیانت بیخەیتە دەرەوە؟

ئەزانی چۆن؟ بۆ نموونە: تا ئێستا بانگهێشتی کردووی

بۆ ماڵی خۆیان، و تەنها ژمارەی مۆبایلەکەیت لایە، وەڵامی تەلەفۆنەکەی ناداتەوە کاتێک لەگەڵ تۆدایە و ئەگەریش وەڵام بداتەوە دەنگی نزم دەکاتەوە لە سوچێکدا، تاوەکو تۆ گوێت لێی نەبێ ــ ئەو پێت دەڵێت کە لەگەڵ ژنێکی دیکەدایە، یان خۆت بەجۆرێک ئەوەت بۆ دەردەکەوێت.

ئەمانە هەستیاری و مەیلن، تۆ ناتوانیت پیاوێکت بۆ دەربکەوێت کە کەمتر لە ۹۰ ڕۆژە پەیوەندیت لەگەڵی هەیە، ئەزانی بۆ؟ چونکە ئەو پیاوەی کە تەنها بۆ دەستکەوتنی بەخششەکانت پەیوەندیت لەگەڵ دادەنێت لەسەرەتادا بەباشترین شێوە ڕەفتار دەکات، تا وات لێبکات وا بزانیت کە کەسێکی شایستەیە، بەڵام بێگومان لەکۆتایدا ڕووی ڕاستەقینەی خۆی دەردەخات.

بەلایەنی کەمەوە ۹۰ ڕۆژ بدە بەو پیاوە، ئەوکات دەتوانیت بۆنی هەموو بیرکردنەوەکانی بکەیت و دڵنیا ببیتەوە کە پیاوێکی گونجاوە بۆت یان نا.

مافی خۆتە داوای ئەوە بکەیت کەدەتەوێت ــ وە بەتەواوەتیش بەدەستی بهێنیت: ٥ پرسیارەکەی لێبکە(هەر وەک لەبەشی پێشتردا باسکرا)، وە ڕێگری بکە لەپێشکەشکردنی بەخششی زیادە و ڕێزی خۆت بگرە.

ئەگەر تۆ ڕێزێکی زۆر لەخۆت بگری، ئەوا ئۆتۆماتیکی ئەو پیاوە ئاڕاستە دەکەیت کە ڕێزت بگرێت. لێی گەڕێ با خۆی بسەلمێنێت تابەخششەکانت بەدەست بهێنێت، گرەنتیت دەکەم کەتۆ باشترین پیاوت دەست دەکەوێت ــ کاتێک قایل بوویت ئەو شایەنی ئەوەیە بەخششەکانتی بدەیتی، دەتوانیت وەکو ساندویچیک پیشکەشی بکەیت لە سەیراندا.

چاوەڕێ بکە: دەزانم بیر لەچی دەکەیتەوە: بیر لەوە

دەکەیتەوە کە ئەگەر سێکسی دەست نەکەوت لە تۆوە، ئەوا دەڕوات و لە شوێنێکی تر بەدەستی دەهێنێت، وە تۆش تاکە چانسی خۆت لەدەست دەدەی تا بیکەی بە هی خۆت___یان وا بیر دەکاتەوە کەتۆ یاری پێدەکەی ئەگەر وات لێکرد چاوەڕێ بکات، وە دەڕوات بۆ لای ژنێکی تر تا پێوەی خەریک ببێت.

## تۆ هەڵەیت.

لەڕاستیدا ئێمەی پیاوان یەکێک لەو بیرکردنەوانەی تۆ بەکار دەهێنین، تا ژنان ناچار بکەین چاوەڕوانیکردن گونجاو نیە، و پێویستە بەخێرای و بەزوویی خۆیان بدەن بەدەستەوە، گوێم بۆ ڕابگرە، ئەگەر ئێمەی پیاوان بتوانین بەئاسانی بڕوات پێ بهێنین تا لەگەڵت بخەوین هەر لە ٥ خولەکی سەرەتاوە، لەیەکەم بینیندا، ئەوا دڵنیابە کەئێمە ئەگەر بتوانین ئەو کارە دەکەین، وە ئەمەش نهێنی نیە: پیاوان خۆشەویستی دەکەن و سێکسیشیان دەوێت، هەوڵیشی بۆ دەدەن (بێگومان لە سنوری خۆیدا)، تا پێی بگەین بە هەر ڕێگایەک بێت.

## ئەزانی چی؟

ئەو دەتوانێت چاوەڕێ بکات. بەڵێ بەدڵنیاییەوە ڕاستە، تۆ سەرکێشی ترساندنی دەکەیت، بەڵام ئایا ئەو پیاوەی کە لەگەڵی نووستوویت بەبێ هیچ پابەندبوونێک یان تێڕامانێک، لە ویستەکانت و پێداویستیەکانت و باری سۆزداریت، ئەو پیاوەیە کە دەتەوێت بڕوات و بەجێت بهێڵێت؟ ئایا ئەوە ناهێنێت کە شتێکی تایبەت تەرخان بکەیت بۆ ئەو پیاوەی کە بەڕاستی شایەنی بەخششەکانتە؟

تۆ هێزی ئەوەت هەیە کە وای لێ بکەیت چاوەڕێت بکات، تا بۆت بسەلمێنێت کەشایەنی خۆشەویستی و سۆزی تۆیە.

بەم شێوەیە بیری لێ بکەرەوە: کاتێک دێتە سەر ئەوەی کەئێمەی پیاو سێکس لەگەڵ ژنێکدا بکەین، ئێمە بڕیار لەو شتە نادەین و ناتوانین دیاری بکەین کە کەی ئەو کارەمان لەگەڵ دەکەی ــــ ئەم بڕیارە بەدەست ئێوەیە خانمان.

بڕیاری ئەوەی کەی ماچت بکەین، وە کەی یەکتر لەباوەش بگرین؟ هەموو ئەمانە بڕیاری تۆیە و بەدەست تۆیە.

ئێمە دەست لەسەر بەشێکی لەشت دادەنێین، بۆ نموونە دەست دەخەینە سەر شانت، تۆ بڕیار دەدەی ئەگەر دەستمان لەسەر شانت بمێنێتەوە، یان دەستمان لا ببەیت، کاری ئێمە ئەوەیە کە ڕازیت بکەین(قایل) تا ئەوەمان پێ بدەی ــــ تا ڕێگامان بدەی دەستت لێ بدەین و ببین بە خاوەنی. بەڵام بڕیارەکە لە کۆتایدا بڕیاری ت.ۆ.ی.ە.

لەبەرئەوە دەستبەرداری ئەم هێزە مەبە، وە بیپارێزە، دەستبەرداری مەبە هەتاوەکو پیاوێک نەبێت کە شایەنی بێت و ڕێزی بگرێت و لەبەرامبەریدا شتێکت بۆ بکات.

## ئەوە ڕاستیە.

ژنان چەندین ئیمپڕاتۆریەتیان هەرەس پێهێناوە، بەهۆی ئەم هێزەوە، ئەم هێزە یارمەتی کیلۆپاترای دا کە ڕۆما خاپور بکات، ئینجیل بخوێنەرەوە دەڵێ: « ئێمە ئێستاش گیرمان خواردووە بەهۆی حەواوە.»

ژن هەر لە کۆنەوە خاوەنی ئەم هێزە بووە، و تۆش خاوەنی ئەم هێزەیت ــــوە دەتوانیت وا لەو پیاوە بکەیت کەپەیوەندیت

لەگەڵی هەیە چاوەڕێت بکات تا بەخششەکانت بەدەست بهێنێت.
ئۆو بەڵام من ناڵێم کە ناتوانیت هیچ ببەخشیت بە پیاو: بۆ نموونە دەتوانیت کەمێک بەخششی بچوکی پێ بدەی لەماوەی ئەم ٩٠ ڕۆژەدا، دەتوانیت باوەشی پێدا بکەیت و ماچی بکەیت، وە بەتەلەفۆن قسەی لەگەڵ بکەی و بڕۆن بۆ پارک تا پیاسە بکەن پێکەوە، ئایسکرێم بخۆن، وبڕۆنە دەرەوە بۆ نانی ئێوارە، وە ئەو کاتەی کە لەگەڵی بەسەر دەبەی، وەکو بەخششێک وایە، وە ئێمە کاتێک لەگەڵت دێین بۆ خواردنی ژەمی ئێوارە، ناتوانیت وێنای بکەیت کە چەند تامەزرۆی بینینتین، تا ببینین لەماعت داوە لە لێوەکانت و دەدرەوشێنەوە، وە چاوەکانت ڕشتووە و قژت لوول کردووە، یان هەر وەک خۆی بەرت داوەتەوە___وە دەدرەوشێیتەوە، ناتوانم پێت بڵێم چ بە ئاوات گەشتنێکە کەدەزانین کاتی تۆمان بەدەستهێناوە. وە دەرکەوتن بەئاشکرایی لەگەڵ تۆدا هەر بۆ خۆی بەخششێکە بۆمان: ئەمە هەموو ئەو چەسپاندنەیە کەئێمە دەمانەوێت و ئەوە بەخشینێکی باوەڕ پێنەکراوە.

لە باوەشکردن؟ بەخشینە

ماچکردن؟ بەخشینە

ڕێک پۆشیت؟ بەخشینە

هاتنە دەرەوە لەگەڵمان؟ بەخشینە

وە گۆڕینەوەی نامەی ئەلکترۆنی؟ بەخشینە

بەڵام ئەگەر ویستی لەگەڵت بخەوێت ___وە منداڵ بخاتەوە، خێزان درووست بکات؟ ئەمانە بەخششن (قازانج___ سوود) جیاوازن لە بەخشین.

پیاو ٩٠ ڕۆژی لەبەردەستدایە تاخۆی بسەلمێنێت، بەو

ماوەیە تۆ دەتوانیت ئەو پیاوەت بۆ دەربکەوێت، وادابنێ تۆ لێکۆڵەریت ـــچونکە هیچ کەسێک وەکو ژن ناتوانێت ڕاستیەکان ئاشکرا بکات. تۆ پۆلیس شەرمەزار دەکەیت و فیلێکی بچووکی لێکۆڵینەوە دەکەیت، کە لەبەرنامەی «لاو ئاند ئۆردەر» ، (سی ئێس ئای) پشاندراوە کەبەشی ژماردن وابوو لەبەرنامەی سی سەم ستریت، تۆ دەتوانیت هەندێک شت لەبارەی پیاوەوە ئاشکرا بکەیت کە لەوانەیە خۆشی نەیزانیبێت. کەواتە دەستبەکار بە، کەمێک لەو سیناریۆیانە بەکار بهێنە کەیارمەتیدەرت دەبێت لەتێگەیشتنی ناسنامەی ئەو پیاوە تا بزانیت، کە تا ئەو ڕادە باشە، کە شایەنی بەخششەکانت بێت. ئەمانە کۆمەڵێک شتن کە لەوانەیە بتەوێت دەری بخەیت کاردانەوەی چۆنە، کاتێک پێی دەڵێیت کەمێک کێشەم هەیە؟

لەوانەیە سەیارەکەت بشکێت، یان بۆیلەری ماڵەکەت دوا هەناسەکانی دەدات، یان خەریکە منداڵەکانت لەدەست دەردەچن، تۆش توانات بەسەریاندا ناشکێت، تۆ نیگەرانی و شەکەتی بە ڕووخسارتەوە دیارەـــوە ئەو دەتوانێت لەدەنگدا گوێی لێ بێت، وە ئەگەر لێی پرسی: «کێشە چیە؟»، ئەوە دەستپێکێکی باشە، چونکە ئەو ماوەیەکی باش لە نزیک تووە بووە، تا بزانێت کەتۆ لەدۆخی ئاسایدایت یان نا، ئەمە بەرەو پێشچوونە، بەڵام ئەگەر تۆ شتێکی لەم شێوەیەت پێ ووت: «ئۆتۆمبێلەکەم شکاوە و پارەم پێ نیە تا ئێستا چاکی بکەمەوە، لەبەرئەوە کەمێک نیگەرانم بەیانی چۆن بڕۆم بۆ کارەکەم» ، وە ئەگەر ئەو پیاوەش ووتی: «زۆر باشە، پەیوەندیم پێوە بکە کە چارەسەرێکت بۆ دۆزییەوە»، ئەو کات دەتوانیت دەست بەجێ لە لیستی بەخششەکانتدا ڕەشی بکەیتەوە، ڕاشکاو بە: تۆ

داوای پارەی لێ ناکەیت تا ئۆتۆمبێلەکەتی پێ چاک بکەیتەوە، تۆ تەنها دەتەوێت ببینیت ئایا هەوڵدەدات کێشەکە بە قوڵی چارەسەر بکات، وە بزانیت ئەتوانیت شتێک بکات تا یارمەتیت بدات، چ لەڕێگەی ئامۆژگاری کردنەوە بێت یان ڕاستەوخۆ بێتە ناو بابەتەکەوە، و یارمەتیت بدات لەچارەسەر کردنیدا.

ئایا بۆ نموونە پێی ووتی کە کاتژمێرێک زووتر هەڵدەستم تا بەیانی بتگەیەنمە سەر کارەکەم، چونکە ئۆتۆمبێلەکەی تۆ لە وەرشەیە؟ ئایا ژمارەی کەسێکی داپێت تا ئۆتۆمبێلەکەت بۆ چاک بکاتەوە بە نرخێکی هەرزانتر؟ ئایا پێشنیاری ئەوەی بۆ کردی کەخۆی بۆنیدی سەیارەکە بکاتەوە و سەیرێکی ئۆتۆمبێلەکە بکات؟ یان پێی ووتی کە هاوڕێیەکی هەیە وەرشەی ئۆتۆمبێلی هەیە و لەوانەیە چاکەیەک بکات لەگەڵ من___تۆدا؟

پیاوی ڕاستەقینە خۆیان ماندوو دەکەن لەپێناو ئەو ژنەی کە گرنگە بۆیان. ئەگەر تۆ کێشەیەکت هەبوو پیاوەکەشت هیچ خۆی سەخڵەت نەکرد___وە هەوڵی باشترکردنی دۆخەکەی نەدا___کەواتە پاڵێوراوێکی باش نیە بۆ بەخششەکانت.

بەلام ئەو پیاوەی کە پاڵدەکەوێت لەسەر پلێتێک ودەچێتە ژێر ئۆتۆمبێلەکەوە، دوای کاتژمێرێک هەموو کراس و دەستەکانی و ڕووخساری هەڵکێشاوە لەگریس تا ئۆتۆمبێلەکەت چاک بکات، ئەوە لەوانەیە ئەو پیاوە بێت کەشایەنی خواردنەوەیەکی سارد و دواتریش هەندێک بەخشش بێت.

## پیاوەکەت کاردانەوەی چۆنە کاتێک لەژێر فشاردایە؟

با بڵێین یەکێک لە هاوڕێ کۆنە کوڕەکانت دووبارە دەستی کردەوە بە تەلەفۆن کردنەوە بۆت، تۆش پێتناخۆشە، چونکە جیابوونەوە لێی زۆر سەخت بوو بۆت، تۆ بەکورتی تەنها ناتەوێت هیچ پەیوەندیەکت پێوەی بمێنێت، وە بە پیاوە تازەکەت دەڵێیت کەئەمە بێزاری کردویت و نازانی چۆن لەخۆتی دوور بخەیتەوە، ئەو پیاوەی کە شایەنی بەخششە خێرا هەوڵی «چارەسەر» کردنی دەدات، وە سەیر دەکات بزانێت چی پێ دەکرێت:

ا_پیاوەکە دەوەستێنێت لەپەیوەندی کردن پێتەوە.

ب_داوات لێدەکات تۆ دووبارە هەست بەئاسوودەی و پارێزراوی بکەیت و، لەوانەیە شتێکی لەم شێوەت پێ بڵێت: «جاری داهاتوو کە پەیوەندی کرد، با من قسەی لەگەڵ بکەم» لەوانەیە ئەمە کەمێک زیادەڕەوی بێت، بەڵام هەندێک پیاو هەن کەدێنە سەر هێڵ و داوا لە هاوڕێ کوڕەکەت دەکەن کە سنوری خۆی بزانێت. یان هاوڕێ تازەکەت هەندێک پێشنیارت بۆ دەکات بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دۆخەکەدا، وەکو لەوانەیە پێت بڵێت ئەو ژمارەیە بلۆک بکە، یان زەنگێکی تایبەت بخە سەر ژمارەکەی تا وەکو کاتێک پەیوەندی کرد بزانی ئەوە، یان لەوانەیە هەندێک شتت پێ بڵێت تا بەو پیاوەی بڵێیت بۆئەوەی جارێکی تر پەیوەندی نەکات. ئەمە دۆخی فشارە: پێویست ناکات هیچ کارێک بکات، بەڵام دەبێت کاردانەوەی هەبێت ئەگەر پیاوە تازەکەت شتێکی لەم شێوەی ووت: « من ناتوانم خۆم هەڵقورتێنم لەم بابەتەدا»

کەواتە ئەو کاندیدێکی باش نیە بۆ دەستکەوتنی بەخششەکانت. تۆ ڕووبەڕووی فشار دەبیتەوە لە پەیوەندیەکەتدا بەبەردەوامی، لەبەرئەوە دەبێت پێشتر بزانیت، خێرا، کە ئایا ئەو پیاوە ئامادەیە بۆت چارەسەر بکات، ئایا شێوازی پارێزگاری وە چارەسەرکردن دەگرێتەوە ئەگەر وای کرد تۆ بەهی خۆی دەزانێت وە لەوانەیە شایستەی بەخششەکانت بێت.

## کاردانەوەی چۆنە بەرامبەر هەواڵە خراپەکان؟

با بڵێین کەسێکی نزیکت و خۆشەویستت لەدەست داوە، ئەو پیاوە پلانی بۆت هەیە خێرا پێشنیاری جۆرێک لەیارمەتی و ئاسودەیت بۆ دەکات، تا کاتی خۆت وەربگریت و ناخت بەتاڵ بکەیتەوە، لەوانەیە پێت بڵێت دەتوانێت منداڵەکانت ببات بۆ پیاسە بۆ ماوەی دوو کاتژمێر، تا تۆ کاتی خۆت وەر بگریت. یان لەوانەیە پێت بڵێت دەتوانێت بێت لەگەڵت بۆ شوێنی پرسەکە، تا لەگەڵت بێت کاتێک ئامادەکاری پرسەکە دەکەن و تا بتوانێت سەرەخۆشی لەخێزانەکەت بکات. تێبینی بکەن خانمەکان دڵنیابە ئەمە ئیشی ئەو پیاوە نیە دابنیشێت و ڕێگە بدات ئەو ژنەی خۆشی دەوێت بیر لەیادەوەریەکانی بکاتەوە لەگەڵ ئەو کەسەی کە منداڵیی خۆی لەگەڵ بەسەر بردووە لەدڵیدا شیرینە. پیاوی ڕاستەقینە هەوڵ دەدات دۆخێکی وا دروست بکات تا تۆ چیتر نەگریت. چونکە هیچ پیاوێک نایەوێت ژنەکەی ببینێت کە دەگری. بەلام ئەگەر ئەو پیاوە بەلایەوە گرنگ نەبووـــــوە هیچ چارەسەرێکی نەدۆزییەوە تا حالی تۆ باشتر بکات، کەواتە پێویستە دووری بخەیتەوە و هیچ مافێکی نیە تا بەخششی پێ بدرێت.

ئەو پیاوەی شایەنی بەخششەکانتە، ئامادەیە لەگەڵت بێت ئەگەر باروودۆخ هەرچەند خراپیش بێت، ئەگەر کارەکەت لەدەستدا، یان بووی بەژێر هەندێک خەرجیەوە، چونکە تۆ پێویستە دۆخێکی دارایی دژوار و چاوەڕوان نەکراو چارە بکەیت. ئەو دەزانێت کەچەند پێویستیت بە یارمەتییە و لەئاستی بەرپرسیاریەتیدا دەبێت، ئیتر ئەگەر بە پێدانی بڕێک لەپارە بێت تاهەندێک لەقەرزەکانت بدەیتەوە، یان بەکڕینی هەندێک لەسەوزە و میوە بێت بۆت، یان بەپڕکردنی تانکی گازی ئۆتۆمبێلەکەت بێت.

## کاردانەوەی چۆنە کە پێی دەڵێیت «نەخێر» ؟

با ڕاستەوخۆ خێرا بچینە ناوەڕۆکی بابەتی ئەم بەشەوە: کاتێک پیاو داوای سێکس دەکات، پێی دەڵێیت «نەخێر»، لەکاردانەوەیەوە هەموو ئەوەت بۆ دەردەکەوێت کەدەتەوێت بیزانیت، ئەگەر چیتر پەیوەندی پێوە نەکردی یان زۆر کەم کردی، وە چەپکە گوڵی بۆ نەناردی، وە ژوانی کەم کردەوە لەگەڵتدا، تکایە تێبگە کەئەو پیاوە تەنها ئامانجی سێکس بووە، وە ئەگەر شتێکی بێ مێشکانەی لەم شێوەیەی پێ ووتی: «من پێویست ناکات چاوەڕێی سێکس بکەم. چونکە دەتوانم لەهەر ژنێکی دیکەوە بێت دەستم بکەوێت›› وە تۆش وەڵامی بدەرەوە و پێی بڵێ: «تکایە، بیکە» ئەم ڕستە وا لەلاتوپووتەکان دەکات خێرا هەڵبێن. بەڵام ئەگەر ڕەتکردنەوەکەت ساردی نەکردەوە و هێشتا هەر هەوڵیدا بەباشی تۆ بناسێت و خۆی سەلماند کەشایەنی بەخششەکانتە، ئەوا بەڕاستی ئەو گرنگیت پێدەدات، بەهەڵە لێم تێمەگە: ئەو هێشتا گرنگی بەسێکس دەدات، بەڵام

گرنگیش بەزانینی هەستی تۆ و ئەو کاتەی کەپێوەی پابەندی دەدات. ئەوکات پەیوەندیەکە بەو شێوە دەبێت کەتۆ پێویستە ودەتەوێت. وە تۆش هەر بەدوای ئەوەوەیت، وانیە؟

## هەر بەو ئاسانیە نیە.

ئێستا، دەزانم ماوەی ٩٠ ڕۆژەکە تا ڕادەیەک ماوەیەکی دوور و درێژە، وە تۆش پێویستت بەشتێکی داهێنەرانەیە، تاوەکو سەرنجی لای خۆت وپەیوەندیەکەتان بهێڵیتەوە، لەبەرئەوە لیستێکم درووست کردووە کە پێکهاتووە لەوشتانەی تۆ دەتوانیت لەگەڵ پیاوەکەت بیانکەیت، تا یارمەتی خۆت و ئەویش بدەی سەرنجتان لای پەیوەندیەکەتان بمێنێتەوە.

١_ پێکەوە بڕۆن بۆ ژوان، تا یارمەتیدەرتان بێت خولیاکانی یەکتر بزانن: ئەگەر ئەو پیاوە حەزی لە فۆتۆگرافەری بوو، ئەوا پێکەوە بڕۆن بۆ پێشانگایەکی فۆتۆگرافی، وە ئەگەر تۆ ئارەزووی چێشتلێنانت هەیە: ئەوا بڕۆن بۆ وانەی فێربوونی چێشت لێنان.

٢_ ئاهەنگێکی گۆشت برژاندن لەماڵی خۆتان ڕێک بخەو ئەویش بانگهێشت بکە، تا بەهاوڕێکانت و خێزانەکەتی بناسێنیت: پیاوی باش دەبێت ئاسودەبێت بەناسینی ئەو کەسانەی کەخۆشت دەوێن.

٣_پێکەوە بڕۆن بۆ کڵێسە: بزانە بەلایەوە گرنگە یان نا.

٤_بڕۆن بۆ خولی فێربوونی سەمای لاتینی سەرنجڕاکێش، تا هەندێک جوڵەی نوێ فێر ببن ــــ ئەو نیشانتی دەدات ئەگەر ئەو حەزی لە فێربوونی شتی نوێ بێت یان کەسێکی لەش قورسە.

٥_ پێکەوە لەگەڵ منداڵەکان بچن بۆ سەیران بۆ پارکێک: بزانە لەگەڵ منداڵەکان ئاسودەیە یان نا.

٦-بزانن هەریەکەتان حەزتان لەدەنگی چی هونەرمەندێکە: وە پێکەوە بڕۆن بۆ کۆنسێرتێک.

٧_ کەمێک منداڵی ناخی خۆتان بدۆزنەوە: وە شەوەکە بەکردنی یاریەوە بەسەر ببەن.

٨_هەندێک شت «بۆ یەکەم جار›› پێکەوە بکەن: بڕۆن بۆ ئەسپسواری، بڕۆن بۆ شاری یاری، وە یاری سەربەخۆ تاقی بکەنەوە.

٩_کاری خۆبەخشی بکەن: یارمەتی پێشکەشبکە بەچێشتخانەیەکی خێرخوازی، پەرتوک بۆ منداڵان بخوێنەرەوە لەخانەی بێ سەرپەرشتان، وە دەتوانیت بۆت دەربکەوێت کەئەو پیاوە حەزی لەیارمەتیدانی کەسانی دیکەیە یان نا.

١٠_ئۆتۆمبێلێک بگرن کە سەقفەکەی بکرێتەوە: وە گەشت بەدەوری شاردا بکەن وکاتێکی زۆرتان دەبێت تا قسە بکەن لەو ماوەیەدا.

١١_شوێنێکی ئارام بدۆزنەوە کەبتوانن پێکەوە سەیری ئاوابوونی خۆر بکەن.

١٢_یاری شەترەنج و زار (یاریەکانی سەر تەختە) بکەن.

١٣_بڕۆن بۆ پیاسە کاتێک ئاسمان ساماڵە و ئەستێرەکان دەدرەوشێنەوە.

١٤_نامەی ئەلکترۆنی بۆ یەکتر بنێرن: هەتا هەردووکتان بزانن کە چێژ وەردەگرن و باش دەڕۆن (وە بەوشێوەیە بۆت دەردەکەوێت کەئەو پیاوە خوێندەوار و لێزانە لەو کارانەدا).

١٥_هەردووکتان خۆشترین بەشی ئەو کتێبەی کەحەزتان

لێیە بۆ یەکتری بخوێننەوە.

١٦_شەوێکی سینەمایی بخولقێنن: هەردووکتان خۆشترین دی ڤی دی یەکانتان بهێنن.

١٧_ بڕۆن بۆ تۆمارگاو گوێ لەباشترین هونەرمەندەکانی یەکتر بگرن.

١٨_ ڕکابەری یەکتر بکەن لەکردنی شتی شێتانەدا: وەکو درووستکردنی قەڵای لمی لەکەنار دەریا و یاری کۆنکان و مەڕمەڕ.

١٩_سەیری بەرنامەی کۆمیدی بکەن: لەڕێی ئەوەوە دەزانیت بەچی پێدەکەنێت و چی بەقێزەون دەزانێت.



## __١٢__
## ئەگەر دوای ئەوەی بڕیارت دابوو کە ئەو «کەسە گونجاوەکەیە» ویستت منداڵەکانتی پێ بناسێنیت، ئەوا زۆر درەنگە

با یەک شت ڕوون بکەینەوە، ئەگەر پیاوێک خۆی لێت نزیک بکاتەوە، تەنیا ئەوە دەبینێت کە لەبەردەمیدایە_هەر خەیاڵی لای لاشەتە چۆن دەرکەوتووە لەناو پانتۆڵە کابۆکەتدا، شێوەی قاچت چۆنە لەگەڵ ئەو پێڵاوە بەرزانەدا، لێوت چۆن دەرکەوتوە کەسوراوێکی بریسکەدارت لێداوە، چاوەکانت چەند جوانە کەئەو هەموو شتە ڕەنگاو ڕەنگە لەچوار دەوریدایە. ئیمەی پیاو بەلامانەوە گرنگ نیە کە میکیاجی مارکەی ماک یان بۆبی براون یان مەیبلین یان لۆریاڵ بە کاردەهێنیت، هیچ بەلامانەوە گرنگ نیە لەکوێ دەژیت، یان لەگەڵ کێی تردا بویت، چی جۆرە ئۆتۆمبێلیک بەکاردەهێنیت، چەندێک پارە پەیدا دەکەی و خەرجی دەکەیت، تەنانەت پارەکانیشت لەکێدا خەرج دەکەیت، تەنانەت لامان گرنگ نیە ئەگەر منداڵت هەبێت، وە بەلامانەوە گرنگ نیە کە لە پەیوەندیدا بین لەگەڵ تۆدا لەکاتێکدا تۆ منداڵت

هەبێت، لەڕاستیدا ئێمە تەنها بەدوای یەک شتەوەین، ئەگەر ئەو شتە سەر بگرێت هەرگیز بەبۆنەی منداڵەوە پەیوەندیەکە ناوەستێنین، ئێمە وا بیردەکەینەوە کە چەندجارێک دەچین بۆ نانخواردن، لەوانەیە سەیری فیلمێک بکەین یان بچین بۆ بۆڵینگ، دواتر لەژورێکدا دەبین بەتەنها لەگەڵ سیسەمێکدا، ئەگەر شارەزایی یارییەکەمان ببیت بەچەند هەفتەیەک دەگەین بە ئامانجی خۆمان، منداڵ ؟! تکایە منداڵی چی؟ هەندێک پیاو هەیە هەر گرنگی بەمنداڵەکانیشت نادات، ئەو پیاوەی کەتۆ هەوڵدەدەیت لە پەیوەندیدا بیت لەگەڵی، چیتر گرنگی بەژیانی تۆ نادات وەکو دایکێک، بگرە زیاتر خەیاڵی لای بۆیەی نینۆکی قاچتە، لەڕاستیدا تاکە شت ئەو مەبەستیەتی جووت بوونە لەگەڵ تۆ، نەک زیاتر، دوای ئەوەی بەدەستیهێنا هیچ بەتەمای ئەوە نیە کەچاوی بەمنداڵەکانت بکەوێت.

وە هەرکە ئەوەی دەستکەوت کە بەدوایەوە بوو، ئۆو، بڕوا بکە پلان دادەنێت چۆن دەرباز بێت لێت.

ئەوەی کەزۆر ڕوودەدات ئەوەیە کەتۆ وەکو دایکێکی سەڵت پەیوەندی ئەبەستیت لەگەڵ پیاوێکدا، وە بەدرێژایی کاتەکە هێندەی بتوانیت بەدووری دەگریت لەژیانی ماڵەوەت ___ بەتایبەتی لەبەرئەوەی تۆ دەتەوێت پەیوەنیەکەتان و ئاڕاستەی پەیوەندیەکەتان بۆ ڕوون ببێتەوە، چونکە ناتەوێت هەر پیاوێک کەهاتە ژیانتەوە بەمنداڵەکانتی بناسێنیت هەتاوەکو سەدلەسەد دڵنیا نەبیت کەئەو دەبێت بەهاوسەری داهاتووت، کاتێک بۆت دەردەکەوێت کەتۆی بۆ ماوەیەکی درێژخایەن ئەوێت، دوای ئەوە بانگهێشتی ئەکەیت بۆ ماڵەوە بۆئەوەی منالەکانت بناسێت. ڕێک لەوێدا بوەستە.

من لێرەم تا پێت بڵێم دەربارەی ئەمە زۆر هەڵە دەکەیت، تۆ ناتوانیت هەستت بۆ پیاوێک هەبێت یان بەڵێنی زارەکی پێبدەیت، یان بەتایبەتیش بەڵێنی جەستەیی پێبدەیت و لەدوایشدا کەهێناتەوە بۆماڵەوە بۆت دەربکەویت کەمنداڵەکانتی هیچ خۆش ناوێت و منداڵەکانیشت هیچ ئەوییان خۆشناوێت. ئەمە نابێت تۆ لای ئەو پیاوە خۆت زۆر بەسەرنجڕاکیش و بەسەلیقە و وروژێنەر دەربخەیت، بەڵام دوایی کەهێناتەوە بۆ ماڵەکەت دۆخی ماڵەوە شپرزە بێت و منداڵەکانت بپاڕێنەوە بۆ جپسی پەتاتەو بگرین و بەدەنگی بەرز هاواربکەن و ئینجا پێت بڵێن دایبی منداڵە ساواکە پێویستی بە گۆڕینە؟ ئەمە دۆخێکی هیچ باش نیە، خانمان، لەڕاستیدا، یەکتر ناسینەکە درەنگە__بگرە زۆریش درەنگە.

سەیرکە، پیاو پێویستە بەئاشکرا ئەوە ببینێت کە لەداهاتوودا لێی بەرپرسیار دەبێت: ئەگەر ئەو تۆی بینی لەڕۆڵی دایکایەتیدا، وە ئەویش هەوڵدەدات بزانێت کەئایا خۆی دەبینێت لەڕۆڵی باوکدا.

لەمێشکی خۆیدا هەڵیدەسنگێنێت کەئایا دەتوانێت ئەم منداڵانە لە ئەستۆ بگرێت یان تاقەتی ئەو هەموو کێشەو ئاڵۆزیەی هەیە کەبەهۆی ڕۆڵی باوکایەتیەوە توشی دەبێت، یان بەرگەی ئەوە دەگرێت کە منداڵەکان بەرهەڵستی بکەن، وە ئەگەر ویستی ڕۆڵی باوکی دووەم بۆ منداڵەکان بگێڕێت، پیاوانی لەمجۆرە کەبەڕاستی تۆیان دەوێت بەرگەی ئەم شتانەو زۆر لەمانە زیاتریش دەگرن، بەڵام ئەگەر تۆ هەندێک زانیاری لێبشاریتەوە کەپێویستە بزانێت دەربارەی ژیانی داهاتووتان، دوایی بۆت دەربکەوێت کەئەو قبوڵی ناکات وپێشبینی ئەوەی

نەدەکرد، وا بیردەکاتەوە کە هەڵخەڵەتێنراوە، چونکە پێی وابوو کە بەرپرسیارە لەیەک ژن نەک منداڵەکانیشی.

کەدەزانێت لەگەڵ کەسێکدا تێوەدەگلێت، کە کۆمەڵێک ئەرک و بەرپرسیاریەتی جیاواز و پێداویستی چاوەڕوان نەکراوت بۆ دەهێنێت (تێبینی: ئەوە بەس نیە کەپێی بڵێی منداڵت هەیە) لەپاڵ ئەوەشدا، هەتا درەنگ بکەویت لەناساندنی بەمنداڵەکانت زیاتر گومانت لێدەکات کەمنداڵەکان کێشەیەکیان هەیە و تۆ لەبەر هۆکارێک دەیانشاریتەوە لێی. ئەم کارە نیگەرانیەکانی زیاتر دەکات، سەبارەت بە چاوپێکەوتنی یەکەم: لەمێشکی خۆیدا وا بیر دەکاتەوە کەتۆ کۆبونەوەکەت بەرزکردوەتەوە بۆ ئاستی جی ٨ ی لوتکە، هێزی زیاترت داوە بەیەکتر ناسینەکە، وەک لەوەی خۆی شایەنیەتی و پێویستیەتی. بۆ خاتری خوا، ئەوە تەنها یەکتر ناسینێکە لەگەڵ منداڵەکان و هیچی تر، خۆ نانخواردنێکی ڕەسمی نیە لەکۆشکی سپی.

لەبەرئەوە تاوەکو ئەمانە ڕوونەدات، تۆ دەبێت هەر زوو منداڵەکان بهێنیتە ناو یارییەکەوە: ناساندنێکی سروشتی و سەرپێی هەر لە سەرەتای پەیوەندییەکەوە دەتوانێت هەمووتان ئاسوودە بکات و پەیوەندیەکی درووست بنیات بنێن.

دەبێت کاتێک لەژوورەوە دانیشتوە یان لەپارکێک دانیشتوە، یان لای ئاسکرێم فرۆشەکەوەیە و لەگەڵ ئەو منداڵانەدایە، لەوکاتەی کە تۆ هەستی سۆزداریت بۆی درووست دەبێت لەدوای «سەرنجی ڕاکێشاوم» ئەو کات دەست دەکەیت بەپرسیارکردن کەئایا ئەم پیاوە گونجاوە بۆ من یان نا، وە پرسیاریش دەکەی کەئایا گونجاوە بۆ منداڵەکان یان نا. لێی گەڕێ با تۆو منداڵەکان بەشێوەیەکی سروشتی ببینێت وەکو

دایکی منداڵەکانت. دەبێت بتبینێت کاتێک میوە و سلیلاک دەدەیت
بە منداڵە ساواکەت، وە کاتێک قژی کچە حەوت ساڵانەکەت
دەبەستیت، وە جل و بەرگی منداڵە ١٠ ساڵانەکەت قەد دەکەیت،
وە کوڕە ١٥ ساڵانەکەت هاندەدەیت و هاواری خۆشی بۆ دەکەیت
کاتێک خەریکی مەشقە وەرزشیەکانی تۆپی پێیە، ئەو دەبێت
هەموو ئەم شتانە ببینێت تا بزانێت تۆ چ جۆرە دایکێکیت، وە ئایا
حەزدەکات ببێت بەدایکی منداڵەکانی. خانمان ئەمە زۆر گرنگە،
چونکە ئێمەی پیاوان دەزانین کە هەندێک ژن توانای ئەوەیان
نیە ببن بەدایک_چونکە هەستی دایکایەتی تەنها ئەوە نیە کەژن
لەڕووی جەستەییەوە ئەو منداڵە لەسکی خۆیدا هەڵبگرێت و
بیهێنێتە سەر دونیا. هەندێک ژن هەن کە ناتوانن شۆفێری بکەن،
هەندێک ژن هەن ناتوانن بیرکاری بخوێنن، وە هەندێک هەن
نازانن چێشت لێبنێن؛ وە هەندێکیش هەن کە لەدایکایەتی کردندا
باش نین. پیاو دەیەوێت ببینێت کەژنی داهاتوی گونجاو بێت بۆ
ئەو ڕۆڵە، میهرەبان و دڵسۆز و داهێنەر بێت و چاونەترس بێت.
دەیەوێت ببینێت کەتۆ لەتواناتدایە کێشەکان بە لەسەرخۆیی و
پشوودرێژی چارەسەر بکەیت و ئەو کێشانەی کە ڕووبەڕووی
هاوسەرگیری و خێزانەکەتان دەبێتەوە، بەلێهاتووی و شارەزایی
چارەسەر بکەیت، چونکە تاکە شت کە ئێمەی پیاو دەیزانین
ئەوەیە هاوسەرگیری و خێزان ڕووبەڕووی زۆرترین کێشە و
دڵەڕاوکێ دەبێتەوە، وە پێویستی بەهەوڵدان و تێکۆشانە.

لەبەرئەوە ئێمە تەماشا دەکەین_تەماشا دەکەین تا ببینین
ئایا تۆ توانای ئەوەت هەیە خواردن بۆ منداڵەکان ئامادە بکەیت،
لە کاتێکدا کە یارمەتی منداڵێکت دەدەی تائەرکەکانی ماڵەوەی
جێ بەجێ بکات، وە گرنگی بە یەکێکی دیکەیان دەدەی کەهەفتەی

جارێک نەخۆش دەکەوێت و توشی هەڵامەت دەبێت، یارمەتی دانەیەکی دیکەیان دەدەی کە ئینتەرنێت بەکاربهێنێت، وە ڕێگری لەیەکێکی دیکەیان دەکەی کە نەچێتە ناو سایتی نەشیاوەوە لەئینتەرنێتدا، وە هەموو ئەم کارانە دەکەیت بەبێ ئەوەی هەست بەخنکان بکەیت. لەوەش گرنتر، تۆ دەبێت منداڵەکانت بەو پیاوە بناسێنیت کەپەیوەندیت لەگەڵیدا هەیە، کەواتە تۆ دەتوانیت توانای باوکایەتی ئەوت بۆ دەربکەوێت ، بیبەرەوە بۆماڵەوە و بەدوو منداڵەکەتی بناسێنە(تایلەر و پریانا) دواتر بکشێوە و سەیری بکە، ئەوکات ڕاستترین کاردانەوەیت بۆ دەردەکەوێت، وە ئەگەر بەڕاستی منداڵی خۆشبوێت و شتێکی لەبارەوە بزانێت، ئەوکات لە توانایدا دەبێت پەیوەندیان لەگەڵ درووست بکات و قسە لەگەڵ کوڕە ٦ ساڵانەکەت بکات: باشترین تاقیکردنەوەی شارەزایی کەسێک لە بواری منداڵدا ئەوەیە کەبتوانن قسە لەگەڵ منداڵ بکەن، کەمنداڵەکان بە شێوەیەکی باش وەڵامیان بدەنەوە، ئەگەر منداڵەکان وشک بن لەگەڵ ئەو پیاوە و وا مامەڵەی لەگەڵدا بکەن کەئەو پیاوە یەکێکە لە ئەندامانی شایەتی دان لەدادگا، پیاوەکە ناتوانێت بیر لەشتێک بکاتەوە تا بیڵێت و پرسیاریان لێ بکات. لەوانەشە ئەم کاردانەوەیە ئەوە نیشان بدات کەهیچ باش نیە لەمامەڵەکردن لەگەڵ منداڵدا، لەوانەشە ئەو زۆر بێ دەسەڵات بێت بەرامبەر هێزی منداڵێکی هاروهاج، کە کەس منداڵەکانیانی لاپەسەند نیە جگە لەدایکیان، جا ئەگەری هەیە ئەوە کێشەکە بێت. پیاوەکە ناتوانێت کۆنترۆڵی خۆی بکات لەم بارودۆخانەدا، کەناتوانێت قسەی خۆش یان سۆز دەربڕێت یان شانی بڵاوبکاتەوە و وا دەریبخات کەدەسەڵاتەکان لای ئەوە، تاوەکو منداڵەکە لێی بترسێت و ئازاری نەدات. لەکۆتایدا

دەتەوێت ئەو پیاوەی کەلات پەسەندە، باش مامەڵە بکات لەگەڵ منداڵەکانتدا، کەسێک بێت توانای ئەوەی هەبێت دەسەڵاتەکانی خۆی پیشان بدات کاتێک منداڵەکان هاروهاجی دەکەن. چونکە منداڵەکان ڕێز لەهێز دەگرن، ئەم هەموو شتانە دەربارەی ئەم پیاوە زانیاری زۆرت پێدەبەخشێت، نیشانتی دەدات کەدەبێت بەچی جۆرە باوکێک لە داهاتودا.

ئەگەر ئەو ئاسودە بێت لەگەڵ منداڵەکان، توانای ئەوەی هەیە کاتی خۆی لەگەڵیان بەسەر ببات و ئامۆژگاریشیان بکات. وە هەروەها ئامۆژگاری تۆش بکات تا چۆن لەکێشەکان بڕوانیت، ئەو تایبەتمەندیانەت نیشان دەدات کە لەوانەیە ببێت بەباوکێکی باش بۆ منداڵەکەت، هەروەها کاتێک لەگەڵ منداڵەکانتدا دەتبینێت کە گرنگیان پێدەدەیت و خواردنیان پێدەدەیت، هەموو پێداویستیەکانیان بۆ دابین دەکەیت، تۆ نیشانی دەدەیت کە تۆ تەنها دایکێکی باش نیت بۆ منداڵەکانی خۆت بگرە، دەتوانیت ببیت بەدایکێکی باش بۆ منداڵەکانی ئەویش، یاخود هەر منداڵێک کە لەوانەیە پێکەوە بیخەنەوە.

بەدڵنیاییەوە دەبێت ڕەچاوی هەستی منداڵەکانت بکەیت دەربارەی ئەم پیاوە، منداڵان توانای ئەوەیان هەیە هەست بە باشی و خراپی کەسەکان بکەن، ئەگەر زۆر منداڵ بوون ئەوا پێویست بە هیچ هۆکارێکی شاراوە ناکات، تا کەسێکت بە دڵ بێت.

بەدڵنیاییەوە ئەگەر تۆ بەمنداڵەکانی بناسێنیت وەکو هاوڕێیەک هەروەکو چۆن هاوڕێیەکی ئافرەتت دەناسێنیت پێیان، بەڵام ئەگەر ئێستا باوکی منداڵەکانت بەشدار بێت لە ژیانی منداڵەکانتدا، منداڵەکانت بەدڵنیاییەوە هیچ هەستێکی خۆشیان

نابێت دەربارەی ئەم پیاوە تازەیە، ئەمە شتێکی ئاساییە، لەم بارودۆخانەدا کارەکە ئاسان ناکەن تا بەخێرای تێکەڵ بێت لەگەڵیاندا، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت پیاوەکە بترسێت و دووربکەوێتەوە (لەسەرەتادا، چۆن پیاوێکی گەورە لە منداڵێکی بچوک دەترسێت؟ ئەگەر ڕۆشت، وازی لێ بێنە با بڕوات).

پیاوە تازەکە لەوانەیە دوو سێ قسەی ناخۆش بکات یەکەمجار، کە منداڵەکان دەبینێت، منداڵە بچوکەکە لەوانەیە نەیەوێت تەوقەی لەگەڵدا بکات، لەجیاتی ئەوە شەقێکی لێ بدات، لەژوانی دووەمدا، دڕندە بچوکەکە (منداڵەکە) کە هەر بەمەبەست پایسکیلەکەی بەلای سەیارەکەیدا دەخشێنێت.

لەژوانی سێیەمدا « لەناکاو شەربەتی میوەکەی دەڕژێنێت بە قاتە گران بەهاکەی پیاوەکەدا، بەڵام ئەگەر تۆ شایەنی بیت ئەوا دەمێنێتەوە لەگەڵت، تابزانێت ئەم منداڵە خۆی شێتە یان خۆی شێت دەکات. یاخود ئەو تەنها ئەو منداڵە لەڕۆژە خراپەکانیدا دەبینێت، ئەوا هەوڵی زۆری لەگەڵ دەدات تا منداڵەکە ئەوی خۆشبوێت.

وە کاتی زیاتریش بەپەیوەندیەکەی بدات تا وەکو بزانێت دەتوانێت بەرگەی ئەم منداڵە دەگرێت.

هەروەها، هەرزەکارەکان؟ پیاوەکان بە هیچ شێوەیەک وەکو کێشە نایان بینن. هیچ پیاوێک ناچێتە پەیوەندیەکەوە وە ئەو خەیاڵە لەمێشکیدا بێت کە ببێت بەباشترین هاوڕێی منداڵە هەرزەکارەکەت. تەنانەت باوکە بایۆلۆجیەکەشتان(باوکی ڕاستەقینەتان) بەرگەی هەرزەکارەکان ناگرێت، هەروەها بە پێچەوانەش، ئەگەرەکان زۆر کەمن کاتێک ئەم پیاوە تازەیە ساتێکی دڵڕفێنی هەبێت لەگەڵ هەرزەکارێکی ئاژاوەگێڕ و کێشە

دروستکەر. باشی هەرزەکارەکان لەوەدایە وا خۆیان دەردەخەن کە دیارنین(خۆیان دەشاردنەوە)، لەئەنجامیشدا، پیاوە تازەکەت توانای ئەوەی دەبێت کە بایەخ بەپەیوەندیەکە بدات، بەبێ ئەوەی سەرنجی ڕابکێشرێت لەلایەن منداڵێکی هاروهاجەوە، بەڵام ئەگەر پیاوێک بەڕاستی بیەوێت لەژیانتدا بمێنێتەوە، ئەوا هەموو هەوڵێکی خۆی دەدات تا ببێت بە بەشێک لەژیانی منداڵە هەرزەکارەکەت، وە ڕێگری ناکات وخۆی چاوەڕێی ئەوە دەکات کە هەرزەکارەکە مامەڵەی خراپی لەگەڵدا بکات، ئەوەی ئەو دەبێت بیکات دیاریکردنی هەڵسوکەوتکردنی منداڵەکەیە، کە ئایا نواندنی کەسێکی خراپ دەکات یان خۆی هەر کەسێکی خراپە لەڕاستیدا.

ئێستا ئێمە هەموومان لەپێویستی تۆ تێدەگەین وەکو دایکێک کە هەوڵدەدەیت پارێزگاری لەهەستی منداڵەکانت بکەیت. وە دوودڵی تۆ دەربارەی ئەوەی پابەندیان بکەیت بەکەسێکەوە کە ناتوانیت گرەنتی ئەوە بکەیت کە دیار نەمێنێت و دڵی منداڵەکانت لەگەڵ خۆیدا نەبات.

وە لەوەش تێدەگەین کە چەند گرنگە بۆ تۆ، کەوا دەرنەکەویت زۆر شلیت و خێرا دەکەیت بۆ ئەوەی پیاوان بهێنیتە ناو ماڵەکەتەوە، ئێمە دەزانین ئەمە لە دژی هەموو یاساکانی تۆ دەوەستێتەوە دەربارەی ئەم بارودۆخانە بەڵام ئەی خوایە...، خۆ من باسی ئەوە ناکەم کە هەموو کەس بهێنیتە ناو ماڵەکەتەوە، من باسی ئەو پیاوە دەکەم کە تۆ زۆر بایەخی پێدەدەی. وە ئەویش بایەخ بە تۆ دەدات. گرنگی بەوە مەدە کە ئایا ئەو وا بیر دەکاتەوە تۆ هەوڵدەدەیت بیخەیتە تەڵەوە یان بەدوای گەمژەیەکدا دەگەڕێیت تا منداڵەکانتی پێ بەخێو بکەیت،

دایکە سەڵتەکان لە چواردەوری زەوی باوەڕیان وایە لەگەڵ هەستە سروشتیەکان بایەخەکەیان و پارێزگاریان لەبەرزترین ئاستدا دەربارەی ئەو پیاوانەی کە تازە ناسیویانن، منداڵەکانیان لەگەڵیاندا پارێزراو نابن، بەڵام خاتونەکان ئەمە نهێنیەکەیە، ئەمە بەدڵنیاییەوە فیڵی پیاوە فێڵبازەکانە کەخۆیان یاسای یاریەکەیان داناوە و دەیانەوێت بەو شێوەیە بیر بکەیتەوە (باوەڕی پێ بکەی).

ئافرەتەکان لەژێر ئەو ترسەدا دەژین، چونکە ئەو پیاوە فێڵی لێکردووە تا بەمشێوەیە بیر بکاتەوە، تا تۆش باوەڕی پێ بکەیت، ئێمە لە یاریەکە بەردەوام دەبین تا بیکەین بەئامانجی خۆمان، بەبێ هیچ ئەرک و بەرپرسیاریەتیەک، ئەگەر بەڕاستی پیاوێکی باشت ئەوێت لە ژیانتدا، داوات لە خوای گەورە کردووە تا خێزانێکت پێ ببەخشێت، پێویستە لەم بیرکردنەوە گەمژانەیەت بوەستیت و ئەم پیاوە بناسێنیت بە منداڵەکانت تا بتوانیت ئەوەت بۆ دەربکەوێت.

پیاوە ڕاستگۆکان دەزانن کە ئەو ئافرەتانەی منداڵیان هەیە ڕێکەوتنێکی گشتگیر دەکەن کە منداڵەکانیش بگرێتەوە، وە تۆش لەوە تێدەگەیت کە دایکێکیت بەرپرسیارێتیت هەیە بەرامبەر منداڵەکانت.

بەتایبەتی ئەگەر لەسەرەتاوە ئەوە بدرکێنیت و پێیان بڵێیت: من تەنها بەدوای پەیوەندیەکدا ناگەڕێم لەگەڵ پیاوێکدا تا لەگەڵم بێت، بەڵکو هەوڵی ئەوە دەدەم لەگەڵ پیاوێک یەککگرتوویەک دروست بکەم و ئەویش ببێت بە سەرۆکی خێزانەکەم.

ئایا دەزانیت بەیانێکی(ڕاگەیەندراو) وەکو ئەمە چی دەگەیەنێت؟ خۆشەویستیەکەم(ژن) بەرپرسیاریەتیە بۆ تۆ(پیاو)،

تۆ بە شێوازێکی بەڕێزانە و ڕێک و پێکانە پێت ووتوە تاکە ڕێگا تا پیاوێک بێتە ناو ژیانتەوە ئەوەیە کە ببێت بە بەشێک لە ژیانی منداڵەکانت، منداڵەکانت بەشێکن لە ڕێکەوتنەکە، وە هەروەها یەکسەر لەژیانتدا دەری دەکەیت ئەگەر زانیت بۆ منداڵەکانت گونجاو نیە، لەگەڵ ئەو زانیاریانەدا وە ئەو داواکارییانەی کە ڕووبەڕوویت کردۆتەوە، یان ڕادەکات یان هەوڵدەدات تا بزانێت چۆن ئەم کارە سەر بگرێت، دەتوانیت بانگی بکەیت تا لەگەڵ منداڵەکانتدا بێت بۆ باخچەی ئاژەڵان، یان بانگهێشتی بکەیت بۆ ماڵی دایکت بۆ ژەمێکی گۆشت برژاندن، تەماشای کردەوەکان و قسەکانی بکە، ئەگەر ووتی نەخێر نایەم سەیری یاری تۆپی پێ دەکەم ، ئەزانی چی؟ لەوانەیە ئەو کەسە گونجاوەکەی تۆ نەبێت، زۆربەی کات، چۆنیەتی دەستپێکردنی پەیوەندیەکە نیشانەیەکی باشە تا بزانیت چۆن کۆتایی پێ دێت.

ئەگەر پیاوێکیش هەر لەسەرەتاوە گرنگی بەخێزانەکەت نەدات، چی وات لێدەکات بیر بکەیتەوە دوای ئەوەی لەگەڵیدا دەخەویت، خێزانەکەتی خۆشدەوێت؟ بەڵام ئەگەر ئەو یارییەکی بۆڵد یان یارییەکی تۆپی پێی بهێنێت بۆ ماڵەکەت و لەسەر زەوییەکە دای بنێت، تا کاتژمێرێک یاری پێ بکات لەگەڵ خێزانەکەت، یان بانگی تۆ و خێزانەکەت بکات بۆ گەشتێک، کەواتە ئەم جۆرە کەسانە شایەنی مانەوەن لەگەڵتدا.

بۆ هەموو ئەوانەتان کەتەنها بیر لەلایەنی پارێزراو بوون دەکەیتەوە، ئەوە بزانە من پێت ناڵێم پیاوێک بهێنیتە ماڵەکەتەوە کە کەمێک دەیناسیت، وە بە تەنهاش بەجێی بهێڵیت لەگەڵ منداڵەکانتدا. بەدڵنیاییەوە، ئەگەر تازە کەسێک بناسیت و بانگهێشتی بکەیت بۆ ماڵەکەت، ئەوا بەدرێژای کاتەکە

لەلای دەمێنێتەوە و چاودێری دەکەیت تا دڵنیابیت کەهیچ هەڵسوکەوتێکی هەڵە بەرامبەر منداڵەکانت ناکات، ڕاستگۆبە، هیچ پیاوێک نایەتەماڵەکەتەوە و هیچ هەڵسوکەوتێکی هەڵە بەرامبەر منداڵەکانت ناکات کاتێک تۆ لە تەنیشتیانەوە دانیشتبێتی. ئەگەر تۆ ئەوەندە لەم بارودۆخە دەترسی ئەوا هەمیشە دەتوانی بۆ شوێنێکی گشتی یان پارکێک بانگهێشتی بکەیت، کە خەڵکی زۆری تیایە و چاودێری هەڵسوکەوتەکانی دەکەن، ئەگەر هەر خراپەیەکی کرد ئەوا یەکسەر لەژیانت دەری بکە بۆ هەموو ئەوانەی کە ژوان لەگەڵ ئەو پیاوانەدا دادەنێن کەخاوەن منداڵن، چاوەڕێی ئەوەی لێ مەکە زۆر بە زووی منداڵەکانیت پێ بناسێنێت، چونکە منداڵەکەی هەرچیەک بێت ئەوەندە لە دایکی نزیکە کەبتوانێت بڕوات بۆ لای دایکی و پێی بڵێ کە تۆ هاتوویت بۆ ماڵیان، دوای ئەوە یەکسەر هاوسەرە کۆنەکەی یاساکانی چاودێریکردنی منداڵەکە دەگۆڕێت، ناهێڵێت منداڵەکەی لەگەڵ ئافرەتێکدا بمێنێتەوە کەنایناسێت و نازانێت پێشینەی چیە، کاتێک کە ئەو ژنە بیەوێت لەماڵە کۆنەکەیدا بمێنێتەوە.

کەواتە پیاوێک کەخاوەن منداڵ بێت لەپەیوەندییەکەی پێشوویدا پێویستە کاتەکانی بەش بکات، تا کێشە لەنێوان دوو ژنەکەدا ڕوونەدات، تا دایکی منداڵەکەی، منداڵەکەی لێ وەرنەگرێتەوە، ئەگەر تۆ کەسێک نەبیت پیاوەکە بیەوێت ماوەیەکی زۆر لەگەڵت بمێنێتەوە، ئەوا ناکرێت کێشە درووست بکات، بەهۆی تۆوە لەگەڵ دایکی منداڵەکەیدا، چونکە دەزانێت کە تۆ شایەنی ئەو هەموو سەرئێشەیە نیت، و کاتێک منداڵەکەی دەگەڕێتەوە باسی تۆ دەکات لای دایکی، ئەو لە مێشکی خۆیدا باکلای کردۆتەوە کەتۆ شایەنی ئەوە نیت، ئەگەر داوای لێکردی

منداڵەکانی ببینیت ئەوا بزانە خۆی دەزانێت بەهۆی ئەم کارەوە تووشی کیشە دەبێت، بەڵام دەڵێت قەینا چونکە تۆ شایەنی ئەوەیت، دوای ئەوەی ژوانی پێنجەمی لەگەڵتا بەستووە، ئەوا پێت دەڵێت دەبێت ئەم یەکشەمە من و منداڵەکانم بچینە دەرەوە. چونکە ئەم یەکشەمەیە نۆبەی ئەوە لەگەڵ منداڵەکان. کەواتە تۆ بۆت ڕوون دەبێتەوە کە ئەو نایەوێت تۆ لەچواردەوری منداڵەکانی بیت، ئەو نیشانت دەدا کە تۆ شایەنی ئەوە نیت کەتووشی سەرئێشە ببێت بەهۆی تۆوە، بەڵام ئەگەر شتێکی وەک ئەمەی ووت: من ئەم یەکشەمەیە منداڵەکان دەبەم بۆ کەنار دەریا، یان بۆ پارک، بۆچی تۆش نایەیت لەگەڵمان؟ ئەو بیردەکاتەوە دوای خۆی مامەڵە لەگەڵ هاوسەری پێشوویدا دەکات، بەڵام لە ئێستادا دەیەوێت کاتی زیاتر لەگەڵ تۆ و منداڵەکان بەسەر ببات.

ئایا دەتەوێت بۆت دەربکەوێت کە ئەو تایبەتمەندییەکانی باوکێکی باشی تێدایە یان نا؟ ئەم لیستەی خوارەوە مسۆگەر نیە، بەڵام بەدڵنیاییەوە چەند وزەیەکت دەداتێ بۆ بیرکردنەوەکانت دەربارەی ئەو شتانەی کە پێویستە ڕەچاوییان بکەیت، تابزانیت ئەم پیاوە بۆ تۆ گونجاوە یان بۆ منداڵەکانت گونجاوە، یان دەبێت ڕابکەیت و منداڵەکانت ببەیت بەرە و ئاراستەیەکی تر.

تۆ بۆت دەردەکەوێت ئەو باوکێکی باش دەبێت ئەگەر:

١ـ پێی ووتی منداڵانی خۆشدەوێت، وە زۆر ئارەزوومەندە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ببێت بە خاوەنی منداڵ.

٢ـ بە دڵنیاییەوە زۆر گرنگی بەوە دەدات کە منداڵەکانت بناسێت.

٣ـوە کاتێک دێت بۆ ماڵتان دیاری لەگەڵ خۆی دێنێت ـ بۆ

منداڵەکان (بێگوومان ئەگەر ئێکس بۆکسی بۆ میکی هێنا خۆی تا چەند کاتژمێرێک دیار نەما، ئەوا لەوانەیە ئەمە کێشە بێت).

٤_ پیشانی منداڵەکانی دەدات کە زۆر بە ڕاستگۆیانە تۆی (دایکیانی) بە دڵەو خۆشیدەوێت.

٥_ژوانەکە دەکات بە ژوانێکی هاوڕێیانە بۆ منداڵەکانت و بەشداریشیان پێدەکات.

٦_تۆ و منداڵەکانیشت دەبات بۆ کڵێسە.

٧_ئەو ئیشێکی باشی هەیە و مێژوویەکی جێگیری کاری هەیە.

٨_ئەو لەگەڵ دایکیدا باش مامەڵە دەکات، جارجاریش سەردانی دەکات، بەمەرجێک لەوجۆرە کوڕانە نەبن کەپەیوەستە بە دایکیەوە (کوڕی دایکی خۆی، کە لەپێشتردا باسم کرد).

٩_خوشکەزا و برازاکانی کاتێکی خۆشی لەگەڵ بەسەر دەبەن.

١٠_یارمەتی بەخێوکردنی خوشک و برا بچوکەکانی داوە کاتێک کە ئەو منداڵ بووە.

١١_ئەگەر ئاژەڵێکی ماڵی هەبێت و گرنگی پێبدات خواردنی بداتێ.

١٢_ ماڵەکەی بە خاوێنی ڕادەگرێت، دەشزانێت چەند ژەمێکی خۆش ئامادە بکات.

١٣_ لە ڕووی مادییەوە لە توانایدا بێت تۆ و منداڵەکانی بەخێو بکات وە حەزیش بکات.

١٤_دەتوانێت و ئامادەشە یەکێک لە منداڵەکانت ئازارییان پێدەگات تەداویان بکات( ئەگەر پێی ووتبێتی کە دکتۆرە بەڵام دەستی کرد بە هەناسەدانی لە پڕ کاتێک خوێن دەبینێت ئەمە

لەوانەیە كێشە بێت).

١٥_نابورێتەوە كاتێك دایبی دەبینێت.

١٦_ دەتوانێت لەگەڵ منداڵەكانت پیس بێت و بەسۆندەی ئاو بیان شوات و یاری لەگەڵ منداڵەكان دەكات لە پارك و كەنار دەریا، وە زۆریشی حەز لێی بووە( وە ناشتەوێت تامەزرۆی یاریكردن بێت بە بوكەشوشە).

١٧_ زۆر تورە نابێت كاتێك كە كەسێك خواردن بڕژێت و ئۆتومبێلەكەی پیس بكات، یان جێ پێیەكی قوڕاوی لەناو ئۆتومبێلەكەی جێ بهێڵێت، ئەمە ئەوە دەردەخات كە ئەو تورە نابێت دەربارەی منداڵی پیس و چەپەڵ.(هیچ شتێك ئۆتۆمبێل پیس ناكات هێندەی منداڵ).

١٨_بتوانێت لە یارییەكی كێبڕكێ دا بەرگە بگرێت و وا بكات منداڵەكە لێی بباتەوە (تێبینی ئەوە بكە كە ئەگەر دەنگی بەرز كردەوە و بە منداڵە هەشت ساڵانەكەتی ووت من لە تۆم بردۆتەوە ئەوا ئەمە تایبەتمەندیەكی باشی باوك بوون نییە).

١٩_ ئەو ئامادەبێت و توانای ئەوەی هەبێت كە فێرت بكات چۆن وەرزشێك بكەیت، ئەمە نیشانی دەدات كە كەسێكی ئارامگرە.

٢٠_ ئەو ئامادە دەبێت كە بچێت بۆ كۆبوونەوەكانی خێزانەكەت لەگەڵ منداڵەكانتدا تەنانەت ئەو كاتانەشی گوێی لە چیرۆك بووە دەربارەی پورە شێتەكەت سەلمە، كەسەرخۆش دەبێت و ناوی هاوڕێ كوڕەكەت دەهێنێت بە دەنگی بەرز.

٢١_بەڕاستی بەلایەوە گرنگە منداڵەكەت لە قوتابخانە چۆن هەڵسوكەوت دەكات، نەك تەنها هانی بدات نمرەی باش بەدەست بهێنێت، بەڵكو پێشنیاری بۆبكات كە چۆن ببێت بە

کەسێکی نموونەیی.

٢٢_ئەو دەتوانێت بە نەرمی مامەڵە لەگەڵ منداڵەکانت بکات، بەڵام لە تواناشیدایە کەمێک ڕەق هەڵسوکەوت بکات (بەڵام ناشتەوێت لە ماوەی نێو کاتژمێری یەکەمدا، پشتێنەکەی بکاتەوە و لە منداڵەکانت بدات، دەزانم منداڵەکان دەتوانن هاروهاجی بکەن بەڵام ئەوە کەمێک زۆرە).

٢٣_ئەو توانای لێ خۆشبوونی هەیە، کاتێک کە منداڵەکەت هەڵسوکەوتێکی قێزەون دەکات، کە شایەنی لێ خۆش بوون نیە.

ئافرەتە بەهێز ، سەربەخۆ ، سەڵتەکان.

جیهان بەبێ ئافرەت، وەکو ئەمەی لێدێت: پیاوەکان ڕیشیان ناتاشن و خۆشیان ناشۆن و تەنانەت کاریش ناکەن، جل و بەرگەکانمان زۆر سادە دەبێت، پانتۆڵ و تیشێرت و گۆرەوی، یان چەند کاڵەیەک ئەگەر زۆر پێویستمان بە چوونە دەرەوە بێت.

هیچ پێویستیەک بە قاپ بۆ میوە ناکات، یان خواردنی زۆر_ قاپێکی پلاستیک یان دووان لەگەڵ پیتزایەکی سارد و کەمێک بیرە بەس دەبێت، کەمترین کەلوپەلی ناوماڵیشمان دەبێت وەکو ئەمانە: قەنەفەیەک بتوانرێت پشتەکەی پاڵ بدرێتەوە(قەنەفەی جولاو)، سەلاجەیەک، تەلەفیزیۆنێکی زۆر گەورە و کۆنترۆڵێک.

ئێمە تەنها پێویستمان بەدوو کەناڵی تەلەفیزیۆنی هەیە کە :( ئی ئێس پی ئێن ، ئی ئێس پی ئێن٢) وە پێویست ناکات بڕۆین بۆ پشووەکەشت تەنها بڕۆین بۆ( لاس فێگاس) بەسە.

چونکە لەوێ هەموو شتێکی لێیە، کەئێمە دەمانەوێت___ دەتوانیت لەوێ قومار بکەیت و جگەرە بکێشیت، و پارچەی گۆشت بخۆیت، یاری گۆلف بکەیت، و بچیت بۆ یانە، پێویستت

بە دروشمی ۹ ئەوەی لە لاس فیگاس ڕوودەدات هەر لە لاس فیگاس دەمێنێتەوە ) نیە.

چونکە هەرچۆنێک بێت پیاوان ناچن باسی بکەن کە چیان کردووە لەوێ، و هەموو ئەوەی کە دەمەوێت بڵێم خانمان ئەوەیە کە پیاوان بەڕاستی بونەوەری زۆر سادەن، حەزیشیان لە کردنی شتانی سادەیە، ئەگەر ژنان لە ژیانمدا نەبن، بەڵام ئێوەی ژنان مامۆستای چارەسەرکردنن. بەدرێژای ڕۆژەکە کاردەکەیت، دواتر دەگەڕێیتەوە بۆ ماڵەوە تا وەکو ڕۆڵی خۆیان وەک هاوسەر و دایک یان هەر شتێکی دیکە بگێڕن: وە منداڵەکان پەروەردە دەکەیت (زۆرێک لەئێوە هەن ئەو کارە دەکەن بەبێ یارمەتی پیاوێک کەباوکایەتیان بۆ بکات): وە زۆربەی بڕیارەکانی کڕینی شتێک لە ماڵەکەدا دەدەیت، وە پلەی سەرەکی و گرنگ لە کۆمپانیاکاندا بەڕێوە دەبەن (زۆربەتان زۆر سەرکەوو تووترن لەو پیاوانەی لەژیانتاندایە): وە سەرکەوتوون لە زانکۆکاندا، وە سەردەکەون بەسەر پیاوەکاندا: وە پشتگیری کڵێسە و پەروەردەی منداڵان دەکەن لە سیستەمی خوێندندا و وزە دەبەخشن بە مێشکیان، ئێمەی پیاو پێشوازی لەم کارەتان دەکەین و بەرز دەینرخێنین وەک ئەوەی خۆتان دەیزانن. (چونکە هەندێکجار شانازیمان ـغرورمانـ ڕێگریمان لیدەکات دان بەوەدا بنێین).

بەڵام پیاو نازانێت هێزی ژن لەتوانای چارەسەرکردن و ڕەفتار کردنیەتی لەگەڵ شتەکان. لە ئێمە وایە هێزی تۆ لەشتی زۆر سادەوە سەرچاوەی گرتووە، تۆ ژنیت، وە ئێمەی پیاویش هەموو شتێک کەلە توانای مرۆڤدا بێت دەیکەین تا کارت تێ بکات وە.تا بەهۆی ئەوەوە لەکۆتایدا بتوانین لەگەڵ تۆ بین، وە

تۆ ئەو هێز و پاڵنەرەی کە هەموو ڕۆژێک وامان لیدەکات لەخەو هەڵسین.

پیاو دەڕواتە دەرەوە و ئیش دەدۆزنەوە و هەوڵی تەواوەتی دەدەن بۆ پارە پەیدا کردن بەهۆی ژنانەوە، وە ئۆتۆمبێلی گرانبەها لێدەخوڕین بەهۆی ژنانەوە، جلی جوان دەپۆشین و بۆنی خۆش لەخۆمان دەدەین و قژمان چاک دەکەین تاوەکو لەچاوی تۆدا جوان و کەشخە دەربکەوین. ئێمە هەموو ئەمانە دەکەین چونکە هەرچەند لەیارییەکەدا پێش بکەوین زیاتر لەتۆوە بەدەست دەهێنین.

## تۆ خەڵاتە گەورەکەی لای ئێمە....

لەوانەیە هەندێکتان ئەم قسەیەتان لا ناخۆش بێت و بتان ڕەنجێنێت، بەڵام ئەمە بەڕاستی و خۆشەویستیەوە دەڵێم بۆ ڕەگەزی بەرامبەر: لە شوێنێکی ڕێگاکەدا، ژنان بیناییان بۆ ئەمە لەدەست داوە، لەوانەیە بەشێکی بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کەئێمەی پیاوان زۆر یاری و فێڵمان کردووە و هەڵەی زۆریشمان کردووە__بەجۆرێک هەمووتان بڕواتان وایە کە ئێوە لای ئێمە گرنگ نین، بەهۆی کارە خراپەکانی ئێمەوە. لەوانەشە بەهۆی پەروەردەکردنی ژنانەوە بێت لەم ڕۆژانەدا__کە هاندەدرێن لە لایەن دایک، پور، داپیرەوە ئامۆژگارییەکەرە مێینەکانەوە پێیان دەڵێن: خۆت پەروەردە بکە و ئیشێک بەدەست بهێنە تا ببیت بە ژنێکی سەربەخۆ، ئەگەر باجەکەی هەرچییەک بێت. ئەگەر پێویستی کرد پەیوەندییە جدییەکان دوا بخەیت یان لەوانەیە ئێوە بێزار بووبن بەدەست خولیای هەمیشەیی میدیاوە بەبێ هەڵەیی، وەکو هەموو شتەکانی کە لە گۆڤارەکاندایە و بەرنامە

تەلەفیزیۆنییەکان و بازرگانیەکان و تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان....هتد.

که هانتان دەدات ئەوەی لەدەستان بێت بیکەن تاوەکو له (هالی بێری و بیۆن سێ) بچیت، ئەگەر دەتەوێت سەرنجی پیاوێکی باش بۆ لای خۆت ڕابکێشیت، لەگەڵ ئەوەی ئێوە خۆتان خاوەنی جوانیەکی ناوازەن هیچ کەسێک ناتوانێت وەکو هالی بێت هالی خۆی دەبێت و کەسیش ناتوانێت بیۆن سێ بێت بیۆن سێ خۆی دەبێت.

هەرچیەک بێت، پیاوان ئێستا چیتر ناتوانن بگەن بەو بەشه ناوازەی تۆ کە واتلێدەکات ژن بیت___ئەو شتەی کە واتلێدەکات لەچاوی ئێمەدا لەوپەڕی جوانیدا بیت و واش لەئێمە بکات هەست بکەین کەپیاوین. هەروەکو پێشتریش ووتم: پیاو خۆشەویستی خۆیت بۆ دەردەبڕێت لەڕێی دان نان بەخۆشەویستیەکەیدا و دابین کردنت و پارێزگاری کردنت لەبەر ئەوە ئەمە مانای ئەوەیه ئەگەر تۆ خاوەنی پارەی خۆت و ئۆتۆمبێلی خۆت و خانوی خۆت و سیستەمی ئاگادار کردنەوە و دەمانچە و سەگی پاسەوانی بیت، وە تۆ بەئاشکرا هاوار دەکەیت کەپێویستت بەپیاوێک نیه دابینکەرت بێت و بتپارێزێت، ئەوکات ئێمەش دەزانین کەپێویست ناکات لەو نێوەندەدا بین، جا بۆ دەبێت پێویستت بەئێمە بێت لەکاتێکدا خۆت ئەو هەموو شتەت هەیە.

خانمەکەم بەهەڵە تێمەگە لەوەی لێرەدا دەیڵێم. ئێمە هیچ هەڵەیەک لەوەدا نابینین کەخاوەنی ژیانێکی تێر و تەسەلی خۆت بیت___تۆ دەتوانیت خاوەنی خانوی خۆت بیت و خاوەنی پارە و ئۆتۆمبێلی خۆت بیت، وە دەشتوانیت خاوەنی سیستەمی چاودێری خۆت وسەگی پاسەوانی و چەکیش بیت. بەڵام ئەگەر هەرگیز ڕێگە بەو پیاوە نەدەیت کە بە شوێن بەدەستهێنانی

هەست و سۆزی تۆوەیە، کە توانای خۆیت نیشان بدات لەدابینکردن و پاراستنندا، ئەوکات چۆن خۆشەویستی خۆی بۆ ژنێک دەربېرێت کەرێگەی پێنادات وەکو پیاوێک هەست بکات؟

بێگومان ئەو شتانەی کە لەرێگەی پارە و زانستەوە(بڕوانامە) وە بەدەستت هێناوە هیچیان ناگات بەگەورەیی پەیوەندیت لەگەڵ پیاوێک، وە «دی ئێن ئەی» پیاوان ڕێگە بەمە نادات، شیکردنەوە: ئێمە ڕێزی ئەوە دەگرین کەژنان وەکو پیاو مامەڵەمان لەگەڵ بکەن، وە کاتێک واتلێکردین  هەست بکەین تۆ پێویستت بەئێمەیە. وە ئێمە دەزانین کەپێویستیمان بۆ هەستکردن بەوەی کە کەسانی پێویستین و داواکراوین، زۆر زیاترە لەوەی خۆمان دەری دەبڕین: ئێمە پێویستە هەست بکەین کەتۆ پێویستت بە ئێمەیە، تاوەکو چارەنووسی خۆمان وەکو پیاوێک بهێنینە دی.

بێگومان، گوێم لە ژنان بووە دەڵێن: «من خۆم بچوک ناکەمەوە، تەنها لەبەرئەوەی ئەو هەست بکات پیاوە__ئەگەر ئەو پیاوە نەتوانێت مامەڵە لەگەڵ پارەکانم و سەرکەوتنەکانم و سەربەخۆیم بکات، کەواتە ئەو ناتوانێت مامەڵە لەگەڵ خودی مندا بکات!›› ، ئێمە لەژنە بەهێزەکان تێدەگەین و دەشتوانین زۆرباش مامەڵەیان لەگەڵ بکەین، لەڕاستیدا ئێمە ژنانی بەهێز دروست دەکەین ___ژنانێک کە «مامەڵە›› دەکەن بە باشی. وە لای کەس شاراوە نیە کەتۆ وا لەپیاوەکەت دەکەیت باوەڕ بکات ئەو سەرۆکی خێزانەکەیە، بەڵام لەڕاستیدا ئەوەی کەبڕیارە گرنگەکانی پەیوەست بە ماڵەوە و منداڵەکان دەدا تۆیت. وە لای هەموانیش ڕوونە کەگرنگ نیە پیاو پارە پەیدا بکات، چونکە هەر تۆ لایەنە مادیەکانت لە ئەستۆیە و چۆنیەتی خەرجکردنیان دیاری دەکەیت، وە ئاشکراشە کاتێک دەمەقاڵێ دەکەین ئێمە

خۆمان بەڕاست دەزانین، بەڵام دەزانین لە کۆتایدا ئەگەر بمانەوێت ئاگربەست بکەین هەر تۆ بەشێوازی خۆت دەیکەیت. ئێمە هیچ کێشەیەکمان لەگەڵ هەموو ئەمانە نیە، بەڵام ئەگەر تۆ ئەم شتە تایبەتانەت ووت بەبێ ئەوەی ڕەچاوی ڕۆڵی ئێمە وەک سەرۆکی خێزان بکەی، یان ڕۆڵی ئێمە بەهیچ شتێک نەزانی ئەو کات ئێمە نامانەوێت پەیوەندیت لەگەڵ دابنێین، چونکە ئێمە وا بیر دەکەینەوە کەئەگەر تۆ پارەی خۆتت هەبێت ئیتر پێویستت بەپارەی ئێمە نیە و ئەگەر تۆ لەوەرزشی کاراتیدا زۆرباشیت و بتوانی کەسێک بدەی بە زەویدا، کەواتە تۆ پێویستت بەپارێزگاری ئێمە نیە. ئەگەر ئێمە لە تواناماندا نەبوو ئەم دوو شتەت بۆ ئەنجام بدەین لەو سێ شتە بنەڕەتیەی کە کەسایەتی ئێمەی پیاو دیاری دەکات__دابینکردن و پاراستن__ئەوا دڵنیابە کە هەرگیز دان بەخۆشەویستی خۆماندا نانێین بۆت. وە هەرگیزیش ناڵێین «من پیاوەکەی تۆم»، ئەگەر تۆ نەهێڵیت هەست بەتەواوی کەسایەتی خۆمان بکەین و لەجێگەی ئەوە لەکۆتایدا چی ڕوودەدات؟ ئێمە لەگەڵت دەخەوین و دواتر بەڕێی خۆماندا دەڕۆین، ئەمە ڕاستیەکی تاڵە بەڵام ڕاستیە.

کاتێک گەنج بووم، لەگەڵ ژنێکدا بووم پێم وابوو کەخۆشمدەوێت، وازم لە زانکۆ هێنا، دەستمکرد بە کارکردن لێرە و لەوێ، وە ڕێگای خۆمم دۆزییەوە لە کۆمیدیادا، وە ئەو ژنە زۆر یارمەتی دام: من زۆر هەوڵم دەدا وتێدەکۆشام، ئەویش خەرجیەکانی دابین دەکرد، دان بەوەدا دەنێم، بەڵام هەستم بەکەمی خۆم دەکرد لەدابینکردنی خەرجیەکان و دابینکردنی ئەوەی ماڵەکە پێویستیەتی، بینیت؟ ئەمە هەموو ئەوەیە کە لەپەیوەندییەکی ڕاستەقینەدا گرنگە، واتە هەستکردن

بەهاوسەنگی تەنانەت لەناو جەرگەی تەنگەژە و ناخۆشیەکانیشدا، وە بێگومان تەنگەژە و ناخۆشیش هەر بوونی دەبێت، ئەی کاتی هاوسەرگیری بەڵێنی چیتدا؟ لەخۆشی و ناخۆشیدا پێکەوە دەمێنینەوە وە کاتی نەخۆشی و لەشساخیدا! بێگومان یەکێک نەخۆشدەکەوێت. وە لە دەوڵەمەندی و هەژاریشدا. بێگومان کەسیش هەیە کەمایە پوچ دەبن و بەتەواوی لێ دەبێتەوە، بێگومان کاتی خراپ هەر بوونی دەبێت.

پرسیارەکە ئەوەیە چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەم بارودۆخە بکەم؟

جارێک، هاوڕێیەکم ئەمەی بۆ ڕوونکردمەوە: ڕۆژێک لەگەڵ هاوسەرەکەی ڕۆشتبوو بۆ دوکانی سەوزە و میوە، وە ژنەکەی عارەبانەکەی پڕکردبوو لەو شتانەی کەماڵەوە پێویستیانە___ هەر لەگۆشت و سەوزەوات و میوە و خواردنەوە، وە هەموو شتێک، وە کاتێک گەشتن بەڕاڕەوی شەربەتی ئەنەناس، دەبێت شتێک بزانیت___هاوڕێکەم زۆر حەزی لەشەربەتی ئەنەناسە و حەزی لەپارچە گۆشتە بەئەنەناس خۆشکرابێت___ وە کاتێک بەو ڕاڕەوەدا تێپەڕبوو بوو، ڕێک بوتڵە شەربەتەکەی هەڵگرتبوو تا شوێنی سەوزە و میوەکان بیری لەوە نەکردبۆیەوە و خستبویە ناو عارەبانەکەوە ، لەم کاتەدا ژنەکەشی پشتی لەوێ بوو، بەڵام کاتێک ئاوڕی دابۆیەوە شەربەتی ئەنەناسەکەی بینی بوو لەعارەبانەکەدا لەسەر ئەو شتانەی کەهەڵیگرتبوو، ژنەکە شەربەتەکەی هەڵگرتبوو ووتبووی: «ئەمە چیە؟» وە هاوڕێکەشم زۆر بەسادەیی ووتبووی: «شەربەتی ئەنەناس» ژنەکەش ووتبووی: «کێ شەربەتی ئەنەناسی لە ناو عارەبانەکە داناوە؟» هاوڕێکەم بەشڵەژاوی ووتبووی: « من دامناوە، بۆ خاتری خوا کێی تر بوتڵی شەربەتی ئەنەناس بخاتە

عارەبانەکەمانەوە؟›› ژنەکەش تفیکی کردو ووتی: « تۆ؟ خۆ هیچ پارەیەکت پێ نیە؟›› دوای شتێکی کرد کەجێگای باوەڕ نیە: بوتڵە شەربەتەکەی هەڵگرتوو بەئەنقەست دای بەزەویدا و خستیە خوارەوە! وە کاتێک کەوتە سەر زەوی دەنگێکی بەرزی لێوە هات و بوو بە هەزار پارچە شوشەی بچوکەوە، وە ئەو شەربەتە زەردە بەو ناوەدا بڵاو بۆیەوە و ــ چەند ئینجێک دوورتر لە قاچەکانیەوە، دواتر ژنەکە سەیرێکی شوشە شکاوەکانی کرد و سەیرێکی پیاوەکەی کرد بەڕقەوە و پاڵی بە عارەبانەکەوە نا و دوورکەوتەوە لەشوشە شکاوەکان.ــ پیاوەکەی ڕۆشتە دەرەوە و لەدەرەوەی فرۆشگاکە چاوەڕێی کرد: لەکۆتایدا ژنەکەی هاتە دەرەوە، هاوڕێکەم میوە و سەوزەکانی بەچاوی پڕ فرمێسکەوە خستە ناو ئۆتۆمبێلەکەوە! تۆ نازانی ئەمە چەندێک ئازاری ئەم پیاوەی دا.

هاوڕێکەم دەیزانی کەهیچ پارەیەکی پێ نیە، بەڵام هەموو ئەوەی کە ئەو ویستی بوتڵێک شەربەتی نەفرەتی بوو، ئەو ژنە بەم کارەی لەو کاتەدا ئەوەی نیشاندا کە بەپیاوی نازانێت، ژنەکە ویستی لەوساتەدا ئەوە بسەلمێنێت کەپێشتر دەیزانی ــ کە مێردەکەی ڕۆڵی خۆی وەکو دابینکەرێک ناگێڕێت. من پێشنیاری ئەوە ناکەم کەئەو ژنە مافی ئەوەی نیە پیاوێکی هەبێت کار بکات، بەڵام ئەگەر ئەو پیاوەی بناسیایە ــ وە پیاوانی بەگشتی بناسیایە ــ تێدەگەشت ئەو شتەی دەیەوێت و پێویستیەتی دەستی ناکەوێت لەپیاوەکەی، ئەگەر وا هەست بکات پیاو نیە. کارەکانی ژنەکە تەنها دەبنە هۆکاری دوورخستنەوەی مێردەکەی لە خۆی، دوای ئەوە زۆری نەخایاند، پیاوەکەی بەجێی هێشت.

بەم جۆرە ئەمەیەکی زۆر گونجاوە کەتۆ دەبێت چاوەڕێی
چییە لەو پیاوانەی کە لەدۆخی هاوشێوەی ئەمەدان، کاتێک ژن
بەو سەرمەکەی زیاتر پەیدا دەکات، وە ئەشێدانەوە بەچاویدا
بە ڕوویدا، ئایا پیاو بە سەرکەوتن و پارەکانت دەترسێت؟
بێگومان، چونکە ڕۆڵی کەم دەکەیتەوە وەکو پیاوێکی دابینکەر. وە
بە هەمانش هەر چاوەڕێی ئەمەی لێدەکات، هەر بەڕاست ئێوەش
وا فێرکراون کەچاوەڕێی ئەوە لەپیاو بکەن کە خۆشەویستی
و پەرەست بهێنێت و گرنگیت پێ بدات بەدڵنیاییەوە، کاتێک
پیاو گەنجە و زۆر شارەزایی و دانایی نیە. سەرقاڵی ئەوەیە
هەموو ئەو شتانە بکات کەپێی وایە گونجاوە لەگەڵ پیاوەتیدا:
ژیان بەستن لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری ژنان، وە خەرجکردنی
پارەکانی لەشتی بێمانادا بەدەر لەتوانای خۆی، ماسولکەکانی
بەکاردەهێنێت لەجیاتی مێشکی، تا خۆی بەپیاوێکی بەهێز نیشان
بدات. بەڵام ئەوە تێدەپەڕێن و تێدەگەین کەپیاوی ڕاستەقینە
ئەو کەسەیە کە دابینکەری ئەو کەسە بێت کەخۆشی ئەوێت،
تەنانەت تاوانبارەکانی پشت شیشەکانی بەندینخانەش دەڵێن:
«یەکەم شت کەبیکەم دوای ئەوەی لێرە ڕۆشتمە دەرەوە، ئەوەیە
ئاگاداری خێزانەکەم بکەم و کارێک بدۆزمەوە__ئەمە هەموو
ئەوەیە کەدەمەوێت بیکەم»، لەگەڵ ئەوەی زۆربەی پیاوان لە
کۆتاییدا لەم ڕستەیە تێدەگەن، بەڵام هەندێکیان لەبازنەی نەزانیدا
دەمێنەوە و بەتەنیایی وکەمژەیی دەمرن. و لەزۆربەی کاتەکاندا
کاتێک لەدەوروبەری پیاوێک دەسوڕێینەوە، هەوڵی سەلماندنی
پیاوەتی خۆمان دەدەین لەبەر زۆری ژمارەی ئەو ژنانە نیە
کە لەچواردەورمانن، بەڵکو لەبەر ئەو کەسانەیە کەگرنگیان
پێدەدەین.

ئیمە وا راهاتووین کە دابینکەرت بین، وە توش وا راهاتوویت کەچاوەریی ئەوەمان لی بکەیت، کاتیک ئەم ڕیکخستنە گۆڕا ئەوکات پەیوەندیش دەگۆڕیت، وە لەوەش خراپتر ئەگەر ژن خویەکی خراپی هەبوو کە کەموکورییەکانی پیاو بداتەوە بە ناوچاوییدا و پیاویش دەنالینیت بەدەست نەتوانینی بینینی ئەرکی خوی وەکو دابینکەریک و ژنەکەش وا هەست دەکات کەخوپەسەندی پیاوەکە لەڕیگای دلخوشی ئەودا دەوەستیت. هەمووان لیرەدا بی چارە دەمیننەوە.

## کەواتە تۆ چۆن ئەم بارودۆخە تێ بپەڕێنیت؟

پیویست ناکات دەستبەرداری پارەکانت و کارەکەت و بڕوانامەکەت یان شانازی و گەورەیی خوت بیت. تەنها ئەوەت لەسەرە خانم بیت.

دەتوانم گویم لەجیرەی ددانەکانتان بیت خانمان ــ هەروەکو زەنگی ئوتومبیلی پولیس وایە ــ و دەتوانم بالتان ببینم کەبەرزی دەکەنەوە و چرچاوتان داوە بەیەکدا، بەلام سەرەڕای تورەبوونتان و هەراسانیتان کە باسمکرد، هەرگیز ئەو ڕاستیە ناگوڕیت کەپیاو باری ماددی و پیگەی کومەلایەتی و ڕابردووی هەرچیەک بیت، دەیانەویت ژنەکانیان ڕیگەیان پی بدەن ئاگاداریان بن. بەلام ژنە یاخی بووەکان من پیتان دەلیم فەرمون بڕون و وا ڕەفتار بکەن کەهیچ گرنگ نیە ئەگەر دەتانەویت، بەلام ئەو ژنانەی کەئەمەیان قبولە پیاو ڕابەری بکات دەیبەنەوە، لەبەرئەوە پیاویکت دەوی یان نا؟ دەتوانیت ئەم کارە بکەیت.

ئیمە دەزانین تو هیندە بەهیزیت تاوەکو تەلەفیزیونەکە

بگوازیتەوە بۆ شوێنێکی تر. بەڵام تۆ دەبێت ڕێگە بدەی پیاو ئەوکارە بکات: بڵێ «ئەمە زۆر قورسە، ئەمە کاری پیاوانە «
بەڵێ، تۆ ڕاستەکەیت___قۆڵەکانت لە هیچی کەم نیە و خۆت توانای ئەوەت هەیە کەدەرگای ئۆتۆمبێلەکە بکەیتەوە، بەڵام ئەو کارە مەکە، کاتێک لەگەڵ پیاوێک دەڕۆیت بۆ شوێنێک لێی گەڕێ وەکو خانمێک مامەڵەت لەگەڵ بکات و دەرگای ئۆتۆمبێلەکەت بۆ بکاتەوە، ئەگەر خۆی ئەو کارەی نەکرد ئەوا لەلایەکی ئەو دەرگا نەفرەتیە بوەستە و چاوەڕێ بکە تاوەکو تێبینی ئەوە بکات کە پێویستە دابەزێت لەئۆتۆمبێلەکە و بێت بۆ لات و دەرگاکەت بۆ بکاتەوە. چونکە ئەمە کاری ئەوە.

ئێمە دەزانین پارەت زۆرە تاوەکو پارەی خواردنەکە بدەیت لە ڕێستۆرانت، بەڵام دانیشە با ئەو حسابەکە بدات، پێویستە لەسەری ئەمە بکات کاتێک لەگەڵ ژنێک دەچێتە دەرەوە بۆ ژوانێک.

بەڵێ، تۆ مرۆڤێکی سەربەخۆیت و پێویستت بەکەس نیە زبڵەکەت بۆ فڕێ بدات، یان تابلۆت بۆ هەڵبواسێت، وە یان بچێت بۆ کۆگای ماڵەکە و کەرەستەی چاککردنی بەلۆعە و دەستشۆرەکەت بۆ بهێنێت.

بەڵام درۆتان بۆ ناکەم: ئەگەر تۆ دەست بخەیتە سەر دەمت، کەتۆ نازانیت چی بکەیت، یان هێزی ئەوەت نیە، دڵنیابە پیاوەکەت هەنگاو دەنێت بۆ چارەسەرکردنی ئەمە، لەبەرخاتری تۆ__ئەگەر تۆ زەردەخەنەیەکی لەدڵەوە بۆ بکەیت و بڵێیت: «ئازیزم، زۆر سوپاس کە لەبەر من ئەمە دەکەی ___من نازانم کە بەبێ تۆ چی بکەم».

بینیت، زۆربەی پیاوان دەبن بەباشترین پیاو ئەگەر داوایان

لێ بکرێت بین، باشە، ئێمە لەم سەردەمەداین و ژنانیش زۆربەی ئەم ڕۆڵانە بە پێویست نازانن___من دان بەوەدا دەنێم. بەڵام، هەندێ کات یان ئەوەتا دەبێت ئێوە قبوڵی بکەن کەژنێکی بەهێزی تەنها بن، یان دەکشێنەوە و تەنها وەک خانمێک دەمێنێتەوە.

ژنان هەموو ڕۆڵەکان دەگێڕن هەموو کات___جا بۆ وابێت کاتێک شتەکە بەم شێوەی لێ بێت، تۆ ناتەوێت ئەو ڕۆڵە بگێڕێت، تەنانەت کاتێکیش کەدەزانی ئەوەی دەتەوێت و ئارەزوومەندی پێت دەبەخشێت؟ و ماوەیەکی درێژ، ببە بەکچێک کەئاسودەت دەکات، بۆچی دەرفەتێک بۆ پشوودان وەرناگریت؟ بۆخاتری خوا من بەڵێنت پێدەدەم کەئەوە هێندە گران نیە. خۆ نامرێت، ئەمە ڕێک ئەوەیە کەتۆ دەتەوێت.

ئەگەر یەک تۆز ڕێزو پێزانین نیشان بدەیت، پیاو باز دەدات تا ئەو کارەت بۆبکات.

ئەمە سەبارەت بە هاوسەرەکەمە: ڕۆژێک تێ ناپەڕێت کەئێمە چەند جارێک ستایشی یەک نەکەین. بەڵام لەڕۆژێکی تایبەتدا بەم دواییانە، کاتێک منی بەجێ هێشت لای مناڵەکان و خۆی هەندێ کاری ڕۆژانەی دەکرد و هەندێ کاری چواردەوری ماڵەکەی کرد، ئەو منی بینی بوو کە بێزار بووم لەدواکەوتنی مناڵەکان، دواکەوتنی مناڵەکان کارێک نیە من بیکەم، مەبەستم ئەوەیە دەتوانم بیکەم، بەڵام زۆر بێزارکەرە، کەچی کاتێک مارجوری هاتە ژورەوە و بێزاری بەڕوخسارمەوە دیار بوو، زۆر بە جوانی سەیرێکی کردم و وتی:»ستیڤ، زۆر سوپاس کەئاگات لە منداڵەکان بوو ___تۆ باوکێکی نایابیت». کوڕینە ناتوانم پێتان بڵێم کەچەند هەستم بەخۆشی کرد. ڕێک ئەو قسانەی لەدەم هاتە دەرەوە کەمن هیواخواز بووم بیڵێت، تا

ئاگام لەمنداڵەکان بێت و بەبێدەنگی بمێننەوە کاتێک ئەو خەریکی تەواوکردنی ئیشەکانی بوو، ئەگەر ئەم ستایش کردنە نەبوایە من ئاقڵەتم دەچوو لەدانیشتن لەگەڵ منداڵەکان بەدرێژای ڕۆژەکە، لەکاتێکدا زۆر شتی دیکە هەبوو دەمویست بیکەم، بەڵام ئەو ستایشکردنە بیری هێنامەوە کەبۆچی من لەیاریەکەدام و بەتایبەتیش گرنگی بوونی ماجۆری لەتیمەکەدا(خێزانەکەدا).

باشترین ڕێگا بۆ دەرخستنی باشترینی پیاوەکەت، ستایشکردن و بەرز نرخاندنی کارەکانیەتی، نەک کەمکردنەوە و شکاندنەوەی. و باشترین ڕێگا بۆ ستایشکردنی ئەوەیە کەتۆ کچێک بیت و لێی گەڕێ ئەویش پیاو بێت. بەشێوەیەکی تایبەتی.

من لەو باوەڕەدام کەکچ بوون شێوەیەکی هونەری ون بووە لە ئێستادا___شتێک کەهەموو ژنێک دەتوانێت وانەیەکی لێ وەربگرێت. لەبەرئەوە من زۆر بەئازادانە نیشانتد دەدەم کەچۆن ببیت بەکچێک لە هەندێک بارودۆخی گرنگدا کە لەگەڵ پیاوێکدا بیت.

گرەنتیت دەکەم ئەگەر پیاوێک بێت شایەنی ڕێزو ستایش بێت ئەوا هەمیشە لەگەڵت دەبێت.

## چۆن وەکو کچێک بیت لە ژوواندا:

-پێی مەڵێ حەزت لە چ شوێنێکە بڕۆی بۆی تەنها جۆری ئەو خواردنەو ئەو کەشەی پێ بڵێ کەحەزت لێیەتی و چێژی لێوەردەگریت، ئینجا لێی گەڕێ بائەو شوێنێک بدۆزێتەوە کەهەست بکات تۆ لێی ڕازیت و حەزت لێیەتی.

-پێی مەڵێ دەتوانیت شۆفێری بکەیت ـــ لێی گەڕێ بائەو بتگەیەنێت بۆ ئەو شوێنەی کەدەتەوێت.

-پێی مەڵێ دەتەوێت خەرجیەکانی لەگەڵ بەش بکەیت ـــ لێی گەڕێ ئەو بیدات.

-بانگهێشتیماڵەکەتی مەکە ـــ ماچێکی بکە و شەوشادی لی بکە، لێی گەڕێ با بیدۆزێتەوە کەپێویستە چی بکات، تا تو بەدەست بهێنێت(بەڵام نەک پێش تەواوبوونی ماوەی٩٠ رۆژەکە).

## چۆن وەک کچێک دەردەکەویت لە ماڵەوە

ـــ هەوڵمەدە دەستشۆرەکە یان ئۆتۆبێلەکە یان تەوالێتەکە چاک بکەیت، یان هەر شتێکی تر ـــ لێی گەڕێ با ئەو بیکات.

ـــ زبڵەکە فڕێ مەدە و دیوارەکان بۆیە مەکە، چیمەنەکە کورت مەکەرەوە ـــ چونکە ئەمە ئیشی ئەوە.

ـــ شتومەکی قورس هەڵمەگرە ـــ ئەمە ئیشی پیاوە کەخاوەنی ماسولکەی بەهێزە بۆ گواستنەوەی قەنەفە و تەلەفیزۆن و دۆلابەکە و ئەم جۆرە شتانە.

ـــ مەترسە لەئامادەکردنی ژەمێک زیاتر ـــ چونکە مەتبەخ هاوڕێی هەردووکتانە ودەتوانن پێکەوە بیکەن.

ـــ هەموو شەوێک تیشێرتی خەوتن لەبەرمەکە ـــ لەبەرکردنی هەندێک جل و بەرگی سەرنج ڕاکێش زیانی بۆ کەس نیە.



# _١٤_
# چۆن ئەڵقەکە بەدەست بهێنیت.

پیاوەکەت دەزانێت تۆ چیت دەوێت: دوایین ئەرک___ئەڵقەکە.

ئەویش دەزانێت کەخۆی چی دەوێت: تۆ.

شتێکی ئاشکرایە، لەبەرئەوە خۆی دەچێت بۆ لای خشڵ فرۆش و مستیلەیەکی جوان و قورسی ئەڵماس هەڵدەگرێت و دواتر سیناریۆی ئەوە دەکات کە لەسەر چۆک دابنیشێت و تا بڵێت «هاوسەرگیریم لەگەڵ دەکەیت» هەروەک و گۆرانیبێژی بەناوبانگی بـراوەی خـەڵاتـی گرامـی (سـیـەڵ مێد)کە ئەمەی کردووە بۆ نمایشکارێکی جلوبەرگ (هایدی کلۆم)و خانویەکی بەفری لەکەنار دەریا بۆ کردووە، وە هەروەها بانگهێشت کردنی بۆ ئاهەنگ، بەڵام داواکاریەکەی تۆ بەم شێوەیە ڕوونـادات و بە شێوازی ڕەفتاری پیاوەکەدا دیارە، کەنایاتە پێشەوە بەم زوانـە، وە تـۆ هـەر چـاوەڕێ دەکـەی و چـاوەڕێ دەکـەی و کەمێکی تر چاوەڕێ دەکەی، ئەمە چیرۆکی زۆرێک لەژنان و کچانە کەبەجدی تێدەکۆشن نەک تەنها لەبەرئەوەی پیاوەکانیان خۆشدەوێت، بەڵکو دەیانـەوێت بۆ پیاوەکانیانی بسەلمێنن

کەئەوان ژنە شیاوەکەن، وە هەمووان دەزانن بۆئەوەی بیسەلمێنێت کەکەسێکی شیاویت هەموو ئەو شتانە دەکەیت کەلەسەرت پێویستە وەکو ژنێک پاڵپشی کردنی هاوسۆزی پیاوەکەی، وە بەوەفا بیت، وە لەگەڵی بخەویت و پێی بڵێیت خۆشمدەوێی. وە لەوانەیە لەگەڵی بژیت و منداڵی بۆ بخەیتەوە و پەیوەندیەکی زۆر تێکەڵ و نزیکت هەبێت لەگەڵ دایکی و خوشکەکانی و هاوڕێکانی.

بەکورتی، هەموو ئەوەی پێویستیەتی و دەیەوێت پێی دەبەخشیت.

سەیری «نامەکانی سترۆبێری» ئەم جارە بکە، کە لەلایەن گوێگرێکەوە نێردراوە بەخۆی دەڵێت «زەنگی کاتژمێری بایۆلۆجی» ژنێکی تەنهایە و تەمەنی ٣١ ساڵە، وە هیچ منداڵێکی نیە، ماوەی سێ ساڵە لەپەیوەندی دایە لەگەڵ پیاوێکدا:

«ئەو پیاوە پێم دەڵێت خۆشمدەوێیت و دەیەوێت منداڵی بۆ بخەمەوە. کاتژمێرە بایۆلۆجیەکەم زەنگ لێدەدا وەکو شێت. وە ساڵی ڕابردوو هەوڵماندا منداڵێکمان ببێت و من دووگیان ببم، بێ سود بوو(من پێم وایە ئەمە ئاماژەکەیە). من پێم وایە کێشەی من ئەوەیە کەئەو پەیوەندیەکی پابەند و هاوسەرگیری ناوێت، چونکە نایەوێت بەرپرس بێت لەهیچ کەسێک. بەدرێژایی ئەو ماوەی کەپەیوەندیم لەگەڵی هەبوو وا دیار بوو کەمن جیاوازم لەو ژنانەی پێشتر پەیوەندی لەگەڵیان هەبووە، من هەمیشە لەلای بووم کاتێک شتێکی بەسەر بهاتایە،وە وازی لەکارەکەی هێنا کە باوکی مرد، بۆ ماوەی چەند مانگێک بێکار مایەوە، من هاندەری بووم و یارمەتی مادیم دەدا، من چاوەڕوان بووم و بە هیوابووم کە هاوسەرگیریم لەگەڵ بکات، چونکە پێم وابوو

کە کەسێکی دیکە نادۆزمەوە بیەوێت منداڵی لەمن هەبێت، ئایا من گەمژەم کەچاوەڕێی دەکەم؟ وە ئایا هەروا واز لەبابەتەکە بهێنم»؟

ئەم ژنە و ژمارەیەکی زۆرتریش لەدۆخی هاوشێوەی ئەمەدان، کەناتوانن تێبگەن بۆچی دوای ئەم هەموو تێکۆشان و ڕەنجە، پیاو ئامادە نیە یەک شتی پێببەخشێت کەدەیەوێت.

باشە، با بۆتۆش و ئەویشی چارە بکەم، پیاوەکەت داوای هاوسەرگیری لێ نەکردووی لەبەر یەکێک لەم هۆکارانە: (١) یان هێشتا هاوسەری ژنێکی ترە. (٢) یان تۆ ئەو ژنە نیت کەئەو دەیەوێت: یان ئەو وەڵامەی کە نایەوێت گوێبیستی ببێت ئەوەیە کە (٣) تۆ داوات لێ نەکردووە هاوسەرگیریت لەگەڵ بکات و کاتەکەیت بۆ دیاری نەکردووە.

لەڕاستیدا من هەندێک پیاو دەناسم کەژنەکانیان بەدەست هەمان گرفتەوە دەناڵێنن. وە دیارترین نموونە بۆ ئەمە، دوو کەپڵ بۆ ماوەی ساڵێک پەیوەندییان هەبوو، لەکۆتایدا ژنەکە دووگیان بوو، وە بۆ ئەم ژنە تەنهایە(کە کوڕێکی هەیە لەپەیوەندیە شکست خواردووەکەی پێشوویدا) وە دەشیزانی نایەوێت منداڵێکی تر بخاتەوە لەپیاوێک کە ئامادە نیە یارمەتی بدات لەبەخێوکردنیدا، زۆر بەسادەیی بەپیاوەکەی ووت: «من تەنها کاتێک ئەم منداڵە دەهێنمە دونیاوە کەتۆ ببیت بە باوکێکی ڕاستەقینە بۆی، نەک لەو جۆرە باوکانە بیت کە جاربەجار لێرە و لەوێ ئەرکی خۆی بەجێ بهێنێت». وە پیاوەکە لەترسی لەدەستدانی ژن و منداڵەکەش هەنگاوی ناو ڕازی بوو ئامادەبێت لەبەر منداڵەکەی دەستبەرداری شوقەکەی ببێت و گواستیەوە بۆ لای ژنەکە، لەوکاتەی کە ئامادە کاریان دەکرد بۆ لەدایکبوونی کوڕەکەیان.

ئەو ژنە پێی وابوو پێشکەشکردنی ئەڵقە و داوای هاوسەرگیری و ئاهەنگ، دوای لەدایکبونی منداڵەکە ڕوودەدات. وە باوەڕی وابوو کەئەو ئەڵقەی هاوسەرگیری پێشکەشدەکات، بەڵام ئەوە ٧ساڵ تێپەڕبووە بەسەر لەدەستکردنی ئەڵقەی هاوسەرگیری، کەچی هێستا بەئاواتەوەیە و چاوەڕێیە و نزا دەکات کاتێک بۆ هاوسەرگیری دیاری بکات، بەڵام پیاوەکە تا ئەمڕۆش شتی وای نەکردووە، ئەوان هاوبەشن لەماڵەوە لە بەخێوکردنی منداڵەکان و خشتەی خەرجیەکان و وە خشتەی کارکردن وباجی ئۆتۆمبێل، وە بێگومان لەخەوتنیشدا هاوبەشن، بەڵام لەناو ناسنامەدا بەڵگەی هاوسەرگیریان هاوبەش نیە.

ئەو ژنە تێ ناگات بۆچی وانیشان دەدەن خێزانێکن لەجیاتی ئەوە ماڵێکی ڕاستەقینە پێکەوە بنیات بنێن. وە پیاوەکەش پێی وایە کەئەوان خاوەنی ماڵێکن و پێویست ناکات پەیوەندیەکە زیاتر پەرە بسەنێت.

## ئا ئەمە بەزمەکەیە.

سەیرکە، لای هەندێک پیاو هاوسەرگیری لەهەمان کەتەلۆگی «خواردنی سەوزەوات» دایە: خۆتان دەزانن کەخواردنی سەوزەوات کارێکی پێویستە، بەڵام لەڕاستیدا تۆ ئەو کارە ناکەیت، چونکە هەمبەرگر پڕە لە چەوری و سوێری و ساس و لەگەڵ هەندێک پەتاتەی سورەکراو زیاتر خۆشترە و هەست بەتێری دەکەیت. من چەند جارێک پێموتی لەم پەرتووکەدا کەئێمەی پیاو بوونەوەری زۆر سادەین کەئەگەر ژنیش نەبێت هەر ژیانێکی سادە دەژین، وە پارەکانمان لەشتی باقوبریقدا خەرج دەکەین، کاتەکانمان لەسەیرکردنی یارییە

وەرزشیەکان و شتی بێمانادا بەسەر دەبرد، وە پێویستی نەدەکرد ماڵەکە بە پاکوخاوێنی ڕابگرین و پۆشاکی جوان لەبەربکەین، یان هەر شتێکی تر بێجگە لە یارییە ڤیدیۆییەکان، ئێمە دڵخۆشین بەوجۆرە ژیانە، چونکە وامان لێدەکات وا هەست بکەین کەگەنجین و بێخەمین، وە هاوسەرگیری ئەم هەستەمان هەرگیز پێ نابەخشێت.

هاوسەرگیری و بەرپرسیارێتی ئەو هەستەیان تێدا نیە، تاوەکو پیاو ماندوو دەبێت لەڕابواردن و هەستدەکات کەپێویستە گەورە بێت، یان تاوەکو شتێک یان کەسێک پاڵنەری بێت تا گەورە بێت.

بەڵام ئەوەی کەپێویستە تۆ بیزانیت ئەوەیە پیاوان زۆرباش دەزانن کە ژنان هاوسەرگیریان دەوێت. سەرەڕای ئەو سەربەخۆییەی کەژن بە ئاواتیەوەیە، وە سەرەڕای ئەو سەرژمێریانەی دەکرێت کەنیوەی هاوسەرگیریەکانی ئەمریکا بەجیابوونەوە کۆتایی دێت، وە سەرەڕای بەسەربردنی کاتێکی زۆر و ئارەق و فرمێسک لەکارکردندا، بۆ بنیاتنانی پەیوەندیەکی کەموکورت، کەچی ئێوەی ژنان لەکۆتایدا هەر بڕوا بە ئەفسانەی هاوسەرگیری و ماڵ و منداڵ دەکەن.

وە هەروەها، پیاوانیش زۆر بەڕوونی دەزانن دەتوانن ئەو کارانە بکەن کەوا دەربکەوێت بەتەمای زەواج کردنن___تەنها بۆ ئەوەی تۆ بە خۆیانەوە ببەستنەوە و بمێنیتەوە. بروا بکە کەدەڵێم پیاوان تەنها بۆ یەک ئامانج ئەم کارە دەکەن، وە کاتێک پیاوێک بۆ ماوەیەکی درێژ پەیوەندی لەگەڵت هەیە، یان ئەگوازێتەوە بۆلای تۆ، تا لەگەڵت بژی، یان ئەڵقەیەکت بەدیاری دەداتێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دیاریکردنی کاتی هاوسەرگیری ڕەتدەکاتەوە.

بۆیە ئەوە دەکات تا تۆ بەخۆیەوە ببەستێتەوە، چونکە ئەو تۆی دەوێت و ڕەتی دەکاتەوە بۆ کەسێکی تر بێت.

وە من لێرەم تا پێت بڵێم، کە تاکە هۆکار کەوا لەپیاو دەکات دوور بکەوێتەوە لەپەیوەندیەکی درێژخایەن، وە هاوسەرگیری لە بەرنامەیدا نیە، ئەوەیە کەژن داوای دیاریکردنی کاتی هاوسەرگیری ناکات: بەگەمژەیی لەگەڵ خۆشەویستەکەی دادەنیشێت و ڕێگەی پێدەدات داواکارییەکانی بەسەردا بسەپێنێت، سەرەڕای ئەوەی لەگەڵی خەوتووە و وە ئەگەری ئەوەی کە لەگەڵ کەسێکی تر جگە لەم هاوسەرگیری بکات بڕیوە، وە لەهەندێک حاڵەتیشدا گواستوویەتیەوە تا لای ئەم پیاوە بژی، تەنانەت منداڵیشی بۆ خستوتەوە. من بە سادەیی ناتوانم لێرە بمێنمەوە.

## ئەمە لاڵ بوونێکی ئاشکرایە.

مێشکی پیاوەکەت بخوێنەوە، ئەگەر پیاو ئامادە بوو دوای تێپەڕبوونی ماوەیەک ببێت بە خۆشەویستت و لەگەڵت بژی، ببێت بەباوکێکی بەسۆز بۆ منداڵەکانت. وە ئەڵقەی هاوسەرگیری پێشکەشکردی، کەواتە ئەو بەم کارەی خۆی لەلیستی پیاوە فێڵبازەکان خستوتە دەرەوە، وە ناوی خۆی لە ڕاوچی چێژ سڕیوەتەوە، ناتوانێت خۆشەویستەکەی بهێنێتەوە بۆماڵەوە، بەتەلەفون قسەی لەگەڵدا بکات، وە ناشتوانێت هەرکاتێک ویستی بڕواتە دەرەوە، یان شەو لەگەڵی بمێنێتەوە، ئەو دەزانێت کەنابێت پارەکانی بدات بەژنێکی تر، چونکە پەیوەندی لەگەڵ تودا هەیە، بۆچی پیاو پەیوەندیەکی پابەند لەگەڵ تودا قبوڵ دەکات بەلیستێکی پڕ لەو شتانەی «ناتوانێت» بیکات.

چونکە ئەو تۆی دەوێت و نایەوێت لەدەستت بدات.

ئێستا تەنها یەک هەنگاو ماوە بکەیت بەهاوکێشەی هاوسەرگیری:

دیاریکردنی کاتی هاوسەرگیری، چونکە تۆ هەر ئەمەت دەوێت، پێویستە ئەمە بکەیت: هەندێک بنەماو داواکاری بخەنەڕوو بەتوندی بیان سەپێنی و: «من تۆم خۆشدەوێت و تۆش منت خۆشئەوێت و لە پەیوەندیەکی نایابداین ـــ پەیوەندیەک کەهەمیشە ئاواتم بۆ خواستووە و ئێستا دەمەوێت هاوسەرگیری بکەین و من لەبەرئەوە دەمەوێت کاتێک دیاری بکەیت بۆ هاوسەرگیری، و دوای دوو هەفتە بگەڕێرەوە، بەڵام ئەگەر داوای هاوسەرگیری لێنەکردم، تکایە دڵنیابە من دانانیشم و چاوەڕێت بکەم کە کەی زەنگی خۆشبەختیم لێدەدەیت، چونکە دەزانم ئەم ژیانەی ئێستامان هەرگیز دڵخۆشمان ناکات».

ئەمە داواکاریەکی زۆر گونجاو ومەعقولە، و ئەگەر وانەبێت، ئەوا چەند دەخایەنێت تابگەیت بەوەی دەتەوێت ؟ ٤ ساڵ؟ ١٠ساڵ؟ بۆ هەمیشە؟

تۆ ئەو کەسەی کەماوەکە دیاری دەکەیت: بوەستە لەخۆ بەدەستەوەدان و بەکارنەهێنانی هێزو توانات، چونکە لەوساتەوەی کەئێمە دەزانین هیواکانت بۆ هاوسەرگیری دەخەیتە لاوە، ئێمەش ئەو هیوایانە دەخەینە ناو گیرفانمانەوە، و تۆ بەکاردەهێنین لەهەمان کاتتدا، هاوبەشی کردن لەگەڵت ئەگەر خۆت بتەوێت، وەکو گەراجی ئۆتۆمبێل مەبە هەموو کەس بتوانێت بەچەند دۆلارێک بتوانێت ئۆتۆمبێلەکەی ڕابگرێت وبەشێوەیەکی کاتی ئۆتۆمبێلەکەی تیا پارک بکات. پێویستە پیاوەکەت بزانێت کە تۆ زەویەکی ڕاستەقینەیت، تەنها بۆ کڕینیت

ەک بۆ کری.

تێبینی: بابەتەکە ئەوەنیە کەداوا لەپیاوەکەت بکەیت داوای هاوسەرگیریت لی بکات، بەڵکو بابەتەکە ئەوەیە کەواز لەبیرکردنەوەی ١٩٤٥ بهێنیت، کەژن چاوەڕێی ئەوەی لەپیاو دەکرد لیی بپاڕێتەوە بۆ ئەوەی هاوسەرگیری لەگەڵدا بکات، تۆ ئەوە لەمیشکت چەسپیوە»من هەرگیز داوا لەپیاو ناکەم هاوسەرگیریم لەگەڵ بکات»، بەشێوەیەک کە تۆ هەموو هۆشی خۆت لە دەست دەدەی کاتێک بابەتەکە پەیوەستە بەو شتانەی کەدەتەوێت بەدەستی بهێنیت، بەڵام ئێمە چیتر لەساڵی ١٩٤٥ دا نین! گەڕامەوە بۆ ئەو ڕۆژەی کەباوکم هەوڵی دەدا دایکم ڕازی بکات و دڵداریان دەکرد و دواتر هاوسەرگیریان کرد، ئەوکات ژنان دەیانتوانی بەرگەی چاوەڕوانی پیاوان بگرن تا داوای هاوسەرگیریان لێبکەن، چونکە هەڵبژاردنەکانی پیاو لەوکاتەدا سنوردار بووە، ئەگەر ڕێکەوت پیاوێک بوو لە کێڵگە دەژیا، دەبوایە ٢میلی ببڕیایە بۆ کێڵگەکەی نزیک خۆی و کچیشی لێ نەبوو، تەنها دوو کوڕی تری لێدەبوو ، لەبەرئەوە ناچار دەبوو ٢میلی تر ببڕێت تاچاوی بەخۆشەویستەکەی بکەوێت.

چۆن بۆ ژنێکی گونجاو بگەڕایە لەکاتێکدا دەستکەوتنی دانەیەک زەحمەت بوو تا دڵداری لەگەڵ بکات، و هەموو شتێکی دەکرد تا: سەرنجی ڕابکێشێت: پێویست بوو بچێت بۆلای ماڵی کچەکەوە و کورتە نامەی لەسەر بەردەکانی ڕێگاکە دەنووسی، تا هەموان نیازی بزانن. وە تێبینی لەسەر دارەکان بەجێ دەهێشتوو ئاماژەی دوکەڵی بەکاردەهێنا تا کچەکە بزانێت مەسەلە چیە، ئەوە دڵداریەکی زۆر ڕۆمانسی تر بوو لە چاو ڕۆژگاری ئێستاماندا، چونکە پیاوان دەیانزانی دەبێت

بەرەوشتەوە مامەڵە بکەن، نەک تەنها لەبەر دەستگیرانەکەیان، بەڵکو لەبەر باوکیشیان، لەوکاتەدا دەبوو کوڕان بڕۆن بۆ ماڵی دەستگیرانەکانیان و داوای مۆڵەتیان بکردایە تا لەژوورەکەدا پێکەوە دابنیشن، وە تازە پێگەیشتووەکانیش لەهەمان ژوور لەگەڵیان دادەنیشتن، چونکە هیچ ژوورێکی زیادە نەبوو تا بەتەنها لێی دابنیشن، وە ئەو دڵداریە بەوە کۆتایی دەهات کەئەم گەنجە داوای کچەکەی لەباوکی دەکرد، بە بڕوا بەخۆ بوون وشانازیەوە، هەرچیەک باوکی کچەکە بیوتایە هەر ئەوە جێبەجێ دەکرا: ژنان بەدرێژایی ژیانیان وا فێرکراون ئەگەر پیاوێک خۆشیبوێن ئەوا دڵداریان لەگەڵدا دەکات، و داوای هاوسەرگیری لێدەکات، بەڵام ئێستا کێشەکە ئەوەیە ژن ڕاهاتووە یاساکانی سەدەی بیست لەسەدەی بیست و یەکدا بەکاربهێنێت. ئەمڕۆ پیاوان هەڵبژاردەی سنوورداریان لەبەردەستدا نیە، چونکە ئێستا ژمارەیەکی زۆر لەژنان بونیان هەیە، لەهەموو شوێنێک لەگەڵ پیاو کاردەکەن، وە لەبینای شوقەکاندا پێکەوە دەژین و، پێکەوە سواری پاس و شەمەندەفەر دەبن و، لەیانەکاندا تێکەڵ دەبن و، وە تەکنەلۆجیا بەجۆرێک پێشکەوتووە کە دەتوانیت پەیوەندی لەگەڵ ژنێک بکەیت تەنانەت بەبێ ئەوەی بیشیهێنیت. وە چیتر لەساڵی ١٩٤٥ دا نین و ناتوانیت ئەو ڕێگا کۆنە بەکاربهێنیت، دەبێت واز لەو قسە بهێنیت کەدەڵێت « ئەگەر نیازی بێت هاوسەرگیریم لەگەڵ بکات، ئەوکات داوام دەکات». چونکە ئێمە داوات ناکەین کاتێک زۆر زوو خۆت بدەی بەدەستەوە و ئێمەش یاریت پێدەکەین، ئەگەر بنەما و یاسا و داواکاریەکانت نەسەپێنیت تاپێوەی پابەند بین.

من ناڵێم لەبەردەمیدا چۆکدابە و داوای لێبکە هاوسەرگیریت

لەگەڵ بکات، بەڵکو داوات لێدەکەم ماوەیەکی بۆ دیاری بکەیت تائەڵقەت پێشکەش بکات و کاتی هاوسەرگیری دیاری بکات، دەبێت تو ئەوەی پێ بڵێیت.

من دەزانم ئەمە کارێکی قورسە، بەڵام لێگەڕێ با شتە قورسەکەت پێ بڵێم: ژوان و پێکەوە ژیان و خستنەوەی منداڵ لەپیاوێک کەهەرگیز نیازی هاوسەرگیری کردنی نیە لەگەڵت. بەجێت دەهێڵێت، دوای تێپەڕبوونی ٨ساڵ بەسەر پەیوەندیەکەتاندا، تۆش ناچاریت بەدوای پیاوێکی نوێ دا بگەڕێیت و هەموو ئەو خەرجیانە بدەیت کەپێشتر لەگەڵ کەسێکی تردا بەشتان کردبوو بۆ ماوەی ٨ساڵ و دەبێت خۆت منداڵەکان بەتەنها بەخێو بکەیت، دەتوانیت ئەم کارە بکەیت، بەڵام تەنها دەبێت بزانیت کەئەمە چەند کارێکی قورس دەبێت بۆ تۆ.

هەموو ئەوەی کەمن بۆت پێشنیار دەکەم ئەوەیە، زۆر زوو خۆت دەرباز بکە لەم کاتە کورتە بێزارکەرە___بەوەی کەپێی بڵێیت چاوەڕێی چی لێ دەکەیت، وە ڕوونی بکەرەوە کەتۆ چەند مرۆڤێکی گەورەو گرانی، وە بەدەستهێنانی تۆ هەرگیز کارێکی هێندە ئاسان نیە.

پێی بڵێ: «من ڕێزت دەگرم و شەیدای تۆم وە خۆشمدەوێی ___ من زۆر پەیوەستم بەکاتەوە، من میهرەبان و وەفادارم و منداڵت بۆ دەخەمەوە، وە لەداهاتووشدا زۆرم خۆشدەوێن، وە من ئامادەم هەموو ئەمانە پێشکەش بکەم بەکەسێکی شیاو، من پێویستم بەکاتی تۆو بەوەفایت و پاڵپشتی وسۆزت و گرنگی پێدانت و ڕاستگۆیت و میهرەبانیت وجوامێریت هەیە___ وە دەمەوێت دەرگای ئۆتۆمبێلم بۆ بکەیتەوە وکورسیەکەمم بۆ بجوڵێنیت دانیشم، وە ڕێزی خۆتم نیشان بدەیت، وە لەسەرو

هەموویانەوە خۆشەویستی خۆتم پێ ببخەشیت، و من چاوەڕێی ئەوەت لێدەکەم ئەڵقەی هاوسەرگیریی ئەڵماسم پێ ببەخشیت بەبۆنەی چوونە ناو ژیانی هاوسەریتیەوە»

کاتێک پیاو گوێی لەمە بوو، ئەوکات هەڵوێستەیەک وەردەگرێت کەتۆ ڕێزێکی بەرزت بۆ خۆت دیاری کردووە، سەیری باباتەکە دەکات وپرسیار لەخۆی دەکات: کەئایا تۆ شایەنی ئەم هەموو شتەی؟ «وە ئەگەر ئەمە بۆ ئەو زۆر قورس و لە ڕادەبەدەر بوو، ئەوا بەجێت دەهێڵێت و دەڕوات بۆ شوێنێکی تر، وە هەرچۆنێک بێت تۆش پیاوێکی وات ناوێت وانیە؟ ئەو تەنها دەیەوێت تۆ بەکرێ بگرێت و بەکارت بهێنێت، هەروەک دەزانین کرێچیەکان گرنگ نیە بەلایانەوە موڵکەکە چی لێ دێت، وە لایان گرنگ نیە وێران بێت و دابڕمێت، چونکە ئەوان بەکاری دەهێنن وکاتێکیش شتێکی باشتریان دۆزیەوە دەگوازنەوە بۆ شوێنێکی تازەو باشتر لەمەی ئێستا.

تۆ پیاوێکت دەوێت کەئامادەی کڕین بێت نەک کرێ، پیاوێک کە بێت و بۆ هەمیشە لەگەڵ تۆ بژی، بەدرێژایی تەمەن، پیاوێک کەگرنگی بە باخچەکە بدات و ئاگای لەبۆری ئاوەڕۆکان بێت ودیوارەکان بۆیە بکات، وە کەلوپەلی ناوماڵەکە بکڕێت و خەرجیەکان لەکاتی خۆیدا بدات، پیاوێک کەبەڕاستی خانوەکە بکات بە ماڵ بۆت. ئەو کەسێکە کە هەڵگری بەرپرسیاریتیەو بەوشێوەی دەتەوێت داوای هاوسەرگیریت لێدەکات.

لەکۆتایدا کوڕەکان کوخ دروست دەکەن، بەڵام پیاوەکان ماڵ بنیاد دەنێن

داوای لێبکە پیاو بێت، وە تۆش ئێستا دەزانی ئەگەر ئەو تۆی خۆشنەوێت هیچ یەکێک لەمەرجەکانت قبوول ناکات، بەڵام

ئەگەر خۆشی بوێت دابینکەرت دەبێت وخۆشەویستی خۆیت بۆ دەردەبڕێت ودەتپارێزێت، ئەگەر بەڕاستی خۆشی بوێت لەکۆتاییدا پێت دەڵێت: «ئەمە ژنەکەمە» دەتوانێت لەسەرەتادا رازی بێت بە: «ئەمە خۆشەویستەکەمە» یان ئەمە «دایکی منداڵەکەمە» یان تەنانەت: «ئەمە دەستگیرانەکەمە» بەڵام دوای تێپەڕبوونی دوو ساڵ پێویستە لەژێر ئەم نازناوە بێتە دەرەوە، تۆ شایەنی ئەوەیت کەڕاشکاو بێت لەگەڵتدا، چونکە ژنان لەپەیوەندیدا هیچ شتێک ناکەن هەتا ڕوون و ئاشکرا نەبێت بۆیان، هەمووتان دەتانەوێت ئەم شتانە بزانن: چارەنووسی ئەم پەیوەندیە بەرەو کوێ دەڕوات؟ ئایا بەڕاستی خۆشت دەوێم؟ ئایا من ژنێکی شیاوم؟ ئەوداهاتووە چیە کەئێمەی تیا دەبینیتەوە؟

بەکورتی و پوختی ئەمە هەمووو بابەتەکەیە___چونکە هەموو پیاوێک دەزانێت کە هەر دێتە ڕێگای، لەوانەیە ئێستا ئامادە نەبێت، بەڵام ئەگەر ئامادە نەبوو وە تۆش ئامادە بوویت، واتای ئەوەیە کەگونجاو نین بۆ یەکتری، وانیە؟ لەبەرئەوە بۆچی دوو ساڵی بەنرخی ژیانت بەفیڕۆ دەدەیت لەشتێکدا کە بەئاراستەیەکی ڕاستدا ناڕوات؟ لەجیاتی ئەوەی بگەڕێیت بەشوێن کەسێکی تردا تابڕوات بۆ ئەو جێگەی کەتۆ دەتەوێت.

من پێموایە ئەمە هۆکاری هەبوونی زۆرێک لە ژنانە کەتەمەنیان لە سی ساڵیدایە و هێشتا هاوسەرگیریان نەکردووە، چونکە ئەوان لەشوێنێکی سەر هێڵەکەدا پێداگریان نەکردووە، وە شوێن پێی خۆیان جێگیر نەکردووە، وە هەنگاویان نەناوە، وە من دەتوانم لەئەزموونی خودی خۆمەوە پێتان بڵێم خانمان: دەبێت پێداگری بکەیت و هەندێک یاسا و بنەما و مەرج دابنێیت، سەیرکە بزانە چۆن بەخێرایی دێتە سەر هێڵ، من بۆ

هاوسەرگیریم لەگەڵ مارجوری کرد (ژنەکەم)؟ چونکە کاتێکی بۆ دیاری کردم و بنەما و مەرجی بۆ دانام.

من ئەو مەرجانەم هەر لەسەرەتای پەیوەندیەکەمانەوە زانی؛ وە هەر ئەو شەوە زانیم کەخەریک بوو پەیوەندیەکەمان کۆتایی پێ بێت، وە ئەوکاتە زانیم کەگەڕاندمەوە، وە ئەتوانم پێتان بڵێم ئەگەر هێشتا لە کۆمپانیای فۆرد کارم بکردایە و هاوسەرەکەم پێویستی بە ٤٠٠$ بوایە لە موچەکەم کە ٦٠٠$ە، بەدڵنیاییەوە دەمدا پێی، چونکە دەمەوێت بیپارێزم، وە ئەویش وام لێدەکات شانازی بەخۆمەوە بکەم کەمێردی ئەوم، وەتۆش دەتوانی ئەمە بەدەست بهێنیت.

چیرۆکێکی دیکەی دڵشکان مەبە، یەکەم کەس بیر لەخۆت بکەرەوە__ هەوڵبدە بگەی بەو شوێنەی کەخۆت دەتەوێت، وا لەپیاوەکەت بکە ببێت بەوەی کەدەتوانێت ببێت و بیهێنیتە دی، وە بیرت بێت: هۆکاری یەکەمی شکست ترسانە لەخودی شکست خۆی. چونکە ترس لەجوڵەت دەخات و ڕێگریت لێدەکات دەستبەکاربیت، مەترسە لە لەدەستدانی، چونکە ئەوپیاوەی بەڕاستی خۆشیدەوێیت ناڕوات بۆ هیچ شوێنێک و بەجێت ناهێڵێت.



# بەشی چوارەم
# لە خۆشەویستیەوە بۆ ژنی (هاوسەری)

بۆ هەمیشە دڵی ببەرەوە



## __١٥__
## بەڕێوەبردنی فایلە کۆنەکان
## چۆن جڵەوی خۆت بکەیت کاتێک ڕابردوویت بۆ دەرکەوت

خانمان ئەگەر تۆ پەیوەندیت لەگەڵ پیاوێکدا هەیە کەلەسەروو سی ساڵەوەیە، دڵنیابە کەپێشتر هەر یەک یان دوو کەس لەژیانیدا هەبووە، وە تۆش نازانیت کەی و لەکوێ لێت پەیدا دەبن، بەڵام بڕوا بکە، کاتێک دەردەکەوێت کە کەمترین پێشبینیت هەیە بۆی، لەوانەیە لەئاهەنگێکی کار یان یادی لەدایکبونی هاوڕێکەت، یان لەوانەیە لەهەر کاتێکی تردا بێت.

پێش ئەوەی بترسیت، ئەمە چەند ئامۆژگاریەکی سەرکەوتووە تا ئارام بیت و جڵەوی خۆت بکەیت کاتێک فایلی خۆشەویستە کۆنەکەی کرایەوە.

١_ هێمن بە: کاتێک خۆشەویستە کۆنەکەی هاتە سەر ڕێت ئارام بە، لەسەرخۆ بە، ئاسودە بە. وازبێنە پیاوەکەت ئەم مشتومڕە بکات و کێشەکە چارەبکات ،ئەگەر بەڕاستی تۆ و پەیوەندیەکەتانی لا گرنگە، هیچ کێشەیەکی نیە و لاشی ئاساییە

کە بە هاوڕێ کۆنەکەیت بناسێنێت، وە ئەم ناسینە سەرپێییە دەرفەتێکی باشە بۆ ئەوپیاوە تا بیسەلمێنێت کەبەرپرسیارە لەتۆ و تۆش نیشانی خۆشەویستە کۆنەکەی بدات. وە ئەگەر ئەم دەرفەتەی بەکارنەهێنا تا ئاشکرای بکات کە لە پەیوەندییەکی نوێ دایە، ئەوکات تۆ هەموو مافێکت هەیە پرسیاری ڕەوشی پەیوەندیەکەتان بکەیت و هەستەکانت بڕەوێنیتەوە لەبارەی خۆشەویستە کۆنەکەی.

٢_ دڵنیابە (ئەرخەیان بە): مەهێڵە مێشکت لەسەر خۆی نەمێنێت و دەست بکەیت بە بەراوردکردنی خۆت و خۆشەویستیە کۆنەکەی. لەوانەیە ئەو باڵای بەرزتر بێت، لاوازتر بێت، بەتواناتر بێت، بەڵام ئەمانە هیچ نین بە بەراورد بەتۆ و ناوازەیت، چونکە هۆکارێک هەیە کە ئەو خۆشەویستی کۆنی پیاوەکەتە و ئێستاش تۆ شاژنی دڵی ئەو پیاوەیت.

٣_خۆت بە: کاتێک بابەتەکە کرایەوە و گفتوگۆ سەری هەڵدا، سڵاوێکی بەڕێز و بەبڕوا بەخۆبوونەوە لەخۆشەویستە کۆنەکەی بکە، و بەڕاستی خۆت بە، وە پێویست ناکات هیچ ڕەفتار و نمایشێکی ساختە بکەیت و دەستکەوتەکانت جاڕ بدەیت بۆ ژنێک کەتەنانەت ناشی ناسیت. بەو شێوەیەبە کەهەیت و خۆت بە.

٤_ ڕێک پۆش و شۆخ و شەنگ بە: ئەگەر بتوانیت هەست بکەیت کەژنە کۆنەکەی وا دەردەکەوێت، سەرنجڕاکێش و شۆخ و شەنگ نەبێت ئەوا تۆ خێرا دەست بەکاربە و، ڕێک پۆش و شۆخ و شەنگ بە، نزم مەبەرەوە بۆ ئاستی ئەو و قسەی ڕەق مەکە و پۆزی بەسەردا لێ مەدە. وا لە پیاوەکەت بکە بزانێت تۆ دەتوانیت هەموو کاتێک وەک خانمێک دەربکەویت، لەژوانی

ئەم سەردەمەدا، ئەگەری زۆر زۆرە سەرکێشیەکانت لەژواندا لەگەڵ پیاوێکدا بێت کەخاوەنی منداڵ بێت لەپەیوەندی پێشوویدا. ئەگەر منداڵەکانی تۆیان لاپەسەند نەبوو، وە تۆش گەشتیت بەو ئەنجامەی کەپێویستە کاتێکی زیاتر بەسەر ببەیت لەگەڵ منداڵەکانیدا، بەم شێوە بەرەوپێش دەچێت، تا پەیوەندیەکی باش لەگەڵ دایکیاندا درووست بکەیت.

٥_ ڕاستگۆبە: جەخت بکەرەوە کەپیاوەکەت کاتێکی تەواوەتیت بداتێ بۆ چاوپێکەوتنی دایکی منداڵەکانی و دەستپێکردنی بنچینەیەکی پتەو بۆ پەیوەندیەکی متمانە پێکراو. با ژنەکەش بزانێت کەتۆ کێیت و چۆن کات لەگەڵ منداڵەکانی بەسەر دەبەیت، ئەگەر خۆت دایک بێت، دەزانیت کە چەند گرنگە بزانێت ئەوکەسانە کێن کەدێنە ناو ژیانی منداڵەکانتەوە و تێکەڵیان دەبن، وە دڵنیابە کەهەمان ئاسوودەیی بەڕەوشت بەرزییەوە بەم ژنە دەبەخشیت.

٦_ خۆڕاگر و دڵ فراوان بە: چاوەڕێ مەکە ژنە کۆنەکە خۆی ئۆتۆماتیکی لەگەڵت بکرێتەوە، چونکە تۆ نازانیت کەپەیوەندی پێشتری نێوان پیاوەکەت و ئەم ژنە بەچ شێوازێک بووە، لەوانەیە ژنەکە بەڕێز و مرۆڤ دۆست دەربکەوێت، بەڵام لەناخەوە هیچ ئاسوودە نەبێت بەم پەیوەندیە نوێیەی پیاوەکەی، وە ئاسوودە نەبێت کەمنداڵەکانی بەم ژنە تازەیە بناسێنێت. کات و مەودایەکی پێ بدە کەپێویستیەتی تا ئاسوودە دەبێت و ڕادێت لەگەڵ ئەم پەیوەندیە نوێیە.

٧_ تێگەیشتوو بە: ئەگەر زیاتر لەچەند مانگێک تێپەڕیوە کەچی هێشتا پەیوەندی نێوان تۆ و ژنە کۆنەکەی سارد و سڕە، داوای لێ بکە گفتوگۆیەکی ژنانە ئەنجام بدەن دەربارەی

پەیوەندیەکەت. ئەگەر لەگەڵت کرایەوە کاتی پێ بدە تاباسی خەم و خەفەت و ترسەکانی خۆیت بۆ بکات. وازی لێ بێنە گوازرشت لەبیروبۆچونەکانی بکات لەبارەی بەسەربردنی کات لەگەڵ منداڵەکانیدا، وە لەهەمان کاتیشدا لە ئاستی خۆت کەم مەکەرەوە، ئاگاداربە کەئەم ژنە ڕێز لەتۆ و پەیوەندیەکەشت بگرێت. ئەگەر گفتوگۆکردن نەگونجاو وشیاو نەبوو لەوانەیە ئەوە کاتە گونجاوەکە بێت تا دوور بکەوێتەوە کەئایا گونجاوە بەشداربیت لەژیانی منداڵەکانیدا؟

ئێمە هەموومان فلیمەکانی هۆلیود و لەبەرنامەی تەلەفیزیۆنیشدا بینیومانە کەلەوانەیە ژنە کۆنەکەی پیاوەکەت خواردنەوە بکات بە ڕووخساری پیاوەکەتدا و پەنجەی هەڕەشەش بەڕووی ژنە نوێیەکەیدا بەرز بکاتەوە، لەژیانی ڕاستی خۆتدا نابێت ڕێگا بدەیت کەژنی پێشوو ببێت بە بەشێکی ناشرینی ژیانت. ئەگەر هێشتا بەزم و ڕەزم هەر لەنێوان پیاوەکەت و ژنەکەی پێشوویدا هەیە، ئەوا لێی گەڕێ با خ. ۆ. ی ئەم کێشانە چارەسەر بکات. ئەمە کاری تۆ نیە خۆت بخەیتە ناو بارودۆخێکەوە کەپێش پەیوەندیەکەی تۆ ڕوویداوە، ئەگەر دووبارە فایلەکانی خۆشەویستییە کۆنەکەی سەریهەڵدایەوە لەپەیوەندیە نوێیەکەتاندا، ڕاشکاوبە و ڕێگری لەهەر بێ ڕێزیەک بکە بەرامبەرت، یان ڕاستەوخۆ بەڕاشکاوی قسە لەگەڵ پیاوەکەتدا بکە. خانمان، پێویست ناکات بەپێی هۆلیود بڕۆیت، یان خۆت بەکەم بزانی لەکاتێکدا شاژنی. تۆ دەتوانیت ببیت بەژنێکی مەزن و بڕوا بەخۆت بهێنیت کەوایت، کاتێک مەرج و بنەمات دانا. وە ڕێگەش بەژنە کۆنەکەی دەدەیت کە لەهەمان پێوانەی خۆیدا بێت.



## __١٦__
# دەست پێکی ٩٠ ڕۆژەکە بژمێرە

لەئێستادا، یاسای ٩٠ ڕۆژییەکەم بووە بەڕێبەرێک بۆ زۆرێک لەژنان، من ئەوە دەزانم بەهۆی پێداگریت و دەستگرتن بەسەر ئارەزووەکاندا، وە تۆ بەڕاستی بنچینەیەکی زۆر باشت داناوە بۆ ناسینی پیاوێکی تازە لە ژیانتدا، وە دیاری دەکەیت ئایا شایەنی دانەیەک لەمولکە هەرە بەهادارەکانتە! مادام تۆ بنچینەی یاساکە دەزانیت. ژمارەیەکی زۆر لە ئێوەی خانمان پرسیارتان لێکردم: «ستیڤ ئێمە پێویستە چی بکەین لە سەرەتای ٩٠ ڕۆژەکەدا، چۆن سەرنجی لەسەر خۆم بهێڵمەوە، هەتا ئەوکاتەی ئامادەبێت پەیوەندییەکەمان تەواو بکەین لەڕووی جەستەییەوە؟» هانێ ئەوە پەرتووکی یاری سێ مانگەیە بۆ ئەوەی چۆن بتوانیت ئەو لەپەیوەندیدا بهێڵیتەوە لەگەڵ خۆت لەکاتێکدا تۆ چاوەڕوانیت.

# مانگی یەکەم

لەم قۆناغەی ژواندا، تەنها بەناوهێنانی مچورکە بەهەموو لەشدا دێت، ناتوانیت خۆت ڕابگریت هەتا ژوانی دواتر، وە باشترین هەوڵی خۆت دەخەیتەگەڕ تاوەکو ڕێگری لەخۆت بکەیت زیاتر لەپێنج جار تەلەفۆنی بۆ نەکەیت لەڕۆژێکدا، وە ئەویش بەڕاستی کەوتۆتە ناو جادوەکەتەوە، لەبەرئەوە خێرا باز مەدە، هەر بانگهێشت کردنێک و هێندە پەرۆش بیت بۆی تا وای لێبکەیت بایەخی بۆت لەدەست بدات، وا لەپیاو بکە کەمێک لەپێناوت تێبکۆشێت. خانمان، پیاو بەلایەوە گرنگ نیە ئەگەر چەندین میلی زیادە ببڕێت لەپێناو خۆشەویستی تۆدا. تۆ چاو لەڕێت کردووە، چونکە سەرقاڵی بەژیانی خۆتەوە. دڵنیابە کەئەم سێ ڕۆژەی یەکەم بە سەرقاڵی بمێنیتەوە لەڕێی تیشک خستنە سەر ئەو شتانەی کە خۆشتدەوێن. وەکو سەردانی کردنی هەمیشەیتان بۆ ئارایشتگای جوانکاری نینۆک بۆ دەست و قاچ لەگەڵ دایکتدا، یان شەوێک بەسەر ببە لەگەڵ هاوڕێکانت لەناو شار.

لەوانەیە باشتربێت ژمارەیەک ئەستێرەت هەبێت لەچاوەکانتدا، بەڵام مەهێڵە وات لێبکەن کەئەم شتە بەنرخانەت لەدەست بچێت تا تۆ ___ بناسێت ___ لەمانگی یەکەمدا.

١.ئەو شتانە بزانە کە حەزی لێیەتی:

ئایا بۆینباخی ئاسایی لا پەسەندە یان بۆینباخی قردیلەی بچوک؟ ئایا حەزی لەبیانیە یان فلیمی بەناوبانگی ئاکشن؟ حەزی لەگفتوگۆیەکی هێمنە یان لەناو ژاوەژاودا؟ دەست بکە بەتێبینی

کردنی ئەو شتانەی ئەو پیاوە دڵخۆش دەکات.

٢. جێگیر و قورس بە لەو بابەتانە کەهی باسکردن نیە:

ڕاستە ئەو پیاوێکی نایابە، بەڵام مەیلی درەنگ کەوتنی هەیە، وە ئێستا توش زۆر چاو لەڕێی، چونکە هەمیشە درەنگ گەشتنەکانی بەپاوەری چەپکێک گوڵ یان چەند ووشەیەکی شیرین دڵە بەستووەکەت دەتوێنێتەوە. خانمان، پێتان دەڵێم، لەوانەیە ئەم خوە بچوکە بێزارکەرانە لەسەرەتای پەیوەندیەکەتاندا مەنطیقی نەبێت، بەڵام دەبن بەشتانێک کەوات لێدەکات مێشکت لەدەست بدەیت لەگەڵ پیاوەکەت، دەزانم لەوانەیە وا بیر بکەیتەوە کە سێ ڕۆژ زۆر زووە تا ڕەخنەی لێبگریت لەسەر شتێکی زۆر بچووک، بەڵام ڕاستگۆیی باشترین سیاسەتە لەم قۆناغەی یارییەکەدا بۆ پارێزگاری کردن لەپەیوەندیەکەتان و هێشتنەوەی لەسەر هێڵی خۆی و باشترین دەرفەتت دەداتێ تا یەکتری بناسن.

٣.مەرج و بنەماکانت بەرز ڕابگرە:

خانمان، هەروەکو پێشتر چەند جارێک پێم وتوون، کۆمەڵێک مەرج و بنەمای تایبەت بەخۆتان دابنێن، وە پابەندبە پێیانەوە، ئەگەر ئەو پیاوە بەڕاستی شایەنی کات و ووزە و توانای تۆ بێت، یەکەم شت پەیوەندیەکەتان بەوە دەست پێ بکە مەرجەکانتی بەڕوون و ئاشکرایی پێ بڵێ و دڵنیاش بە کەئەو پابەند دەبێت بەیاساکانتەوە، نابێت هیچ قسەی شیرین و چاو تێ بڕینێک وات لێبکات مەرجەکانت دابەزێنیت و کەمیان بکەیتەوە.

٤.بنچینەیەک بۆ پەیوەندیەکەتان بخەرە ڕوو:

من دەزانم کەئێستا ئەو پیاوە بووە بەهێزی ئەژنۆت و تەواوکەری یەکترن، بەڵام ئەگەر خۆی بە واقیعی لەبابەتەکە

بزانین پێویستت بە هاوڕێیەکی بەهێز هەیە تامەودای پەیوەندیەکەت ببڕیت. دوو هاوسەری سەرکەوتوو کە دەیانناسم ماوەی زیاتر لە دە ساڵە پێکەوەن، هەمووان تێبینی ئەوەیان کردووە کەهاوڕێیەتی بەردی بناغەی پێکەوە بوونیان و یەکگرتوویان بووە، کاتی خۆت وەربگرە تا بیناسیت و بزانیت چ شتێکی لا گرنگە و هاوڕێ ڕاستەقینەکانی کێن و هەست و سۆزی بەرامبەر چی دەجولێت، فێربوونی ئەم شتانە و زانینیان دەربارەی پیاوەکەت نەک تەنها گفتوگۆیەکی باش دەکەیت لەگەڵی، بەڵکو ئەم شتانە کلیلی ئەوەت دەداتێ ببیت بە هاورێی.

٥.زەنگێک دابنێ بۆ پەیوەندیەکی بەهێز و ئاشکرا:

لەم سەردەمی نامە و تۆڕی کۆمەلایەتیدا، ئەگەری زۆرە بەشێکی زۆری پەیوەندیەکانت لەڕێگەی مۆبایل و کۆمپیوتەرەوە بێت، بەلام دڵنیابە کە مەرج و بنەمای رەسەن دابنێیت بۆ گفتوگۆیەکی دڵ___بۆ___دڵ، وە بەتایبەتی ئەگەر ئەو کونەپەپویەکی شەوان بێت و تۆش باڵندەیەکی بەرە بەیان بیت، لەوانەیە جوان نەبێت کاتژمێر شەشی بەیانی نامەی بۆ بنێریت و بڵێیت: «من ئێستا بیر لەتۆ دەکەمەوە» ، ئەوە زۆر گرنگە کەتۆ یاسای پتەو و جێگیر و دامەزراو دابنێیت لەقۆناغە سەرەتاییەکانی پەیوەندییەکەتدا لەبارەی پەیوەندی کردنتان پێکەوە بەشێوەیەکی شیاو، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا گفتوگۆکەتان بە سەرنج ڕاکێشی بهێڵەرەوە.

## مانگی دووەم

سەرەتای پەیوەندیەکەت هێشتا دەبریسکێتەو و کاتێک کەناوەکەی دێتە سەر شاشەی مۆبایلەکەت، لەژوورەکەوە ڕادەکەیت و باڵدەگریت تاوەکو وەڵامی بدەیتەوە، بنەما و مەرجەکانت لەجێی خۆیاندان و لەهەمان کاتیشدا فێربوونی شتی نوێ سەبارەت بەیەکتر شتێکی پێویستی ڕۆژانەیە. دەتوانیت ئەم جۆش و خرۆشە درێژە پێ بدەی لەمانگی دووەمدا لەڕێگەی ئەم ڕێبەرەوە

**١.بە هەندێک شتی بچووکدا بیناسەرەوە:**

ئایا سوپرایزت بۆ دەکات بۆ نانی نیوەڕۆ؟ یان ئایا ئۆتۆمبێلەکەت بۆ دەشوات و تانکی گازەکەت پڕ دەکات بەبێ هیچ هۆکارێک؟ هیچ شتێک دڵی پیاو گەرم ناکاتەوە هێندەی ئەوەی کە سوپاسگوزاری بیت و ستایشی بکەیت لەسەر ئەم شتە بچووکانە.

**٢.پێکەوە بچن بۆ پەرستگا:**

کرانەوە و ئامادەیی بۆ زانینی بنچینەی باوەڕی و ئاینی یەکتری، هەنگاوێکی زۆر باشە بۆ قوڵبوونەوە لەناسنامەی یەکتری و، ئەگەر پیاوەکەت پێشنیاری بانگهێشتکردنی کردی بۆ کڵێسە یان مزگەوت، ئەوا بەشەرەفێکی گەورەی بزانە و بەچاوی ڕێزەوە سەیری بکە، ئەگەر خۆی نەڕۆیشت بۆ کڵێسە تۆ لەگەڵ خۆتدا بیبە.

**٣.پێکەوە شتی تازە تاقیبکەنەوە :**

دڵنیام ئێستا تۆ زیاتر لەچەند جارێک نانی ئێوارەتان

پێکەوە خواردووە و سەیری فلیمتان کردووە بەیەکەوە ئێوارەی ئەم سێ ڕۆژەی ڕابردوودا، چوارچێوەکان (قاڵبەکان) بشکێنە و پێی بڵێ باپێکەوە بچین بۆ خولی چێشتلێنان. وە پلان دابنێ مێوەڕوانی شەممە کاری خۆبەخشی بکەن لە خانەی بێ سەرپەرشتان. بەسەربردنی ڕۆژی خۆش و جێی بایەخ هاوکار دەبێت بۆ هێشتنەوەی پەیوەندیەکەت بەتازەی و گەرموگوڕی.

٤.ووردبین بە (بەدیقەت) :

تۆ بەزۆری ئەوت بەهێمنی و ئارامی بینیوە، وە لایەنی باشی ئەوت بینیوە، بەڵام ئەی ئەگەر لەژێر فشاردا بوو چۆنە؟ چۆن ڕەفتار لەگەڵ دایکیدا دەکات؟ چۆن ڕەفتار لەگەڵ کارمەندی چێشتخانە دەکات؟ یان چۆن ڕەفتار لەگەڵ شۆفێری تاکسی دەکات لەشەقامەکاندا؟ ئەم شتە بچووکانە بکە بەپێوەر و کیلیک، تا دڵی ئەو پیاوەی پێ بکەیتەوە و بزانیت چی لەدڵیدا هەڵگرتووە. (سەیری ئامۆژگارییەکانم بکە لە «ئاڵاکان لە یارییەکەدا « ).

٥.بواری بدە لەبەر تۆ لات بێت:

ئەگەر تۆ شەکەت و بێزار بوویت، یان ڕۆژێکی ماندووکەری کارکردنت تێپەڕاندبوو، دەتوانیت پەیوەندی پێوە بکەیت تا بێت بۆ لات. ئەمە تاقیکردنەوەی پیاوەتی ئەو نیە. بەڵکو دەرفەتێکی باشە تا بۆت دەربکەوێت کاتێک ژیان هەراسانی کردوویت، ئایا بەراستی ئەو پیاوەیە کە پشتی پێ ببەستیت.

## مانگی سێیەم

زۆرباشە ئەم پیاوە زۆر بەرز ئامانجی داناوە وپێشبینیە زەحمەتەکانتی تێپەڕاندووە، هەموو ئەو کیک و سوپرایزانەی کە لە دوای کۆبوونەوە قورسەکانی بەڕێوبەرەکەت پێشکەشی دەکردی باشترین بەرکەوتە بوو لەگەڵ تۆدا.

### ئاڵاکان لە یارییەکەدا:

کاتەکانت لەگەڵ ئەم پیاوەدا هیچی کەمتر نەبووە لەجادوویەک، بەڵام هەندێک شتی لێرە و لەوێ کردووە لەماوەی دوو مانگی یەکەمدا، تا واتلێبکات هەڵوێستەیەک وەربگری، کاتێکی زۆر تێپەڕیوە بەسەر ئەوەی کەئەم پیاوە شایستەیە ئۆتۆمبێلەکەی خشاندووە لەشوێنی ڕاگرتنی ئۆتۆمبێلەکەت، ئایا ئەم خووە خراپانەی شایەنی ئەوەیە لەمۆبایلەکەت بیسڕیتەوە و لە لاپەڕەی تایبەتی فەیس بووکی خۆت بلۆکی بکەیت؟ (دەزانیت چیت لێدێت کاتێک ڕەنگی سور دەبینیت) ئەمە پێنج ئاڵای یارییەکەیە کە دەبێت لێیان دڵنیا ببیتەوە و بیانپشکنیت پێش ئەوەی بچیتە سی ڕۆژی کۆتاییەوە.

**ئاڵای٥:**

تەنها کاتێک تۆ دەتوانیت چاوت پێی بکەوێت کە بۆ ئەو بگونجێت (برەخسێت).

**ئاڵای ٤:**

خووی خراپی هەیە لەگەڵ مۆبایل: لەپڕ مشەوەش دەبێت و بە بەردەوامی تەلەفۆنەکانی کەبۆی دێت ڕەتی دەکاتەوە کە لەگەڵ تۆدایە، تا ٢٤ کاتژمێر تێ نەپەڕێت پەیوەندی بەتۆوە

ناکات و تەنها نامە بەکاردەهێنێت بۆ قسەکردن لەگەڵ تۆ.

ئاڵای ٣:

ڕەتی دەکاتەوە کە بەهاوڕێکانی و کەسە خۆشەویستەکانیت بناسێنێت.

ئاڵای ٢:

زۆر گوماناوی و بە بەهانەیە سەبارەت بە ڕابردووی. وە دەڵێت پێویست ناکات هیچ بزانیت دەربارەی هێڵی دەستبەسەری لەپۆلی سێ دا، بەڵام ئا لەم خاڵەدا تۆ پێویستە کۆمەڵێک وردەکاری بزانیت دەربارەی ڕابردووی، وەک و جیابونەوەی لە هاوسەرەکەی یان هەبوونی منداڵ لەپەیوەندی پێشویدا.

ئاڵای ١:

لەشوێنە گشتی و قەرەباڵغەکاندا پشتگوێت دەخات و هیچ سۆزێکت پیشان نادات. ئاگاداری ئەمە بە.

موبایلەکەتت بەدەستەوەیە وخۆت لەچاوی خوشکەکەت دەدزیتەوە، لەوانەیە ئەوە ئەو کەسە بێت کەبۆی دەگەڕایت، وە لەوانەشە شایەنی بەدەستهێنانت بێت دوای هەموو ئەم شتانە، پێش ئەوەی بچیت بەلای داگیرساندنی فڕنەکەوە، ئەم هەنگاوە کۆتایانە بە سەرنجەوە وەربگرە لەکاتێدا کەئامادەیی هێڵی کۆتای تێبپەڕێنیت.

١.بە یەک دوو کەسی سەرەکی نزیکتی بناسێنە: من ناڵێم یەک شەممە بیهێنەرەوە بۆ نانی ئێوارە وبەخێزانەکەتی بناسێنە، چونکە هێشتا بڕیارت نەداوە ئاشکرای بکەیت بۆ خێزانەکەت، لەم قۆناغەدا هاوڕێیەکی( کچ)هاوڕێیەکی باشی خۆت بانگهێشت بکە، کاتێک کەوا بڕۆن بۆ شیرینی خواردن وخواردنەوە لەکۆتایی ژەمەکەتاندا، ڕاو بۆچونی وەربگرە سەبارەت بەو

پیاوە، پێویست ناکات قسەکانی وەکو یاسا وەربگری، بەلام دەبێت ڕاو بۆچونەکانی بەچاوی سەرنجەوە وەربگریت و وا خۆت هەژمار بکەیت کەئەم ٦٠ ڕۆژەی پێشتر لەحالەتی مەستیدا بوویتو نەتتوانیوە وێنە گەورەکە ببینیت، با هاوڕێکەت یارمەتیدەرت بێت لەمەدا.

٢.باسی مێژووی جنسی خۆت بکە: خانمان، تەنانەت بیریشی لێ مەکەرەوە کەفایلی پەیوەندیەکانی خۆت هەلبدەیتەوە هەتاوەکو وتووێژێکی ڕاستگۆیانە لەلایەن هەردوو لاتانەوە نەکرێت لەبارەی پەیوەندی ڕابردووتانەوە، ئەگەر پیاوەکە ئامادە نەبوو ئەوە بکات، ئەمە ئاماژەیەکی دیاریکراوت دەداتێ کەئەم پیاوە ڕێزی تۆ و بنەماکانت ناگرێت.

٣.با بێتە ناو دونیای تۆوە: بانگی بکە با لەگەلت بێت بۆ پەسەندترین پرۆژەی خێرخوازی بەلاتەوە، یان داوای لێ بکە لە بازاڕە کشتوکالیەکە بتبینێت.

٤.بزانە لەکوێدا دەوەستیت: تۆ تەماشای ڕۆژژمێرەکەت دەکرد وەکو هەلۆ و ڕۆژی ٨٩ یە و، بەیانیش کۆتا ڕۆژە، بەلام ئایا بەڕاستی دەزانیت لەکوێدا لەگەل ئەم پیاوەدا دەوەستیت؟ ئایا یەکلابویتەوە کە هەردووکتان بەهەمان ئاڕاستە دەڕۆن؟ ڕێگە مەدە ئەم ٩٠ڕۆژەی کۆتایی تەنها شتێکی ژوانی بێت و هەول بدەی تاقیبکەیتەوە، دلنیا ببەوە کەئەمە هەلبژاردنی خۆتە پێش ئەوەی بەستنەوەی جەستەیی لەنێوانتاندا رووبدات، خانمان بیرتان بێت لێرەدا جلەو لەدەستی تۆدایە هیچ بوارێکی(مەجال) یکی تێدا نیە کەئێمە هەولبدەین لێت نزیک ببینەوە بەبێ مۆلەتی خۆت نەبێت.

بەیانی دوای ڕۆژی ٩٠: ئێستا چی؟

تۆ و ئەویش شەوێکی نموونەیتان بەسەربرد هەر وەکو پلانت بۆ دانابوو، بەڵام ئێستا لەبەیانی ڕۆژی دواتر بیردەکەیتەوە و پرسیار دەکەیت ئایا پێویست بوو چاوەڕێ بکەیت؟ ئایا بەڕاستی شایەنی چاوەڕوانی بوو؟ بێگوومان شایەنی بوو، ئەگەر کاتێکی درێژت تێ نەپەڕاندووە بۆ بنیاتنانی بنچینەیەکی باش بۆ پەیوەندی و پێشبینی پەیوەندیەکەت، ئەوا تەنها کۆسپێکی بچووک بووە لەسەر ڕێگاکەت. زۆربەی پەرتووکەکانی دەربارەی پەیوەندییەکان دەڵێن پێویست ناکات، دەربارەی پەیوەندی جەستەیی قسە لەگەڵ پیاوەکەت بکەیت، بەڵام من لەگەڵ ئەوەدا نیم، پێویستە توانای ئەو پیاوە بزانیت بۆ دڵخۆشکردنت تاوەکو پەیوەندیەکەتان باشتر و سەرکەوتووتر بێت.

پێداچوونەوەی مانگی یەک: مەهێڵە ئەم مانگە تێپەڕ بکەیت بێ ئەوەی کەس تێبینی بکات! ساتە نایابەکان(یان لەوانەیە نایابیش نەبێت) بخەرەڕوو لەمانگی یەکەمدا.

## باشترین پێنج شت بەلای ئەو پیاوەوە چیە؟

١. ____________________
____________________
____________________

٢. ____________________
____________________
____________________

٦. ___

ئەو تایبەتمەندیانە چین کە چێژی لێوەردەگریت لە هاوڕێیەتی لەگەڵ پیاودا؟

١. ___

٢. ___

٣. ___

٤. ___

پێویستت بەچیە تا پەیوەندیەکی ئاشکرا و لەڕوو دابمەزرێنیت؟

١. ___

٢. ___

______

.٢______

______

______

______

## پێداچونەوەی مانگی دوو

مانگێک تەواو بوو، دووی تر ماوە! با کەمێک قوڵتر ببینەوە بزانین چی ئەم پیاوە نیشان دەکات. شەش شتی «بچووک» بنوسە کە لە مانگی دووەدا بۆی کردووی

.١______

______

______

______

.٢______

______

______

______

.٣______

______

______

______

.٤______

______

______

______

.٥______

______

______

______

هیچ ئالایەکی سور هەڵکرا؟ تێبینی هیچ هەڵسووکەوتێکت کردووە کەوای لێ کردبێت هەڵوێستەیەک وەربگریت.

١. ____________________

____________________

__________

٢. ____________________

____________________

__________

٣. ____________________

____________________

__________

٤. ____________________

____________________

__________

## پێداچوونەوەی مانگی سێ

خەریکە دەگەیت: ئەمە چەند دەستنیشانکردنێکە پێش بڕینی هێلی کۆتایی.

هاوبەشی پێکردنی پێنج شتی تایبەت(دانسقە)، کە پێشتر لەگەڵ کەسی دیکە هاوبەشیت پێ نەکردووە

١. ____________________

____________________

__________



## ___١٧___

# ژیانی پیشەیی تۆ، بەرزخوازی(طموح)

### چۆن وابکەیت خەونەکانتان پێکەوە بهێننە دی

دابینکردنی بژێوی ژیانمان، شتێکی گرنگە، هەم بۆ پیاوان هەم بۆ ژنان، لەم کاتە ئابوورییە دژوارانەدا، هەموومان دەزانین کە دۆزینەوەی کار شتێکی زۆر گران و دژوارە، وە لەوەش دژوارتر پاراستنیەتی، لەبەرئەوە ئایا خۆشەویستی هۆکار دەبێت لەبڕیارە پیشەییەکانتدا، یان مەترسی و سەرکێشی ئەوە بەپیاوێکەوە بکەیت کەهێشتا لەوپەڕی هێز و توانای خۆیدایە؟

با سەیرێکی ئەم دوو بابەتە گەرموگوڕە بکەین لەناخی ژوانی ئەمڕۆدا.

### ئایا پێویستە قوربانی بەخەونەکانم بدەم لەپێناو ئەو پیاوەدا

خانمان، پێویست دەکات وەکو ڕێزێک کڵاوەکەمت بۆ دابنەوێنم بۆ تۆ کەبەشێوەیەکی مەزن کارەکانت دەکەیت، تۆ خاوەن و داهێنەر و بەڕێوبەری جێبەجێ کاری کۆمپانیای، وە هیچ هەڵەیەک قبوول ناکەیت و گەشتی زۆر دەکەیت و زۆر

پەسەندیت و ڕێزێکی زۆریشت هەیە لە کۆمەڵگادا، کەمێکی پێدەچێت تا بوارێک لەخشتە قەرەباڵغەکەتدا بدۆزیتەوە تارێکە بەکەسێکی باش بدەیت بێتە ناو ژیانتەوە، بەڵام ڕێگەت بەوەدا، چونکە ئەو سەرنجی ڕاکێشایت، وە تۆش وات لێهاتووە ناتوانی وێنای ژیان بکەیت بەبێ ئەو. تۆ گەمژایەتی سەڵتێتیت تێپەڕاندووە، ئێستا ڕازیت بە دڵخۆش بوون و گەشتن بەئاواتەکانت و دەربڕینی خۆشەویستی.

بەڵام ئێستا، ئەو بەرەو پێشچونەی کەچاوەڕێت دەکرد لە کۆتایدایە، موچەیەکی گونجاو و پاداشتی زۆر زیاتر لەوەی پێشبینیت دەکرد، وە لەکۆتایدا هاتنە پێشەوەی هەڵبژاردنی دانەوەی قەرزی خوێندکارە تایبەتەکانت، هەموو شتێک زۆر بێ کەم و کوڕییە، بێجگە لەشوێن و کاتژمێرە درێژەکان. تۆ گەمژە بوویت کەهەلی ژیانت ڕەتکردەوە، بەڵام ئێستا شتێکی زیاتر هەیە لەبەردەمتدا، لەسەر مێزەکە پیاوێکی باش هەیە، نزا بکە لەپێناو زیاتر. بەڵام ئایا شایەنی ئەوەیە کەقوربانی بەخەونەکانت بدەی لەپێناویدا؟ پێش ئەوەی هەر خۆت بمێنیتەوە و تەنها بیت ئەم هۆکارانە بەسەرنجەوە وەربگرە:

**١.ئایا بەداخەوە دەبیت بۆ نەبوونی کار و پیشە ؟**

بەڕاستگۆیی سەیرێکی خۆت بکە لەئاوێنەدا، وە ڕازی دەبیت ئەم هەلە ڕەت بکەیتەوە؟ ئایا ئامادەی چاوەڕێ بکەیت بۆ ماوەی ٦مانگی تر، یان ساڵێک یان تەنانەت ٢ساڵ، بۆئەوەی هەلیکی هاوشێوەی ئەمە ڕووبداتەوە؟

**٢.ئایا لە پیاوەکەت دەڕەنجێیت ئەگەر تۆ هەڵی بژێریت بەسەر کارەکەتدا؟**

خانمان، ئەگەر هەستێک لەناختدا هەبێت کەبڵێ پەشیمان

دەبێتەوە بۆ دواخستنی ئەمە، ئەوکارە مەکە، تۆ ناتوانیت پیاوەکەت بکەیت بەقوربانی و پێی بڵێی‹‹من دەستبەرداری ئەم هەلە بووم لەبەرتو›› وە دڵنیابە کەئەم کارە دەکەم لەکۆتایدا، وە پێویستە ئەم بڕیارە هی تۆ بێت.

**٣.ئایا تۆ کاتت هەیە بۆ پەیوەندیەکی درێژخایەن؟**

ئەگەر تۆ کاتی تەواوت هەیە لەپەیوەندیەکەتدا بەسەری ببەیت، دەتوانیت دواتر کار بکەیت، ئەمە لەوانەیە هەلێکی نایاب بێت بۆ بنیاتنانی ژیانی سۆزداری و پەیوەندی و پلانە گەشتیاریەکانت، دەتوانیت هەموو پشووی کۆتایی هەفتەیەک چاوپێکەوتن بکەیت، یان یەکجار لەمانگێکدا لەشارێکی تازە. یان کۆبوونەوەیەک لە نێوانیاندا هەندێ کات دەستەبەر بکە لەخشتەی کاتەکانت، تا کەمێک لەسەر هێڵی ئینتەرنێت قسە لەگەڵ پیاوەکەتدا بکەیت، ئەگەر تۆ بەڕاستی بایەخ بەپەیوەندیەکەت بدەیت، ئەوا بە هەر شێوەیەک بێت ڕێگایەک دەدۆزیتەوە تا کاتی کارەکەت لەسودی خۆت بەکار بهێنیت.

**٤.ئایا متمانەی تەواوەتی هەیە لە پەیوەندیەکەدا، بۆ ڕێکخستنی مەوداکان؟**

ئایا هەست بە دوودڵی دەکەیت لەبارەی ڕابردووی ئەوەوە، یان دوودڵی لە دەستپێکردن لەگەڵ کەسێکی نوێدا؟ ئایا دەتوانی متمانەی پێ بکەی کەبەرپرسیاریەتیەکانی جێ بەجێ بکات کاتێک تۆ دوو وڵات دووردەکەویتەوە لەبەر کارەکەت؟ ئایا ئەو دەتوانێت متمانە بەتۆ بکات بۆ هێشتنەوەی پەیوەندیەکەتان ؟ هیچ کێشەیەک نیە ئەگەر وەڵامی پرسیارەکە «نەخێر» ە، وە ئەوەش مانای ئەوە نیە کەیەکێکتان ئەو هەلە بەکاردەهێنێت بۆ خیانەت و دڵشکاندنی دڵی یەکتری بەمەبەست. لەوانەیە ئەمە

مانای ئەوە بێت هیچ کامتان هیچ ڕێکخستنێکی درێژخایەنی دیاریکراوتان نیە. وە ئەگەر وەڵامەکە «بەڵێ» بوو ئەوا دەربارەی پێشبینیە مەودا درێژخایەنەکانت قسە بکە کەچۆن دەبێت، ئایا تەنها پەیوەندی تەلەفۆنی و نامە بەس دەبێت؟ ئایا پشووی هەفتەی هەموو مانگێک بەسە بۆ بەرە و پێشچونی پەیوەندیەکەت؟ هەماهەنگی بکە بۆ دۆزینەوەی باشترین ڕێگا تا یارمەتیدەرت بێت بۆ گەشەسەندنی خۆشەویستیەکەت.

**٥.ئایا ئامادەیە بگوازێتەوە بۆ شارە نوێکەت؟**

ئایا ئەگەری ئەوە هەیە کەشوێن گۆڕکێ بکات لەگەڵ تۆ؟ ئایا ئارەزووی هەیە بۆ پیشەیەک بگەڕێت و کۆمپانیاکەی بگوازێتەوە، لەوانەیە پیاوەکەت سوپڕایزت بۆ بکات و بێ دوودڵی لەگەڵ تۆدا بێت، مەترسە لەدانانی ئەم هەڵبژاردنە لەسەر مێزەکەی.

لەوانەیە شتێکی پەڕپووت بێت، بەڵام ئەوە ڕاستە کەنەبوونی وا لەدڵ دەکات گەشە بکات، بڕوا بکەن، خانمان، پیاو دەزانێت کە چی شتێک بۆی باشە و هەموو هەوڵێکی خۆی دەدات تا پەیوەندیە باشەکەی سەرکەوتووبێت، ئەگەر ئەمە مانای ئەوە بێت کە بە سکایپ، وە ئیمەیڵ قسەت لەگەڵ بکەین هەموو شەوێک، ئەوا دڵنیابە ئەوە دەکەین، ئەگەر ئەمە مانای ئەوە بێت کەدەبێت کۆتایی هەفتە گەشت بکەین تا چاومان پێت بکەوێت، ئەوا ئێمە لە گەشتی شەمەندەفەری داهاتوودا دەبین، ئەوەی من و مارجوری هاوسەرم زیاتر لە ١٥ساڵی خایاند تا لەکۆتایدا پێکەوەین، بەڵام کاتێک شوێن و کاتەکە ڕاست بێت ئەوەش ڕاست دەبێت.

کێ دەزانێت؟
ئەم مەودایە لەوانەیە کاتی بێت، یان لەوانەیە شوێنە نموونەییەکە بێت کەتیایدا جێگیر ببیت و ژیانت لەگەڵ ئەم پیاوە دەست پێبکەیت. لەوانەیە ئەمە بێشەی خەونەکانت بێت، بەلام لەبیری مەکە خۆشەویستی و تەمەن چی لێدێت.

## گرەوکردن لەسەر توانای بە دەستهێنان

ئێستا دەزانیت هەموو پیاوێک پێویستی بەزانینی نازناوەکەی و پیشەکەی و پارەکەی هەیە. سەرەڕای ئەوەش هەندێک پیاو هەن ئامادە نین بەردەوامی بدەن بەپەیوەندی بەدرێژایی کات، هەتا نەبن بەخاوەنی ماڵی خۆیان، وە لەوانەیە تۆ لەکاتی بە دەستهێنانی بڕوانامە یان کارکردن لەپلیکانەی بەڕێوەبردن ببینێت، ئێستا جیاوازی هەیە لەنێوان ئەو پیاوە کەتەنها باسی خەونەکانی دەکات لەگەڵ ئەوپیاوەی کەهەنگاو دەنێت بۆ بەدیهێنانی خەونەکانی. ئەگەر ئەو پیاوەی کەتۆ گرنگی پێدەدەی سەر بەجۆری دووەم بوو، ئەوا لەوانەیە شایستە بێت.
با سەیرێک بکەین و ببینین کەئایا تواناکانی ئەم پیاوە شایەنی گرەو کردنە.

**١.ئایا دوای خەونەکان کەوتووە یان سەرکێشی دەکات ؟**

گفتوگۆی لەگەڵ بکە لەبارەی خەونەکانی و چۆنیەتی گەیشتن بە خەونەکانی. ئەگەر توانی نەخشەیەکی بەهێزت نیشان بدات کە لەماوەی ٣تاە ساڵ بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکەی و دەستپێکردنی کارێکی باش. ئەوا بەدڵنیاییەوە ئەو کەسێکی شیاوە، ئەگەر ئاواتی یاری کردنی هەبوو لە ئێن بی ئەی دا

کەچی لاشەی هیچی تیا بەسەر نەبوو، ئەوکات تۆش دەزانیت کەپێویستە بەڕێگای خۆتدا بڕۆیت.

خانمان، تۆ بیر تیژیت هەیە، لەبەر هۆکارێک تۆ ئەگەر بەکەمجارت بێت شوێنێک ببینیت یان یەکەم جارت بێت گوێت لێ بێت بۆ جاری داهاتوو خێرا دەیناسیتەوە، وە ئەگەر وتی ئەم ئاواتەی لەدواناوەندییەوە هەیە و کەچی ئێستا لەچلەکانی تەمەنیدا بوو، ئەوا وازی لێبهێنەو بەڕێی خۆتدا بڕۆ، ئەگەر پڕۆژە نوێیەکەی پێکهاتبوو لەقوچەکێکی ئالۆز و تێک ئالاو تێکێنکی دوو بەختی، یان پاڕانەوە و نزا، ئەوا دڵنیابە ئەو پیاوە نیە کە داهاتووی خۆتی پێ ببەستیتەوە. ئەگەر لەنزیکەوە گوێ بگریت ئەوا دەتوانیت ئەوکەسەی تەنها ئاوات دەخوازێت جیا بکەیتەوە لەوەی کەهەڵدەستێت بە بەدیهێنانی.

**٢.کردارەکانی چی دەڵێن ؟**

ئایا بەسەر شەقامەکاندا ڕادەکات بۆ بەدیهێنانی خەونەکانی، یان لەسەر قەنەفەیەک دادەنیشێت تا خەونەکانی خۆی بێنەدی؟ پێویست ناکات لێرەدا ڕوونکردنەوەی زیاتر بدەم، بەڵام ڕێگە بدە با کردارەکانی قسە بکەن لەجیاتی ووشەکانی، ئەگەر کردارەکانی هاوتای گوفتارەکانی نەبوو، ئەوکات تۆ دەزانیت پێویست بە گرەوکردن ناکات و شایەنی نیە خۆتی بۆ بخەیتە مەترسیەوە.

**٣.بەڵام چی ئەگەر ئەو ئەڵماسێک بوو لە ماددەی خاودا؟**

خانمان؟ ئەتوانم گوێم لێتان بێت ئێستا دەڵێن›› بەڵام ستیڤ؟ لەگەڵ کەمێک هاندان و خۆشەویستی مندا، دەتوانم یارمەتی بدەم تا ببێت بەپیاوێکی باش››، ئەگەر ئەو نەیخستبۆیە مێشکیەوە کە لەپێناو خۆیدا خەونەکانی بەدیبهێنێت، کەواتە تۆش

تەنها کۆسپێکی دیکە دەبی لەڕێگایدا. کاتێک لەگەڵ مارجوری بووم ئاسودە نەبووم وەکو پیاوی ژیانی، تاوەکو ئەو کاتەی ئەو پارەیەم پەیدا کرد کەخۆم مەبەستم بوو لەڕێی کۆمیدیا و کارکردنەوە. خانمان پێویستە ئەندازیاری بنیاتنانی داهاتووی خۆمان بین. وە بەدڵنیاییەوە دەمانەوێت لەم نەخشە ڕێژەییە لەگەڵمان بیت و بەشێک بیت لێی، بەڵام پێویستە بیروباوەڕ و متمانەمان هەبێت تاوەکو خەونی سەرەکی ئێمە بیت لەم گەشتەماندا وەکو پیاو.

**٤.ئایا سەرمایە دەبیت یان داڕووخاو؟**

ڕاستگۆبە، ئەگەر ئەو خەریکی خوێندنەکەیەتی، یان وانەی چڕی ڕاهێنان وەردەگرێت، ئایا بەڕاستی کاتی تەواوی هەیە بۆ پابەند بوون بەپەیوەندیەوە؟ ئەگەر چارەنووسی ئەم پیاوە بوو کەشتی مەزن ئەنجام بدات، بەدڵنیاییەوە تۆ ناتەوێت داڕووخاو بیت لە کاتێکدا ئەو هەوڵی بەدەستهێنانی خەونەکانی دەدات. ئەگەر کاتی هەبوو بزانە دەتوانیت بەچی شێوەیەک پاڵپشتی بکەیت لە ڕێی خوێندن لەگەڵیدا، یان یارمەتیدانی لەکاروباری بچووکی ماڵەوەدا، یان ئامادەکردن و پێچانەوەی ژەمێکی تەندرووست تا لەگەڵ خۆیدا بیبات بۆ پۆل.

**٥.توانای چاوەڕوانیت هەیە؟**

تەنها شەش مانگی ماوە تا بەرنامەی مەشقکردنی جێبەجێکاری تەواو بکات، ئایا دەتوانی تەلەفۆن و نامەی سەرنجڕاکێش بۆ ئەم پیاوە بنێریت تاکاتێکی خۆشی لەگەڵ بەسەر ببەیت بەدرێژایی کات؟ من پێت ناڵێم ژیانت لەچاوەڕوانیدا بەسەر ببەیت، بەڵام ئەگەر توانیت خەونەکانی ببینیت کەخەریکە بەدی دەهێنێت، ئەوا تەنها لەسەرت پێویستە کەمێک کاتی

بەدەبێت. کاتێک پیاو لە جێبەجێ کردنی ئەرکەکەیدایە، بێگوومان شایەنی چاوەڕوانی کردنە.

**٦.ئامادەی گەورەترین هاندەری بیت؟**

کاتێک هێشتا پیاو خەریکی بنیاتنانی خۆیەتی، بارێکی قورست لەسەرشانە لەپەیوەندیەکەتدا هەڵی بگریت، ئایا مامەڵەی نەکردنی پاڵپشتی سۆزی و ڕۆحی کەپێویستیەتی دەکەیت لە میانەی پرۆسەی بەدیهێنانی خەونەکانی؟ ئایا هێشتا ئامادەی پشتگیری بکەیت کەکاتێکی زیاتر بخایەنێت لەوەی کە تۆ پێشبینیت دەکرد؟ خانمان، بێگوومان، خۆشەویستی و ڕێزگرتن هاوشێوەی « ئاڵتونە (زێڕە) « لای پیاو، کاتێک دەزانین تۆ پشتگیریمان دەکەیت، وا دەکات کە ڕۆژە درێژەکان و کاتەکانی هەوڵدان ئاسانتر بێت بۆ بەرگە گرتنیان. چەند ساڵێکی خایاند تا بووم بە کۆمیدیایەک کە لەماوەی یەک شەودا ٥٠$ بۆ ٧٥$ پەیدا بکەم، تا ببم بەئەستێرەیەک پارەی زیاتر و ڕێزی زیاتر بەدەست بهێنم. بەڵام تەنانەت دوای ئەوەش هێشتا هەر سەخت و دژوار بوو کەببم بەکەسێکی بێهاوتا و نایاب لەپیشەکەمدا، پەیوەندی بەستن لەگەڵ پیاوێک کەهێشتا خەریکی کۆششکردنە بۆ بەدەستهێنانی خەونەکانی، لەڕاستیدا شتێکی گران دەبێت، هێڵێکی باریکت هەیە لەنێوان داڕمان و پەرتبوونی و چونە سەر ڕێی ڕاست و درووست، ئەگەر ئەو پیاوە لەم کاتەدا پێشوازی لیکردی بۆ ناو ژیانی، ئەوا هەوڵبدە خۆڕاگر و تێگەیشتووبی، تەنها ئەو پاڵپشتیەی پێ ببەخشە کەپێویستیەتی، نەک ئەوەی کەوا بیردەکاتەوە پێویستیەتی، ببە بەگەورەترین هاندەری و لەکاتە سەختەکاندا هاندەری بە، یارمەتی بدە ئاهەنگ بگێڕێت بەبۆنەی سەرکەوتنەکانی، پیاوی باش دەزانێت چۆن ڕێزی

ئەو ژنە باشە بگرێت کە لەکاتە سەختەکاندا لەگەڵی بووە و لەبیری ناکات، کاتی تێپەڕاندنی خەتی کۆتایی سەرکەوتن، ئەو ژنە لەگەڵ خۆیدا ببات بەڵام هەرگیز ناوەستێت لەبەدەستهێنانی ئەوەی کە تۆ دەتەوێت.



## ــ١٨ــ

# کاتێک پەیوەندی جەستەیی هەڵدەوەشێتەوە

## بەهارات بکەرەوە بەسەر پەیوەندیەکەتدا

تۆ و پیاوەکەت هەمیشە پەیوەندی جەستەیی باشتان هەبووە، تۆ پێت وابوو کە تاسەر ئەمە بەردەوام دەبێت، بەڵام بەم دواییانە وا دەردەکەوێت کەئەو پشتگوێت دەخات، ئەو دوودڵی کارەکەیەتی و خەمی یەکێک لەئەندامانی خێزانەکەیەتی کەنەخۆشە. تۆ هەوڵدەدەیت تێگەیشتوو بیت، بەڵام ئەوە بۆ سێ هەفتە دەچێت کە پێکەوە کۆنەبونەتەوە، تۆ دەزانیت ئەمە بەشێکە لە پەیوەندیەکەت، بەڵام کاتێک هەڵدەوەشێتەوە لەوانەیە تەواوی پەیوەندیەکە وای لێبێت.

**چۆن دەتوانیت جادووی پەیوەندیەکەتان بگەڕێنیتەوە؟ ئاشکرای بکە کە( بەڕاستی) چی دەگوزەرێت؟**

دوودڵی شتێکی سروشتیە. وە هەبوونی بەڕێوبەرێکی بێزارکەر، وە نیگەران بوون لەبارەی کەسێکی نزیکی بەتەمەنەوە،

یان نیگەران بوونی یەکێک لە باوک و دایکەکەی، هاوبەشن بۆ بەخێوکردنی منداڵەکەیان کەئێستا لەیەکتر جیابوونەتەوە، ئەمە بەسە کەوا لە پیاو بکات مێشکی لەدەست بدات. ئەگەر ئامادە بوو دڵی خۆیت بۆ بکاتەوە قسەی لەگەڵ بکەو ئاشکرای بکە کەچی دەگوزەرێت لە جیهانی ئەو پیاوە، هەندێکجار پیاو تەنها پێویستیەتی بزانێت بە تەنها نیە.

**ئایا بەڕاستی تۆ پێویستە قسەی لەبارەوە بکەیت؟**

خانمان پێشتریش پێم ووتن، هیچ شتێک هێندەی ئەوە ئێمە ناترسێنێت کە گفتوگۆکە بە «پێویستە قسە بکەین» دەست پێ بکەیت، گفتوگۆ کردن هەندێکجار لەوانەیە یارمەتیدەر بێت، بەڵام هەندێکجار لەوانەیە ئێمە تەنها پێویستمان بەکات بێت تا بەبێدەنگی بیر بکەینەوە، بێدەنگی زێڕە.

## پشتگیری بکە :

تەنها بەزانینی ئەوەی کەژنی ژیانمان پاڵپشتمانە زۆر سەرنجڕاکێشترە لەهەر شتێک کەکردووتە، وە کاتێک پیاوەکەت تێکدەشکێت و دەڕواتە دەرەوە، پەیوەندی پێوە بکە بابزانێت کە پاڵپشتی بۆی، ئەگەر ڕۆژێکی سەرقاڵی بەڕێکرد، سوپرایزی بۆ بکەو بڵێ بابچین بۆ ئەو ڕێستۆرانتەی کەحەزت لێیەتی، چونکە هەندێک کات ئەم شتە بچووکانە یارمەتی دەدات کە وردە وردە بێتەوە سەر خۆی.

**دڵنیابە کە کورتهێنان لەکارەکەیدا پزیشکی نیە.**

خانمان، خۆتان دەزانن کەپیاو حەز ناکات دان بنێت بە

ئازارەکانیدا، یان دان بنێ بەوەی کە لەلوتکەی کارەکەیدا نیە. پێش ئەوەی بڕیار بدەی کە نەبوونی حەزی جەستەیی کێشەی کەسیە، ئاشکرای بکە بزانە ئەگەر کێشەیەکی تەندروستی هەبوو ئەوا پێویستی بەچارەسەرکردنە. زۆر بەوریایەوە پێشنیاری بۆ بکە پشکنین شتێکی گونجاوەو پێی بڵێ:»با بێم لەگەڵتدا بۆ پشکنین«یان داوا لەهاوڕێ نزیکەکەی بکە، پێکەوە چونە دەرەوە پێی بڵێ. ئەمە پیاوی تۆیەو تۆش خۆشت دەوێت، با بزانێت کەتۆ خەمی تەندروستی و کامەرانی ئەوتە، وە ئەگەر ڕازی بوو پشگیری بکە، هەرکاتێک پێویستی بوو تا بگەڕێتەوە بۆ لوتکە.

## پێکەوە ڕاهێنان بکەن:

ئەگەر ئامۆژگاریەکەتی وەرگرت و سەردانی پزیشکی کرد، پێویستە هەندێک بیرکردنەوە بخاتە لاوە، وە ئەم هەلە بەکار بهێنن تا پێکەوە ڕاهێنان بکەن، چونکە هیچ شتێک هێندەی وەرزش کردن وبەهێزکردنی ماسولکە سەرنج ڕاکێش نیە، کەپێکەوە ئەنجامی بدەن و کەمێک گاڵتە بکەن دوای ڕاهێنان.

## بەهارات بکە بەسەریدا:

کۆتا شەوی هەینی کەی بوو کەهەردووکتان خەوتان لێنەکەوت و پێکەوە سەیری فلیمێکتان کرد؟ ڕۆمانسیەت بگەڕێنەرەوە بۆ پەیوەندیەکەت و پێکەوە بڕۆنە دەرەوەو ڕێستورانتێکی نوێ تاقی بکەنەوە، یان وەکو دوو کەپڵی نوێ پیاسەیەک بەشەقامدا بکەن، یان بڕۆن بۆهەڵگەڕان بەسەر بەردەکاندا لەگەڵ منداڵانی گەڕەکەکەتان، گرەنتی دەکەم ئەگەر بەهارات لەدەرەوەی ژووری نوستنەکەتان بڕێژیت ئەوا ژووری

نوستنەکەشتان تام و چێژی بۆ دەگەڕێتەوە.

## جل و بەرگی ژێرەوەی سەرنج ڕاکێش بپۆشە:

بەڵی خانمان ئێمەی پیاوان حەز دەکەین شتەکە بەو شێوەیە بێت، بەڵام ڕێزی ئەوەش دەگرین کەهەوڵدەدەی بۆ هێشتنەوەی پەیوەندیەکەمان بە سەرنجڕاکێشی، وە ڕوودانی نزیک بونەوە بەشیوەیەکی خێراتر. بەڵێنی دڵخۆشکردنی پێبدە.

## پلانی دوورکەوتنەوە:

هەندێک کات ئێمەی پیاو تەنها دەمانەوێت لەهەموو شتێک دووربکەوینەوە. بەشێوەیەکی جوان پلان دابنێ لەکۆتایی هەفتە لەگەڵ پیاوەکەتدا برۆن بۆ شوێنێکی ئارام و خواردنی نانیکی بەیانی نایاب، یان پشوودان لەسەر چیایەک، وە ئەگەر نەتانتوانی بچنە دەرەوە، دەتوانیت لەماڵەکەی خۆتدا داهێنان بکەیت، بۆماوەیەک دووربکەونەوە لەهەموو تەلەفۆنەکان و ئایپاد و ئینتەرنێت و تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان، کەمێک کات بۆیەکتر تەرخان بکەن، ئەم کاتە تایبەتە، موعجیزە دەخولقێنێت بۆ تەندروستی و تەمەن درێژی پەیوەندیەکەت.

## جوڵاندنی مەنجەڵ و تاوەکان :

کۆتا جار کەی بوو خۆشترین خواردن بەلای ئەوەوەت لینا؟ دەزانم کەخشتەی کاتەکانی تۆش جەنجاڵە وەکو ئەو، بەڵام بیربکەرەوە لەو جادووەی کەدەخولقێت، ئەگەر کەمێک کات تەرخان بکەیت تا بچیت بۆ سۆپەرمارکێت پێش گەڕانەوەت بۆ ماڵەوە، من دڵنیام ئەو ڕێزی ئەم یارمەتیە گەورەیەت

دەگرێت، تاوەکو خواردنە خۆشەکەی بۆ ئامادە بکەیت. وە تۆ هەرگیز نازانیت، خانمەکەم، کەخواردنی نانێکی ئێوارەی خۆش لەکاتژمێر ٧ی ئێوارەدا، دەتوانێت تۆ شیرین بکات لای پیاوەکەت بەدرێژایی شەو.

**ناوچەیەکی بەتاڵ ــــ لە منداڵ درووست بکە.**

منداڵەکان ببە بۆ دایەنگاو شوێنێکی پەسەند لای خۆت، و پلان بۆ شەوێکی تەنها بۆ خۆت و ئەویش دابنێ بەبێ دوودڵی و ئیشی ماڵەوە، کەمێک سەما بکەن و وەکو باوکێک دەزانم کەچێژی منداڵ چیە. بەڵام بەدڵنیاییەوە زیاتر نرخیان دەزانم کاتێک کەمێک لێیان دووربم.

**بەسەربردنی کات لەگەڵ دوو هاوسەری بە تەمەندا.**

لەوە باشترنیە قسە لەگەڵ دوو هاوسەری بەساڵاچوودا بکەن، کە ماوەی ٢٠ یان ٣٠ یان ٤٠ ساڵە پێکەوەن، یان تەنانەت لەوانەشە ماوەی ٥٠ ساڵ.

بێگومان. چیرۆکیان لایە دەربارەی چۆنیەتی نزیک بوونەوە و چارەسەرکردنی گرفتەکان و لەوانەشە سەرت بسوڕمێت بە دوو سێ ئامۆژگارییان دەربارەی ژووری نووستنت، لەم هاوسەرە بە ئەزموونانەوە فێربە و سود لە داناییان وەربگرە بۆ پەیوەندیەکەت.

**ماڵەکەت هەروەکو نزرگەیەک لێ بکە بۆ خۆت:**

دەزانم ژمارەیەکی زۆر لەهاوسەران بێ پەیوەندی مارنەتەوە، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کارێکی زۆر دەکەن

لەسەرووی توانای خۆیانەوە، وە بەسەربردنی کاتێکی زیاتر لەکارکردن کاتەکانی ماڵەوەت دەبات، بۆ نموونە: ئەم چارەکە بۆ هەردووکتان ماوەیەکی سەخت بوو، ئەوە چەند هەفتەیەک تێپەڕیوە، بەڵام هەر یەکێکتان لە ١٤کاتژمێر کەمتر کاری نەکردووە لەڕۆژێکدا، کەی بیر لەوە دەکەیتەوە کەکاتێکی گونجاوە بۆ کۆبونەوە؟ ١٥ بۆ ٢٠ خولەک بدە بەخۆت و تاهەموو فشارەکان و ماندوویبەکانی ژیانی پیشەیت بڕەوێنەوە، پێش ئەوەی بچیتەوە بۆ ماڵەوە. کاتێک مێشکت ئاسودە بوو ڕێگەمەدە ئەو ئاژاوەی ئەمڕۆ لەگەڵت بێتەوە بۆ ماڵەوە، کاتێک گەشتیتە ماڵەوە، شوێنی ژیانت وەکو نزرگەی خۆت سەیربکە. واز لەتۆڕەکۆمەڵایەتیەکان بهێنە، ماڵەکەت بکە بە جێگەیەکی پیرۆز تا بتوانیت پەیوەندی و دڵداری خۆتی تێدا نوێ بکەیتەوە.

پشوودان.

ئەو تۆی خۆشدەوێت، ئەو پەیوەستە بە تۆوە، و تۆش ئەوە دەزانیت و بەڕێوبەرە شێتەکەی لەکۆتایی پرۆژەکەدا کەمێک شێتتر دەبێت، یەکێک لەکەسە بەتەمەنە نزیکەکانی دەگەڕێتەوە، کۆبوونەوەکەی ئێوە دووبارە دوادەکەوێت و هاڵدەوەشێتەوە، بەڵام هەر پیاوێک بەڕاستی ژنەکەی خۆشبوێت ڕێگایەک دەدۆزێتەوە تا دووبارە لەگەڵت کۆببێتەوە، وە هەندێک ئامادەکاری دەکات بۆ یەکگرتنەوەیەکی نوێ.

# ١٠ ڕێگا بۆ پاراستنی پەیوەندی جەستەیتان لەهەڵوەشاندنەوە

١.پەیوەندی
٢.هیچ شتێک بەکەسی وەرمەگرە
٣.بزانە پیاوەکەت لەکوێوە دێتەوە
٤.ئارامگربە لەگەڵی
٥.پلانی دوورکەوتنەوە دابنێ
٦.کاروبارەکانت تێکەڵ بکە «ژەمێکی خۆشی بۆ لێبنێ»
٧.نامەی خۆشەویستی بۆ بنێرە بەبێ هیچ هۆکارێک
٨.بیرت بێت کەسوپاسی بکەیت بۆ شتە بچوکەکان
٩.هانی بدە زیاتر لەیەکتر نزیک ببنەوە شەوبێت یان ڕۆژ
١٠.هەندێک جلوبەرگی ژێرەوەی نوێ تاقی بکەرەوە



## ١٩
# ئایا کاتی دانانی ئەڵقەکەیە

### تاقیکردنەوەی ١٠__هەنگاو پێش گەشتەکەت بۆ خشڵ فرۆش

ساڵێکی تەواوەتی تێپەڕبوە بەسەر یەکەم بەدیکردنت لە بەنزینخانە، ئۆتۆمبێلەکەی لای ئەوەی تووە ڕاگرت، تۆش ڕەزامەندی ئەو شێوازە هێمن و بەڕێز و متمانە بەخۆبوونەی بووی، کە هات و داوای ژمارەکەتی کرد و دوو ڕۆژ دواتر پەیوەندی پێوەکردیت و کەوتیتە جادوەکەیەوە، وە کاتی خۆشتان پێکەوە بەسەر بردوو تۆ بەهێزیەکەی و کەم وکورتیەکانیشیت خۆشویست، لەڕۆژێکی سەختدا چاوت پێی کەوت و زانیت کەدەتوانن لەکاتە سەختەکاندا پێکەوەبن و، ڕێزی بنەماکانت دەگرێت، وە بەهەموو خێزان و هاوڕێکانتی دەناسێنیت بەشێوەیەکی ئاشکرا، وە بە ڕوونی دیاریکردوە کەکێ یە و، ئیشی چیە و، چۆن دەیکات، وە ئەم وێنە تۆش دەگرێتەوە و بەشێکی لەوە.

دەتوانیت هەست بکەیت ئەم ئەڵقە ئاڵتون و ئەم ئەڵماسانە

کە ئێستا لەپەنجەتدایە__بەڵام پێش ئـەوەی پەیوەندی بە هاوڕێکانتەوە بکەیت تا یارمەتیت بدەن لەهەڵبژاردنی عەزی بوکێنی، ئایا تۆ ئامادەی بۆ هاوسەرگیری؟ مەبەستم ئەوەیە ئایا بەڕاستی تۆ ئامادەی بۆ هاوسەرگیری؟ تەنها لەبەرئەوەی ساڵێک یان دوو ساڵتان پێکەوە بەڕێکردوە مانای ئەوە نیە کە هاوسەرگیری هەنگاوی دواتر بێت. دەزانم کەتۆ چاوەڕوانی ئاهەنگی هاوسەرگیری خەونەکانتی لەوکاتەی منداڵێکی بچووک بوویت، بەڵام ئامادەی هاوسەرگیریت؟ ئەمە تاقیکردنەوەی ١٠__هەنگاوییە تا جێبەجێی بکەیت، تا بەڕاستی ببینیت، ئایا تۆ ئامادەی تا لەسەر مێزی مارەکردن لەگەڵی دابنیشیت.

**١.ئایا تۆ لە خەونەکانی داهاتوویدا دەبیت؟**

خانمان، هیچ زیانی نیە کەتۆ گفتوگۆ بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و لەڕوو بکەیت. ئەمە ژیانی تۆیە و دەربارەی خۆشبەختی تۆیە. مەترسە لەوەی کەپرسیار لەپیاوەکەت بکەیت ئایا تۆ لە خەونەکانی ژیانیدا دەبینێتەوە، هەر پیاوێک کەجدی بێت بەرامبەر ئەو ژنەی کەخۆشیدەوێت ئاشکرایە نیازی چیە، ئەگەر نیازی ئاشکرا نەبوو، دەتوانیت بوەستیت لەدواکەوتنی (ڕاونان)، وە (هەندێک کات دەبێت خۆت دەرباز بکەیت) ئەگەر تۆ بەشێک بووی لەخەونەکانی کاتێک بدۆزەرەوە و دەستبکە بەباسکردنی خەون و ئامانجە هاوبەشەکانت، وە تەنها باسی هاوسەرگیری مەکە: بەدڵنیاییەوە باسی داهاتوی هاوسەرگیریەکەشت بکە. دڵت بە ئەڵقەکەی خۆشنەبێت ئەگەر تێڕوانینێکی ڕوونی نەبوو لەگەڵ تۆدا.

### ٢.ئامادەی بەدرێژای کات پیاوێک لە ژیانتدا هەبێت؟

دەزانم لەوانەیە ئەمە پرسیارێکی شێتانە بێت، بەڵام هەندێکتان لەمێژە کارەکانی خۆتان بەڕێدەکەن، بەرادەیەک کەنازانن هەبوونی پیاوێک لەژیانتاندا مانای چیە. لەوانەیە تێڕوانینێکی زۆر ڕوونت هەبێت بۆ ئامانجە کەسیەکانت و پیشەییەکانت، بەڵام ئایا مەودایەکت هێشتۆتەوە بۆ پیاوی خەونەکانت؟ ژوان بەستن لەگەڵ پیاوێک دوای جێهێشتنی تا لەسەر کیکەکە بیبەستێت بەتەواوەتی جیاوازە لەهاوسەرگیری و پێدانی بوارێک پێی، تاوەکو ببێت بەپێکهاتەیەکی سەرەکی گیراوەکەت، کاتێک تایبەت بکە بۆ قسەکردن دەربارەی ئەو پێگەیەی کەخۆتانی تێدا دەبینن لە ٣،٥،١٠ ساڵی داهاتوودا.

### ٣.ئایا تۆ لە سەدا سەد پشتگیری ژیانی پیشەیی ئەو دەکەیت؟

کارەکەی وا دەخوازێت بەلایەنی کەمەوە دوو هەفتە لەمانگێکدا بەڕێوە بێت وچەند کاتژمێرێکی نائاسایی دووریدەخاتەوە لەماڵەوە لەکاتی نانی ئێوارەدا، حەز دەکەیت خۆت هەڵبکێشیت بە هاوسەرەکەت و موچەکەیەوە؟ بەڵام چۆن بەرگەی ئەم شتانە دەگریت لەهاوسەرگیریەکەتدا؟ تۆ نابێت ئێستا چێژ لەسودەکان وەربگریت و دوایش بەناڕەسەنی تەلەفۆنی بۆ بکەیت کەژمارەی گەشتەکان و کاتژمێرەکانی ئامادە نەبوونی درێژتر بویەوە، وە ئێستا کاتی قسەکردنە دەربارەی ئەوەی کەچۆن پیشەکەی کاریگەری لەسەر تۆ و هاوسەرگیریەکەت و هەر منداڵێکت دەکات کە لەداهاتودا بەنیازی بیخەیتەوە.

## ٤.ئایا شێوازی پەیوەندیکردنت گونجاوە؟

تۆ کەسێکی گۆشەگیریت و ئەویش کەسێکی کراوەیە!
بەرگری یەکەمت لەشەڕدا وەستاندنیەتی: کەچی یەکەمین
غەریزەی ئەو تەقینەوەیەتی. ئەگەر تێکشکانی گەورەتان پێکەوە
نەبوو، ئەوا لەوانەیە بتەوێت بیرێک لە گەشتەکەت بۆلای خشڵ
فرۆش بکەیتەوە، تۆ هێشتا بەتەواوەتی ئەو پیاوە ناناسیت هەتا
کاتژمێر ٣ی بەیانی چاوەڕوان نەکراوی بۆ یەت بۆ کار، یان
کاتێک کۆتا کۆبوونەوەی کاری بەڕێ دەکات. دەبێت خۆت
بەکلایی بکەیتەوە کە توانای ئەوەت هەبێت بەرگەی کاتە خۆش
و ناخۆشەکان بگرن پێکەوە، ئەگەر بەرگری یەکەمت داخستەوە
و کوژاندنەوە بابزانێت کەپێویستت بەچەند کاتژمێرێک یان چەند
ڕۆژێک هەیە، تابتوانیت مامەڵە لەگەڵ دۆخەکەدا بکەیت، بەڵام
ئەگەر ئەو حەزی کرد پێشتر بابەتەکە لەگەڵ کوڕەکان تاوتوێ
بکات هەست بە سوکایەتی مەکە، چونکە پێویستی بەکاتە بۆ
چارەسەرکردنی کارەکانی، وە پەیوەندی کلیلی کردنەوەی
هەموو هاوسەرگیرییە باش و هەمیشەییەکەت دەبێت، وە با
بەشێکی گرنگی پەیوەندیەکەتان بێت.

## ٥.ئایا خووە مادییەکانت و ئامانجەکانت هاوشانی یەکن؟

وا بیر بکەرەوە تۆ و هاوسەرەکەت لەداهاتودا چەند
سالێکی پاداشتان بەڕێ کردووە و هەردووکتان سەربەرزن
بەکار و بەخشش و نیعمەتەکانتان، بیرۆکەی تۆ ئەوەیە
کانیەوەی پارەکان لەم پشووی هەفتەیەدا بە خۆدەرخستنەوە
بخەیتە پاشەکەوتەوە و ئەویش وایە، کە باشترین شت ئەوەیە

پارەکان بخاتە بەوەبەرهێنانی کۆگای بازارەوە. ئەگەر پێشتر گفتوگۆیەکی ڕاستگۆیانە نەکەیت لەسەرەتادا، لەوانەیە ئەم دۆخە ببێت بە بۆمبێکی تەوقیتکراو کەچاوەڕێتانە. زۆر ڕاشکاو و لەڕووبن دەربارەی خووە ماددیەکانتان و ئامانجە ماددیەکانتان وچۆنیەتی دابینکردنی خەرجیەکانی خێزانەکەتان پێکەوە، درۆ مەکە دەربارەی هەژاریت یان دەربارەی قەرزی خوێندنت کەهێشتا خەریکی دانەوەیانیت. هیچ پیاوێک نایەوێت سەری بسوڕمێت، کە دانەوەی ١٠٠،٠٠٠$ی خوێندنت لەگەڵ بەشبکات. دەشتەوێت ئامادەبێت ئەگەر تۆ خواستی هەڵگرتنی خەرجیەکانی تاکەکانی خێزانەکەت هەبێت، یان هاوڕێ نزیکەکانت، ئەگەر تۆ وا ڕاهاتووی دابینکەری خەرجیەکانی خێزانەکەت بیت، ئەوا دڵنیات دەکەمەوە زۆربەی پیاوان ئەمەیان پێ خۆش نیە و ئامادە نیە لەگەڵ تۆو هاوسەرگیریەکە، ڕاشکاوبە لەگەڵی، و لەگەڵ تاکەکانی خێزانەکەت و لەگەڵ خۆت، دەربارەی چۆنیەتی بەڕێوە بردنی قەرزەکانت لەداهاتوودا___یان ئەگەر تۆ لەسەرو هەموویەوە___هاوسەرگیریت کردووەو خێزانداریت. ئەگەر گونجاو بوو، چاوپێکەوتن لەگەڵ ئامۆژگاریکەری ماددی بکە تا دڵنیابێت هەردووکتان لەهەمان لاپەڕەدان، لەبەرئەوە ئەو کاتە بەکاربهێنە تا بڕیار بدەی بەڕێوبەری خەرجیەکانی ماڵەکەت کێ بێت؟ ئایا تۆ ___یان ئەو___یان هەردووکتان پێکەوە دەبن؟ چۆن خەرجیەکانی مانگانە دابەش دەکەن؟ ئایا تۆ بەشداری مانگانەت وەکو ڕێژەیەکی سەدی موچەکەت هەژمار دەکەیت؟ چۆن بڕیارێکی دادپەروەرانە دەدەیت کە لەسودی هەردوولاتان بێت؟ وە ئایا بۆ کڕینی شتێک کەخوازیاریت بیکڕیت پاساو بۆ پیاوەکەت دەهێنیتەوە؟ وە ئایا پیاوەکەت دەتوانێت تەلەفیزیۆنی

لاینجی خەونەکانی بکرێت، بەبێ ئەوەی هیچ سکاڵایەکی لە تووە لێبکرێت؟ دانانی ئامانجی هاوبەش بۆ داهاتووی مادیتان ڕێگایەکی باشە بۆ دەستپێکردنی هاوسەرگیرییەکی سەر ڕاست.

**٦.تۆ ئامادەی خێزان پێک بهێنیت لەگەڵی؟**

دەزانم کە تۆ دڵت ناسک بویەوە کاتێک بینیت لەگەڵ خوشکەزا و برازاکەیدا یاری و گاڵتەی دەکرد، بەڵام ئایا ئەو ئامادەیە کە بەدرێژای کات باوک بێت؟ بزانە تێڕوانینی چیە بۆ منداڵ و چەند منداڵی خۆشدەوێت! ئایا دەتەوێت یەکسەر منداڵت ببێت یان دەتەوێت چاوەڕێ بکەیت؟ خانمەکەم، ڕێگەمەدە تەمەنت و فشاری خێزانەکەت بەشێک بن لەم بڕیارەت، خێزان دروستکردن کارێکی گرنگە و تۆش دەتەوێت هەردووکتان ڕازی بن لەسەر ئەوەی چۆن گیانێکی تازە پەروەردە بکەن کەدەیهێننە سەر جیهان.

**٧.ئایا ئاسوودەن لەگەڵ منداڵەکانی یەکتری؟**

تێکەڵکردنی خێزان پێکەوە دەتوانێت وەکو ڕکابەرییەک بێت، من و هاوسەرەکەم ماجوری ٧ منداڵمان هەیە لەهەموو پەیوەندییەکانی پێشترمان، بەشی هەرە گرنگ لەهێنانی منداڵ بۆ هاوسەرگیریە نوێیەکەت ئەوەیە کەبزانن و دڵنیابن خۆشەویستن، وە کات تەرخان بکە بۆ وتووێژکردنێکی تێروتەسەل لەگەڵ هاوبەشی ژیانت دەربارەی چۆنیەتی دابەشکردنی کاتەکان، یاساکانی ماڵ، وە ڕێک کاری لەگەڵ منداڵەکانت. لەبیری نەکەیت بیر لەمنداڵی پێگەیشتوو بکەیتەوە لەژیانی پیاوەکەتدا، تەنها لەبەرئەوەی گەورە بوون و منداڵی خۆیان هەیە، مانای ئەوە نیە کەبەلایانەوە گرنگ نیە بەشی داهاتووی ژیانی باوکیان

چۆن دەبێت. وە بێگومان ئەوان بەشێک بن لەتێڕوانینەکانت و خێزانە نوێیەکەت.

## ٨. ئایا ئاسودەن لەگەڵ خێزانەکانی یەکتر؟

لەکۆتایدا دەزانیت چۆن ڕەفتار لەگەڵ دایکە خۆسەپێنەکەیدا بکەیت (خەسوت)، لەکاتی کۆبونەوە خێزانیەکاندا، بەڵام ئایا ئامادەی مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت تا کۆتایی ژیانت؟ پیاوەکە لەگەڵ خێزانەکەت ئاسودەیە، کەپێکهاتووە لە شەش خوشک و برا وە ١٨ خوشکەزا و برزا وە ٣١ ئامۆزا، بەڵام دەتوانێت ڕەفتاریان لەگەڵ بکات لەهەموو ڕۆژی پشوویەکدا؟ ئایا ڕازیە بۆ هەڵگرتنی بەرپرسیاریەتی یەکێک لە دایک و باوکە پیرەکەی، یان یەکێک لە ئەندامانی خێزانەکەی کە خۆشیدەوێت بۆ چەند ساڵێک؟ لە کاتێکدا کارکردن بۆ پەیوەندیەکەتان تەنها لەسەرشانی تۆ و پیاوەکەتە، ناتوانیت بەرهەڵستی کاریگەری خێزانەکان بکەیت کە کار لەهاوسەرگیریەکەت دەکات. پێکەوە مشتومڕ بکەن بەشێوەیەکی ڕووبەڕوو دەربارەی خێزانەکانتان وسەختیەکانی ڕابردوو، وە پێشبینیەکانی داهاتوو. وە پلان دابنێن بۆ توانجەکانی خزم و کەسە نزیکەکان و ڕووداوە خێزانیەکانی کە لەجڵەو دەرچووە.

## ٩.ئایا ئاسودەی لەگەڵ هاوڕێکانی؟

باشترین هاوڕێی لە کۆلێژەوە هاوڕێیەتی و پەیوەندی نێوانیان بەهێزترە لە سیکۆتین، لە کاتەخۆش و ناخۆشەکاندا پێکەوە بوون، بەڵام ئایا کاتێک دوا نیوەڕۆی ڕۆژی یەکشەممە هەڵدەستیت و ماڵەکەیان تێک و پێک ناوە لەکاتی سەیرکردنی تۆپی پێ؟ کوڕە کێویەکان، شەوێک دوان! جارێک لەمانگێک یان

بەدرێژایی گەشتی کوڕێنیان؟ وەچی ئەگەر هاوڕێی کچی نزیکی هەبوو؟ ڕاستگۆبە لەگەڵ خۆت و دڵنیابە کە کێشەت نیە و ڕازیت بەهەموو هاوڕێکانی کەپشتیان پێدەبەستێت.

**١٠.ئایا ئامادەی بۆ خراپتر یان باشتر؟**

هەر وەک لەم قەیرانە ئابورییەی ئەم دواییانە بینیمان، بۆی هەیە خەڵک لە ملیۆنێرەوە ببێت بەقوربانی و هەوڵبدات بۆ بژێوی ژیانی، یان یەکێک لەخزمە نزیکەکانت بەمەدا تێ پەڕببێت و پێویستی بەیارمەتی بێت بۆ جێگیربونێکی کاتی لەماڵێکدا بۆ برا و خوشکە بچوکەکانی یان ئامۆزاکانی، ئەگەری ڕوودانی هەر شتێک هەیە لەهەر ساتێکدا بێت، ئایا بەڕاستی تۆ ئامادەی خراپتری یان باشتری لەگەڵ ئەم پیاوەدا؟ ئایا ئامادەیی نیشان داویت کە دەتوانێت لەگەڵت بێت کاتێک پێویستت پێیەتی؟ ئایا تۆش دەتوانیت ئەو ژنە بیت کەپێویستی پێیەتی لەکاتی نەهامەتی و قەیرانەکاندا، تەنها هێز و توانای مەخەملێنە بۆ مانەوە لات لە کاتە سەختەکاندا، بەڵکو دڵنیابە لەناخی دڵتەوە دەزانیت کەئەم پیاوە لەلات دەبێت کاتێک ژیان هەژاندویتی؟

ئەم هەنگاوانە هەموو ئەو شتانە ناگرێتەوە کەپێویستە لە هاوسەرگیریدا ڕەچاوی بکەیت، بەڵام بیرۆکەی باشت پێدەدات لەبارەی ئەوەی کەئایا تۆ بەڕاستی ئامادەی کۆتا بڕیاری خۆت بدەیت، هێندە خۆت سەرقاڵ مەکە بەپلانی ئامادەکردنی ئەڵقە و جلوبەرگ و ئاهەنگەوە، هەتا پلانی ژیانت لەگەڵ ئەم پیاوە لەبیر بکەیت، هەموو پیاوێک دەتوانێت بەڵێنی درۆت پێ بدات، بەڵام کەوتوتە سەر پیاوێکی ڕاستەقینە کەبێتە پێشەوە و ببێت بەو مێردەی کە شایەنیت.



__٢٠__

# دووركەوتنەوە لە دوژمنداری خێزانی

## تێكەڵ بوون لەگەڵ خێزانەكەی

تۆو پیاوەكەت لەهەنگاوی باشدان، ٩٠ ڕۆژەكەی تێپەڕاندووە بەشێوەیەكی تەواوەتی، و تۆش چێژ وەردەگریت لەقسەكردن لەگەڵی (جگە لەنامە)، و شەوی ژوانەكەتان سەرنجڕاكێش و چێژ بەخش بوو، هەردووكتان چەند جارێك پێكەوە ڕۆشتوون بۆ پەرستش لە یەكشەممەدا و چێژتان لێوەرگرتووە.

هەردووكتان چێژ وەردەگرن لەژەمێكی خۆش دوای پەرستشەكەتان، لەڕۆژی یەكشەممەدا كاتێك پێی وتی: «من حەز دەكەم بە خێزانەكەمت بناسێنم، هەفتەی داهاتوو لەئاهەنگی یادی لە دایكبوونی خوشكەكەمدا››. تۆش بەتۆزێك شەرمەوە زەردەخەنەیەكی بۆ دەكەیت و زمانت دەڵێت: « بێگومان، زۆر حەز دەكەم›› ، بەڵام مێشكت دەڵێت: « ئۆو، خوایە! ئایا من ئامادەم چاوم بەخێزانەكەی بكەوێت؟ « ئەگەر بانگهێشتی كردیت بۆ چاوپێكەوتنی خێزانەكەی، ئەمە زۆرێك لە بەرپرسیاریەتیەكانی بەرامبەرت ڕوون دەكاتەوە، وە داهاتوی

پەیوەندیەکەتان ڕووندەکاتەوە، بەڵام پێش ئامادەبوون لەم کۆبوونەوە یەکەمیە خێزانیە، ئەمە چەند خاڵێکە کە وات لیدەکات ئامادەبیت.

## ١.ڕوون بە دەربارەی دۆخی پەیوەندیەکەتان:

مەبەستم نیە، تێکەڵی هیچ کۆمەڵگەیەکی خێزانی نابم ئەگەر تۆ لەسەدا سەد دڵنیا نەبیت کەهەردووکتان پابەندی پەیوەندیەکەن، ئەگەر هێشتا وەکو «تەنها هاوڕێیەک» یان «کەسێک کەخۆی پێدا هەڵبواسێت»، دەتناسێت، تەنانەت خۆشت بەئارایشتکردنەوە ماندوو مەکە، خراپتر نیە لەوەی کەبڕۆیت بۆلای یەکێک لە ئەندامانی خێزانەکە وفرمێسک بڕێژیت دەربارەی ئەو پەیوەندیەی کەبیرت لیدەکردەوە.

## ٢.پەرتوکێکی سەرەتایی درووست بکە لەسەر خێزانەکەی و پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئەندامە گرنگەکاندا:

یەکەم کەس کەچاوت پێی دەکەوێت کێ دەبێت؟ دایک و باوکی پێکەوە؟ نەنک و باپیرەی؟ خوشک و براکانی؟ برازا و خوشکەزا دڵخوازەکانی؟ مامە گەورە خۆشەویستەکەی؟ داوا لەپیاودکەت بکە کەچیرۆکی خۆشەویسترین تاکی خێزانەکەیت بۆ بگێڕێتەوە. ئەگەر توانیت چەند ناوێک لەبەربکەی، کەس چاوەڕێی ئەوەت لێ ناکات کەناوی هەمووان بزانیت، (بەتایبەتی ئەگەر خیزانێکی گەورەی هەبوو!) بەڵام ئەگەر بزانیت کە( کاری) خوشکەکەیەتی و (کایلی) خوشکەزاکەیەتی و ئەمە یارمەتیدەرت دەبێت پەیوەندی درووست بکەی.

## ٣.بەشێوەیەکی گونجاو جلوبەرگ بپۆشە:

بەڵێ، پیاو چێژ لەوە وەردەگرێت کە بەکەشخەیی دەردەکەویت «ڕەوشت بەرزی»، بەڵام لەماڵی پیاوێکی مەزندا شوێنێکی گونجاو نیە کە جلوبەرگێکی زۆر سەرنجڕاکێش لەبەربکەی، ناچاریش نیت وەکو ڕەبەنێک جلوبەرگ بپۆشیت، بەڵام دڵنیابە هێشتا بەجوانی دەردەکەویت، بەڵام بەگونجاوی، کاریگەریی یەکەم چەندین ڕێگای درێژ کورت دەکاتەوە.

## ٤.بەڕاستی خۆت بە:

بە تەواوەتی دانەیەک بە لەو ژنانەی کە بەشانازییەوە دەیهێنێتەوە بۆ ماڵەوە بۆلای خێزانەکەی، هیچ زاراوەیەکی ساختە بەکارمەهێنە، یان هەوڵمەدە کەببیت بەشتێک کەخۆت وانیت، دڵنیابە و شانازی بکە کەکێیت و ئەم ڕەسەنایەتیەت دەدرەوشێتەوە بەناو خێزانەکەیدا، زۆرباشە، تۆ ئەوەت کرد لە ئاهەنگی لەدایکبوونی پێنج ساڵی خوشکەزاکەی وە ئاهەنگی خانەنشینکردنی مامە ئازیزەکەی، وە هەندێک گفتوگۆی کچانەی باشت لەگەڵ دایکی و خوشکەکانی و هەندێک لە ئامۆزا کچەکانی ئەنجامدا، وە تەنانەت کاریگەریت لەباوکی کرد بەدواین یاری تۆپی پێی هەفتەی ڕابردوو. بەڵام هەندێک تاکی خێزانەکە هەن کە شتگەلێکی بێمانا دەڵێن دەربارەی تۆ و یەکێکیان هێندە بوێری هەبوو کەباسی خۆشەویستە کۆنەکەی پیاوەکەت بکات لە ئامادەبوونی تۆدا.

چۆن بەرگەی تاکەکانی خێزانەکە دەگریت کاتێک لە سنور دەرچوون؟ ئایا ئەوە شوێنی تۆیە تا خێزانەکەی تاقیبکەیتەوە؟

١.یەکەم، با پیاوەکەت بزانێت کە شتێک تۆی نارەحەت کردووە. ئەوە بەیەکگەیشتنەوەی خێزانەکەیەتی و هەوڵدەدات تۆ بەدووربگرێت لە مامە ئێجگار چاو باشقاڵەکەی، بەڕەوشتەوە پێکەنێت و بەلایەنی کەمەوە دە جار هەوڵتدا سەرنجی بەلاڕێدا ببەیت، بەڵام ئەو تەنها ناوەستێت.

ڕێگەمەدە هیچ کێشەیەکی خێزانی کاتی هەبێت بۆ تێکدانی پەیوەندیەکەتان. لێی گەڕێ با یەکسەر بزانێت، ئەگەر کەسێک یان شتێک بێزاری کردووی. ئەمە خێزانی خۆیەتی لەبەرئەوە وازبهێنە با ئەو یەکەم کەس بێت چارەسەری هەر کێشەیەکی دڕکاوی بکات کە لەڕێگەی تۆدا درووست دەبێت، ئەو زیاتر دەزانێت دەربارەی جموجۆڵی خێزانەکەی و گیرو گرفتی تاکەکانی خێزانەکەی، بۆیە ئەو یەکەم کەسە کەتوانای هەڵسوکەوتکردنی لەگەڵ ئەو بارودۆخەدا هەبێت. ئەی چی دەربارەی مامە (مایک)، کە حەز دەکات تێبینی زیاتر بدات دەربارەی لاشەت، بەقسەکانی پێمەکەنە، دەبێت خۆت وای لێ بکەیت تا بەجوانی ڕەفتارت لەگەڵ بکات، خێرا وای لێ بکە کە بزانێت تۆ نا ئاسودەی بە تێبینیەکانی.

## ٢.یەکسەر پێداگر بە:

ئەگەر هەندێک لەئەندامانی خێزانەکەی شتگەلێکیان هەبوو کە بیڵێن دوای ئەوەی پیاوەکەت کێشەکەی چارەسەر کرد، بەڕێزەوە با ئەو تاوانبارانە بزانن کەتۆ بەرگەی ئەوە ناگریت کەبەرامبەرت دەیڵێن و دەیکەن، لەوانەیە ئەمەیان بەدڵ نەبێت، بەڵام لەوانەیە ئەندامانی خێزانەکەی زیاتر ڕێزت بگرن کاتێک بەرگری لەخۆت دەکەی.

٣.کات تەرخان بکە بۆ کۆبونەوەی خێزانی:

تۆ ئەوت خۆشتدەوێت، بەڵام لەوانەیە خێزانەکەی وشکبن، بەڵام هێشتا دەتوانیت هەر ڕێزیان بگریت و مێشکت ئاسودە بکەیت لەڕێی دیاریکردنی کاتێک بۆ بەسەربردنی کاروباری خێزانی، دەتوانن ڕێبکەون کەتۆ تەنها سێ کاتژمێر لەئاهەنگەکە دەمێنیتەوە، بۆ ئاهەنگی سەری ساڵ تەنها دەتوانی ٧٢کاتژمێر لە ماڵیان بمێنیتەوە. سنورداركردنی كاتێكی دیاریكراو یارمەتیت دەدات فشارەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ خێزانەکەی کەم بکەیتەوە بۆ کاتێکی زیاتر کەپێویستە لەسەرت.

## ٤.جیابکەرەوە و کۆیبکەرەوە:

لەوانەیە هەندێک لەئەندامانی خێزانەکەی کەمتر تۆقێنەر یان کەمتر بەرەنگارت ببنەوە کاتێک یەک لەدوای یەک دەیانناسی، ئەگەر پێت خۆشە، دایکی بانگهێشت بکە لەدوا نیوەڕۆیەک پێکەوە بچن بۆ ئارایشتگا، یان لەگەڵ خۆشەویسترین ئامۆزایدا بڕۆن بۆ یاری بەیس بۆڵ، زۆربەی خەڵک پاسەوانەکانیان لادەدەن و ڕووی ڕاستەقینەی خۆیان نیشاندەدەن کاتێک لەژینگەیەکی ئاسودەدان، ئەگەر ئەمە بەڕاستی پەیوەندیەکی باشە و تۆش پێوەی پابەندیت، ئەوا شایەنی ئەوەیە توانای خۆت بخەیتەگەڕ بۆ ناسینی خێزانەکەی، تۆ هەرگیز نازانیت ئاخۆ خەسوویەکی دۆزەخیت ئەبێت بەتوشەوە یان خوشکێکی زۆرزان، کەناتوانێت ڕێگری لە کارەکانی بکات. یان بە خۆشبەختیەوە، لەوانەیە خەسوویەکی باشت ببێت بەتووشەوە کە تامەزرۆبێت کاتت لەگەڵ بەسەر ببات. هەرچۆنێک بێت، خێزانەکەی هەرچۆنێک دەربکەوێت، گرنگترین شت ئەوەیە کەڕاستگۆبیت، کراوەبە و لەسەروو هەموویەوە خۆت بە.



## ٢١
## کۆمەڵێک وەڵامی خێرا بۆ ئەو پرسیارانەی کە هەمیشە ویستووتە بیان پرسیت

پێشتر جارێک پێموتی، وە هەزار جاریش دەیڵێم: پیاوان بونەوەری زۆر سادەن، ئێمە کات بەفیرۆ نادەین لەبیرکردنەوە لەهەندێک شت. ئێمە ڕاستەوخۆ وەڵامی پرسیارەکانت دەدەینەوە، لەبەرئەوە داوام لەهەندێک لەهاوڕێکانم و هاوپیشەکانم کرد کۆمەڵێک پرسیارم ئاڕاستە بکەن__پرسیار گەلێک کە لەمێژە ئارەزوو دەکەن وەڵامەکانی بزانن، بەڵام هاوڕێکانیان نەیانتوانیوە وەڵامیان بدەنەوە، پرسیاریان کرد__منیش وەڵامم دانەوە:

### پیاو چی شتێکی ژن بە سەرنجڕاکێش دەزانێت؟

ستیف هارڤی: پێوەرەکانی جوانی لەپیاوێکەوە بۆ پیاوێکی تر جیاوازە، وە لەوانەیە پیاوێک شتێکی لا جوان بێت لای یەکێکی تر جوان نەبێت، وە سەرەڕای ئەوەش ئەرخەیان بە، لەبەرئەوەی ئەو کەموکوڕیانەی کەتۆ لەخۆتدا دەیبینیت کاتێک

سەیری ئاوێنە دەکەیت، لەگەڵ ئەوەشدا تۆ هەر «ژنێکی» شیاویت بۆ کەسێک لەم جیهانەدا___کەسێک هەیە کەتۆ زۆر بەسەرنجڕاکێش دەزانێت هەر وەک ئەوەی کەهەیت. وە ژنی باوەڕ بەخۆ بوو زۆر جوان و سەرنجڕاکێشە، سیما و شێوەی هەرچیەک بێت، وە پیاوان کەسانێکی زۆر ورد و بینەرن، وە بێگومان سەیری جلوبەرگی ژن دەکەن و شێوازی ڕۆشتنی و ئارایشتەکەی و لەشولاری و دەستەکانی و نەرمونیانی___ وە هیچ شتێکمان لێ وون نابێت.

**پیاوان بۆچوونیان چیە لەبارەی نەشتەرگەرییە جوانکارییەکان و ڕەنگ کردنی قژ و درێژ کردنی ، وە نینۆکی دەستکرد و هەتا دوای...؟**

ستیڤ هارڤی: پیاوێکی ئاسایی هیچ کێشەیەک نابینێت لەوەی کە دەیکەیت تاوەکو جوانتر دەربکەویت، ئێمە ڕێگری ناکەین لە نەشتەرگەریە جوانکاریەکان بەگشتی، ئەگەر ئەمە واتلێدەکات کە هەست بکەیت جوانی، بەڵام کاتێک بەپیاوەکەت دەڵێیت دەمەوێت جوانکاری لوت بکەم، لەکاتێکدا ئەو هیچ کێشەیەک لەلوتتدا نابینێت، لەوانەیە باشتر بێت واز لەلوتت بهێنیت، بۆچی سەرکەشی بەشتێک دەکەیت لەکاتێکدا پیاوەکەت بەجوانی دەزانێت؟ بۆچی کێشی خۆت دادەبەزێنیت لەکاتێکدا پیاوەکەت شێوەی ئێستاتی بە دڵە؟ بێگومان، زۆرخۆشە ئەوە لەبەرخۆت بکەیت، بەڵام پیاو بەلایەوە گرنگ نیە، چونکە دڵخۆشە بەوەی ئێستات کە هەتە.

**بۆچوونی پیاو چیە دەربارەی پەیوەندی بەستن لەگەڵ ژنێک کە زۆر لەخۆی بچووکتر بێت؟**

ستیڤ هارڤی: زۆربەی پیاوان لەتەمەنی چل بۆ پەنجاساڵی دەیانەوێت خۆیان بسەلمێنن بەهاوڕێیەتی کردنی ژنی منداڵتر لە خۆیان، ئەمە هاوشێوەی ئەوەیە کەئەم پیاوانە دەچنە دەرەوە بۆ کڕینی ئۆتۆمبێلی وەرزشی مەکینە بچووک، کە ژاوە ژاوێکی زۆر درووست دەکات: ئەوان ئەم کارە دەکەن چونکە__مەکینەکەیان چیتر ژاوەژاو درووست ناکات. ئەمە ڕاستە بەتایبەتی کاتێک ژیانی پیاو ڕێکخراو نیە، ئەمە هیچ ڕەنگدانەوەیەکی لەسەر ژنان نیە: ئەمە کێشەکەیە، بەڵام ئەزانی چی؟ دڵنیابە کەپیاوی گەنج هەیە و سەیرت دەکات و بەخۆی دەڵێت: «ژنێکی نایابە، ڕێگری ناکەم لەسەلماندنی خۆم لەگەڵیدا!»، ئەم جۆرە شتانە هەر ڕوودەدات، هەر وەک پێشتر پێم ووتی هەمیشە کەسێکی گونجاو هەر دەبێت.

**ئایا پیاو ژنی لاوازی لا پەسەندە یان ژنی قەڵەو ؟**

ستیڤ هارڤی: پیاوان حەزیان لەهەموو جۆرە ژنێکە، پیاو هەیە بۆ هەموو جۆرە ژنەکان، پیاو هەیە حەزی لەژنی قەبەیە، پیاو هەیە حەزی لەژنی وردیلەیە، وە پیاو هەیە حەزی لە مامناوەندە، قەبارەت گرنگ نیە، هەمیشە پیاوێک هەیە کەتۆی بەدڵ بێت.

**ئایا پیاو ژوان دەبەستێت یان هاوسەرگیری لەگەڵ ژنی جگەرە کێش دەکات؟**

ستیڤ هارڤی: من وەکو خۆم شتی وا ناکەم، و زۆربەی

ئەوانەشی کە جگەرە ناکێشن وا ناکەن. ژنی جگەرە کێش زوو پێستی پیر دەبێت و لێویان چرچ دەبێت، جگەرە کێشان لەناخەوە ژن دادەڕمێنێت. بەڕای من جگەرەکێشان نیشانەی لاوازی و کەمی تێگەیشتووییە لەبارەی تەندروستیەوە. وە ئێمەی پیاوانی جگەرە نەکێش کاتێک ژنێک دەبینین کەگرنگی بەتەندروستی خۆی نادات یەکسەر دەزانین ناتوانێت گرنگی بەپیاوەکەی و منداڵەکانیشی بدات. زۆربەی پیاوە جگەرە نەکێشەکان بەرگەی ژنی جگەرە کێش ناگرن___ بەڵام هەمیشە نا___ئێمە لەگەڵت دەخەوین بەڵام هاوسەرگیریت لەگەڵ ناکەین.

بۆچونی پیاو چیە کاتێک ژنەکەی کێشی زیاد دەکات یان شێوەی جیاواز دەبێت لە پێشتری لەسەرەتای هاوسەرگیریدا؟

ستیڤ هارڤی: ئەو پیاوەی کە خۆشی دەوێت هەر خۆشی دەوێت، بەچاوپۆشی کردن لەهەموو شتەکان، ئێمە بێگومان تێدەگەین، وە کاتێک خۆمان ورگن دەبین حەز دەکەین ژنانیش لەئێمە تێبگەن، وە ئێمە دەزانین شێوەت ناگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی یەکترمان ناسی، بەڵام ئەگەر تۆ بتوانێت پارێزگاری لەپێوانەکانت بکەیت بەپێی توانا___زیادبونی چەند کیلۆ گرامێک نەک دە کیلۆ گرام___ تاوەکو بەجوانی و سەرنجڕاکێشی بمێنیتەوە بەبێ ئەوەی زۆر لاواز یان قەڵەو بیت، ئێمە هیچ کێشەیەکمان لەگەڵ ئەوەدا نیە، بەڵام ئەگەر پیاوەکەت بیرتەسک بوو دەڵێت ئەمەی قبوڵ نیە، بەڵام ئەگەر پیاوەکە زانی سەرەڕای زیادبوونی کێشت تۆ هەر هەوڵی خۆت دەدەی تاوەکو بەشێوەیەکی گونجاو دەربکەویت، ئەوا قبوڵی دەکات.

**ئایا پیاو پێڵاوی پاژنە بەرزی لا پەسەندە یان پێڵاوی تەخت؟**

ستیڤ هارڤی: خانمان، پیاوان پێڵاوی پاژنە بەرزیان لا پەسەندترە، ئەگەر بتوانین پێڵاوی وەرزشی پاژنە بەرزیش بۆ ژنان دەستەبەر دەکەین، زۆر بەسادەیی، ئێمە بەشتێکی سەرنجڕاکێشی دەزانین، من پیاوێک ناناسم کەپێڵاوی تەختی لا پەسەندتر بێت: هەرگیز پیاوێکی وا ناناسم، پێمان وایە پێڵاوی بەرز قاچەکانت جوانتر دەردەخات و، ڕۆشتنەکانت ژنانەتر دەبێت، خۆشتان هەمان بۆچوونتان هەیە، ئا ئەوەیە کە سەرنجمان ڕادەکێشێت.

**ئایا پیاو پەیوەندی لەگەڵ ژنی گەمژەدا دادەنێت؟**

ستیڤ هارڤی: پیاوی زیرەک ناتوانێت ژوان لەگەڵ ژنی گەوجدا ببەستێت، بەڵام دەتوانێت ژنێکی گەوج بەکار بهێنێت، زۆربەی پیاوە زیرەکەکان نایانەوێت پەیوەندی لەگەڵ ژنێکی گەوجدا ببەستن، چونکە دەمانەوێت بزانین ئایا دەتوانێت کاردکانی ئێمەو خۆشی بەڕێ بکات، بەتایبەتی ئەگەر بمانەوێت ئەلقە بکەینە دەستی لەم ڕۆژانەی ئێستاماندا، ئێمە ڕێگری ناکەین ژنێکی گەمژەی جوانمان هەبێت لەپاڵ ژنە سەرەکیەکەماندا، بەڵام هەڵی ناگرین (لای خۆمان نایهێڵینەوە).

**بۆچونی پیاو چیە دەربارەی ئەو ژنانەی کە خواردنەوەیان بۆ دەکڕن؟**

ئەمە فریودانێکی تەواودتیە، ئێمە وا بیردەکەینەوە کاتێک تۆ ڕاستت خواردنەوەمان پێشکەش بکەیت، ئەوا مانای ئەوەیە کە ئێمەت دەوێت، وە مانای ئەوەیە کە یاریەکە دەستی پێکرد، وە

ئیمە ئامادەی ڕاوکردنتین.

### هەستی پیاو چۆنە لەبارەی ژنێکی سەرخۆش؟

ستیڤ هارڤی: هەندێک پیاو حەزیان لەمەیە، بەڵام ئەو پیاوانەی کەناخۆنەوە بێگومان گرنگی نادات بەژنێک کەئالودەی مەیە، وە لەگەڵ ئەوەش هیچ پیاوێک ژنی سەرخۆشی خۆشناوێت، مەگەر لە زانکۆ بیت و لەگەڵ هاوڕێکانتدا بگەڕێیتەوە بۆ ژوورەکەتان لە بەشە ناوخۆیی، بیرت بێت پیاوان هەمیشە ئەوەیان لەژنان دەوێت کەهەمیشە وەک خانم ڕەفتار بکەن، کاتێک پیاوەکەت ناچار دەبێت هەڵتبگرێت لەبەرئەوەی تۆ سەرخۆشی، بەهۆی زۆر خواردنەوە، یان تۆ بەدەنگی بەرز هاوار دەکەی، ئەوا کێشەیە.

### ئایا دەبێت ژن دیاری بۆ پیاوەکەی بکڕێت کاتێک لە ژواندان؟

ستیڤ هارڤی: هیچ ڕێگریەک نیە ئەو کارە بکەی، ئەگەر تەنها لە پەیوەندیەکی پەیوەستدای لەگەڵی، چونکە پیاو بێجگە لەوە وا بیردەکاتەوە کەتۆ (١) هەوڵدەدەیت بیخەیتە داوەکەوە (٢) چاوەڕێی شتێک دەکەیت لەبەرامبەردا، چاوەڕێ بکە وسەیر بکە بزانە سەرەتا ئەو چیت بۆ دەهێنێت___لێی گەڕێ با پیاو بێت، سەرنجت ڕابکێشێت، و پیاوی ڕاستەقینە حەز دەکەن ئەو کارە بکەن لەپێناو ئەو ژنەی کەلایان گرنگە.

تێبینی: سوپاسی بکە بۆ ئەو دیاریانەی کە پێشکەشت دەکات، بەڵام وەک و ئاماژەیەکی مەبینە کەهەفتەی داهاتوو ئەڵقەت پێشکەش بکات، زیاتر لەمانای خۆی لێکدانەوە بۆ

یارییەکەی مەکە. چونکە ئامادە نیە بۆ کارەکانی داهاتوو، کارەکانی داهاتوو___شێوازی دەربڕینی خۆشەویستی بۆت و دابینکردنی و پارێزگاری بۆت___ئەوانە ئاماژەی ڕاستەقینەن لەبارەی هەستی پیاو بەرامبەرت.

**هەستی چۆنە لەبارەی ئەو ژنەی داوای پارەی لێدەکات؟**

ستیڤ هارڤی: نەکەی شتی وا بکەی لەسەرەتای پەیوەندیەکەتاندا، مەگەر تۆ لەو جۆرانە بیت کەڕاوی پیاو دەکەن لەپێناو پارەکانیدا (هەڵکۆڵەری ئاڵتون). بەڵام ئەگەر لەپەیوەندیەکی ڕاستدا بیت لەگەڵی و لە قەیرانی ماددیدا بیت، داوای یارمەتی لێبکە و سەیری کاردانەوەی بکە، پێی بڵێ:»من بەڕاستی لەقەیرانێکی ماددیدام و شەرم دەکەم داوای یارمەتی بکەم، بەڵام بەڕاستی پێویستم بەیارمەتیتە، دەتوانیت ۱۰۰$ م بەقەرز بدەیتی تا ئەم پارەیە بدەمەوە؟ بەزووترین کات بۆت دەگەڕێنمەوە». ئەو پیاوانەی کەبەڕاستی گرنگیت پێ دەدەن و دریغی ناکەن ئەگەر پارەیان پێ بێت.

**ئایا پیاو یارمەتی ژنەکەی دەدات لەدروستکردنی پیشەکەیدا؟**

ستیڤ هارڤی: پیاو بەبێ هیچ دوو دڵیەک ئەمە دەکات. بەڵام ئەگەر تۆ مامەڵە لەگەڵ پیاوێک دەکەیت، کەژیانی لەسەر ڕێگایەکی ڕاست نیە، و ناخی ئاسودە نیە دەربارەی نازناوەکەی و کارەکەی و پارەکانی، کەواتە تۆ لەبەردەم پیاوێکی دوو دڵدایت، کەناتوانێت دەستی یارمەتیت بۆ درێژ بکات، لەبەرئەوەی هێشتا لەهەوڵی بەدەستهێنانی ئامانجەکانی دایە وکاتیشی نیە تا

یارمەتیت بدات بۆ بەدیهێنانی خەونەکانت، بەڵام ئەگەر کارەکەی ڕێکخراو بوو دڵنیا بوو لەپیاوەتی، ئەوا بەدڵنیایەوە یارمەتیت دەدات.

**ئایا بەلاتەوە ئاسایە کە ژنەکەت کار نەکات؟**

ستیڤ هارڤی: لەگەڵ ئەوەی کە کارکردنی هاوسەرەکەم لەم ڕۆژگارەدا بەنزیکەیی شتێکی پێویستە بۆ بەدیهێنانی خەونەکان، بەڵام ئەگەر پیاو توانای دابینکردنی پێداویستەکانی خێزانەکەی هەبوو، هیچ کێشەیەک نیە ئەگەر ژنەکە لەماڵەوە بێت.

**پیاوان هەستیان چۆنە بەرامبەر ژنانی شۆفێر؟**

ستیڤ هارڤی: ئەمە سەدەی بیست و یەکە. لەبەرئەوەی زۆربەی پیاوان کێشەیان لەگەڵ شۆفیری ژندا نیە، بەڵام هێشتا هەندێ شێوازی کۆن هەیە، پیاوە شۆڤینیەکان پێیان وایە پێویستە ژنان شۆفێری لیگەڕێن بۆ ڕەگەزی بەرامبەر، من نازانم لەچی ئەشکەوتێکدا دەژین. بەڵام لەهەمووی گرنگ تر، لەڕاستیدا من چاوم بەهیچ یەکێک لەم جۆرە پیاوانەم نەکەوتووە.

**ئایا گرنگی بەوە دەدات کەژن حەزی لەوەرزشە؟**

ستیڤ هارڤی: نەخێر، بەڵام هەندێک پیاو حەزیان لێیەتی، بەڵام زۆربەی پیاو حەزیان لەوەیە یاریەکە بەشێوەیەکی ئاشتیانە بکەن، ئەگەر لات گرنگ نیە شتێکی تر بدۆزەرەوە تا بیکەیت.

ئایا پیاوان حەزیان لە بازاڕ کردنە؟

ستیڤ هارڤی: ئێمە لەگەڵتان دێین، ئەگەر ناچارمان بکەیت بۆ ئەوە، و تاکە ڕێگایە بۆ بەسەربردنی کات لەگەڵت، بەڵام بەڕاستی ئەوە کارێکە حەزمان لێ نیە کەبیکەین، بیری لێ بکەرەوە: بەشێکی تایبەت بەپیاوان لەفرۆشگا هەمیشە لەقاتی یەکەم لای دەرگاکەوەیە و، هەمیشە بچوکترین بەشی فرۆشگاکەیە و بەشی تایبەت بەمندالانی تێدا نیە، یان بەشی بەرگدورین و دیزاینێکی تێدا نیە، هەموو ئەمانە لەبەرئەوەیە تاکو پیاو خێرا بڕواتە ژوورەوە و خێرا بێتە دەرەوە، وە کاتێک دەچیتە یەکێک لە فرۆشگاکان پیاوێک نابینیت کەبگەڕێت بەڕەفەکاندا، یان کراسێکی گرتبێت بە بەرییەوە کەئایا ڕەنگی شین یان سەوزی زیاتر لێدێت، ئێمە دەچینە فرۆشگا بەتەواوەتی دەزانین چیمان دەوێت و دوای کڕینی دێینە دەرەوە، بەدەگمەن شتی زیادە بکڕین، جوانترین شت لای ئێمە لەبازاڕکردندا چونە ژوورەوە و هاتنە دەرەوەیە بە خێرایی.

**بۆچونی پیاو چیە دەربارەی پەیوەندی بەستن لەگەڵ ژنێکی ڕەنگ جیاواز؟**

ستیڤ هارڤی: کەوتۆتەوە سەر پیاوەکە، بەڵام لەڕاستیدا، لەم سەردەمەدا کێ گرنگی بەوە دەدات؟ چیتر وەکو پێشتر مشتومڕی گەورە دروست ناکات؟ هەروەک چۆن من وەک خودی خۆم لام گرنگ نیە، خۆشەویستی ڕەنگ ناناسێت، وە کاتێکیش کەسێک خۆشەویستی لای کەسێک دەدۆزێتەوە لەڕەگەزێکی جیاوازتر لە خۆی گرنگ نیە، چونکە هەردووکتان خۆشەویستیتان دۆزیوەتەوە، ئایا هەر ئەوەش گرنگ نیە؟

لەگەڵ ئەوەش پێویستە ژن دڵنیابێت کەپاڵپشتی خۆشەویستی ئەمە دەکات، چونکە ئەگەر ئەمە لەبەر گەیشتن بەپێگەیەکی کۆمەڵایەتی بەرز بکات، ئەمە هۆکارێکی سامناکە هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێکی ڕەنگ جیاواز بکەیت، بەڵام ئەگەر ئەمە لەبەر خۆشەویستی بکات ئەوا هێزی زیاتری پێدەبەخشێت.

## بۆچی پیاوان دوای کۆبونەوە (سێکس کردن) حەزیان لە باوەش نیە؟

ستیڤ هارڤی: چونکە ئێمە وروژاو ، ماندوو بوین، ئێمە هەوڵێکی زۆر دەدەین لەکاتی سێکس کردندا کە وامان لێدەکات ماندوو بین و ئارەق بکەینەوە، وە هەموو ئەوەی کەپێویستمانە یەک خولەک چاوەڕێ بکەیت پێش ئەوەی بێیت و باسی باوەش بکەیت.

## چۆن پیاوەکەت تێبگەیەنیت کە ئارەزووە جنسیەکانت تێر ناکات؟

ستیڤ هارڤی: بیرۆکەیەکی باش نیە کە ئەم هەواڵەی لەسەر مێزی نانخواردن یان لەناو ئۆتۆمبێلدا بڵێیت. هیچ شتێکت لەمەوە دەست ناکەوێت، کاتێک گومان لەتواناکانی ئێمە دەکەیت بەڕاستی دوودڵ و شەرمەزار دەبین، من پێشنیاری بۆ دەکەم لەکاتی کۆبوونەوەتاندا ئەم کارە بکەیت، ئەوکات شتەکە زۆر لەڕوو دەبێت، شتێکی لەم شێوەی پێ بڵێ: «ئۆو، ئەوەم بەدڵە کەئەیکەیت» یان «جوانە، ئازیزەکەم ئێستا بەو شێوەیە بیکە» ، سەیری بکە چۆن بۆت جێ بەجێ دەکات، ئەو کات پیاو ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دەدات تاوەکو تۆ ڕازی بکات لەجیاتی

ئەوەی گوێی لەگومانەکانت بێت، و لەکاتی کۆبوونەوەدا، ئێمە ئامادەی هەموو پێشنیارێکین، بەتایبەتی ئەگەر پێمان وابێت کەئەو شتەی دەمانەوێت بەدەستی دەهێنین.

**ئەی چی ئەگەر ئێمە زیاترمان ویست و دەستمان نەکەوت؟**

ستیڤ هارڤی: هەرچیەک دەکەیت، نەکەی ئەم گفتوگۆیە بە وشەی ترسناک دەست پێ بکەیت، «ئێمە دەبێت قسە بکەین»، چونکە بەرگریمان نامێنێت و چاومان سور دەبێت، و دڵنیا دەبیت ئەو کاتە باشانەی پلانمان دانا بوو لەگەڵت بەسەری ببەین خەریکە کۆتایی دێت، لەجێی ئەوە، بە لەسەرخۆیی شتێکی لەم شێوە بەپیاوەکەت بڵێ: «من، بەتۆ تێرنابم» ، و ئەم قسە وای لێدەکات کەهەست بکات کەسێکی ویستراوە و هەوڵێکی زیاتر دەدات بۆ پڕکردنەوەی ئارەزووەکانی خۆشەویستەکەی، لەجیاتی ئەوەی واهەست بکات کە کێشەیەک هەیە.

**کەی کۆببنەوە ئەگەر ئێمە شەڕمان بێت؟**

ستیڤ هارڤی: ڕۆژێـک بـەس دەبێت بۆ ئێمە، ئەگەر مەبەستمان لە جۆرێک مشتومڕ بێت، تۆ توڕەیت دەربارەی ئەوەی شتێکی سەبارەت بەمنداڵەکان وتووە و ناتەوێت ئەم شەو لەگەڵی بخەویت، من ڕازیم، بەڵام ئەگەر بۆ بەیانی هات و تۆش هێشتا توڕەبوویت و دەستی کردە ملت و تۆش دەستیت لەخۆت دوورخستەوە، ئـەوە کێشەیە، پیاو زۆر چـاوەڕی ناکات، بەڵام ماوەیەکی درێژتر بەرگە دەگرێت ئەگەر هاتوو ناپاکی لەمتمانەت کردبوو، بەجۆرێک لە جۆرەکان، وە پێویست

بوو کەڕێزو متمانەی تۆ بەدەست بهێنێتەوە، زۆر باش لەوە تێدەگەین.

**چۆن ژن بزانێت پیاوەکەی هاوڕەگەزبازە؟**

هیچ بیرۆکەیەکم نیە، چونکە پیاوە هاوڕەگەزبازەکان و ژنە هاوڕەگەزبازەکان دەتوانن وەڵامی ئەم پرسیارە بدەنەوە، کە من سەر بە هیچ لایەکیان نیم.

**هەستی پیاو چۆنە لەبارەی پەیوەندیە کراوەکان؟**

ستیڤ هارڤی: ئەگەر پیاوێک ڕازی بوو لەبارەی «پەیوەندی کراوە» وە یان پێشکەشکردنی، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کەتۆ ناکەویتە پلانە درێژخایەنەکانیەوە و داهاتوو لەگەڵ تۆدا نابینێت، هەردووکتان پەیوەستن لە ووتنی «ئێمە کەمێک تام و چێژمان دەوێت لەپەیوەندیەکەدا». ئەگەر پیاو خۆشی بوێیت لەگەڵ هیچ کەسێک هاوبەشیت پێ ناکات___بڕایەوە. کاتێک پیاوێک دەدۆزیتەوە ئامادەبێت لەگەڵ کەسانی دیکەدا بەشت بکات و هاوبەشیت پێ بکات، ئەوا بزانە خۆشیناوێیت. ئێمە بەم ڕێگایەدا ناڕۆین.

**ئایا پیاو پێی ناخۆشە پرسیار لە ڕابردووی بکەی؟**

ستیڤ هارڤی: بەڵێ، ئەم پرسیارە نارەحەتمان دەکات، ئێمە وابیر دەکەینەوە کەتۆ دەتەوێت قوڵتر بیتەوە لێمان، کاتێک دەست دەکەیت بە بەدواداچوونی ڕابردوومان، لەوانەیە بڕیاری لەبارەوە بدەیت، لەگەڵ ئەوەش، تۆ مافی ئەوەت هەیە ڕابردووی پیاو بزانیت، بەڵام هەر لەیەکەم ژوانەوە پرسیار دەربارەی ڕابردووی مەکە، چونکە وەڵامێکی ڕاستت دەست ناکەوێت،

چونکە پیاو هێشتا بڕیاری نەداوە کەئەم پەیوەندیە تا کوێ درێژە دەکێشێت، لەبەرئەوە بەپێویستی نازانێت خۆی ئاشکرا بکات، کاتی خۆت بەفیڕۆمەدە بەپرسیارکردن لەژنی پێشووی: لەبەرئەوەی هەموو ئەو شتەی کەبڕیاری لەسەر دەدات ئەو نازارەیە کەپێی داوە، نەک ئەو شتانەی کەبەرامبەریی کردویەتی، کەمێک کات بە پەیوەندیەکەتان ببەخشە، ئەو شتانەت بۆ ئاشکرا دەبێت کە پێویستە بیزانیت.

**هەستی تۆ چۆنە دەربارەی ئەو ژنەی کە دوای هاوسەرگیری نایەوێت نازناوی پیاوەکەی هەڵبگرێت؟**

ستیڤ هارڤی: زۆربەی پیاوان ئەم کێشەیان هەیە، بیر لەو سێ ڕێگایە بکەرەوە کەپێشتر پێم ووتی کەپیاو خۆشەویستی خۆیانی لەڕێگەوە پێ دەردەبڕن، پیاو دابین دەکات و دەپارێزێت و خۆشەویستی خۆی دەردەبڕێت، ئەگەر نەمانتوانی بڵێین: «ئەمە خاتوو هارڤیە» ئەوکات زۆر دوور دەکەوینەوە لەناوەڕۆکی دەربڕینی خۆشەویستیمان بۆت، ئێمە پێویستمانە بزانین کەتۆ بەوەفای بۆمان، وە بۆ دەربڕینی ئەمە بەلایەنی کەمەوە دەبێت هەڵگری نازناوەکەمان بیت. ئێمە لامان گرنگ نیە کەچەند گرنگی بەنازناوی باوکت و ناوبانگی خۆت دەدەیت: ئێمە خەریکی دامەزراندنی خێزانێکی جێگیرین و پیاویش ئەیەوێت بزانێت کەتۆ پەیوەستی بەم خێزانەوە هێندەی پەیوەستیت بەخێزانەکەی پێشووتەوە، یان دەتوانیت کۆکراوەی هەردوو نازناوەکە بەکاربهێنیت، ئەگەر بتەوێت، بەڵام گرنگ ئەوەیە هەڵگری نازناوی پیاوەکەت بیت. ئەگەر پابەندی ئەمە نابیت، بۆچی بە سادەیی ناڕۆیت شو بەباوکت بکەیت؟

**ئایا ئەوە ڕاستە کەوا لە پیاوەکەت بکەیت غیرەت لێ بکات تاوەکو بزانێت تۆ دەتوانیت پیاوێکی ترت دەست بکەوێت هەر کاتێک ویستت؟**

ستیڤ هارڤی: پێویست بەوە ناکات، ئێمە ئەوەمان براندۆتەوە، ئێمە زۆرباش دەزانین کەژنەکانمان هەر کاتێک بیانەوێت دەتوانن لەگەڵ پیاوێکی تر بڕۆنە دەرەوە، بەڵام کاتێک زۆریان بۆ هێناین و هەوڵی دا غیرەی لێ بکەین، تۆ یارییەکی زۆر مەترسیدار دەست پێدەکەیت، زۆربەی کات بەرپەرچدانەوەیەکی لە ڕادەبەدەر لەلایەن پیاوەکەوە دەبێت و لەوانەشە بڵێ: «ئۆو، باشە منیش دەتوانم ئەو یارییە بکەم! « خانمەکەم ئەگەر وا هەستت کرد کە پێویستە غیرەی بجولێنیت، چونکە گرنگی پێدانی تەواوەتیت لیوەی دەست ناکەوێت، لەوانەیە پێویست بێت کەبەشی «پیاوان ڕێزی پێوانەکان دەگرن›› بخوێنیتەوە، و دواتر ئەم ئامۆژگارییانە بەکاربهێنە تا ئەو پیاوەت دەستبکەوێت کەدەتەوێت و شایەنیت.

**ئایا پیاو ڕازییە ژنەکەی هاوڕێی نێری هەبێت ؟**

ستیڤ هارڤی: من بەتوندی پێشنیارت بۆ دەکەم ئەگەر تۆ لە پەیوەندییەکی پەیوەستدایت هەموو ئەو چەنەبازییانە ڕابگرە کە لەگەڵ هاوڕێ نێرینەکانت دەیکەیت، و هەموو ئەو وێنانەی پێکەوە گرتووتانە بیهێنە خوارەوە، و ڕێگەمەدە پەیوەندی بەماڵەوە بکات و دیاری و ئەم جۆرە شتانەت بۆ بنێرێت: بەڕوونی تۆ بەدوای کێشەوەیت ئەگەر بەردەوام بیت لەمە. بیری لێ بکەرەوە: ئەگەر پیاوەکەت وێنەی ژنێکی دیکە

لەناو کەلوپەلەکانیدا بێت، تۆ مێشکت لەدەست دەدەیت، چۆن قبوڵی دەکەیت ژنێک پەیوەندی بەماڵەوە بکات و داوا بکات قسە لەگەڵ پیاوەکەت بکات، یان ئەگەر گوڵی بۆ بنێرێت؟ من پێشنیارت بۆ دەکەم هەرشتێک بخەیتەلاوە کەوا لەپیاوەکەت بکات باش بیر نەکاتەوە لەبارەی تۆ و کەسێکی دیکەوە__نە کەم و نە زیاد، بازنەیەکی جووتی بەهێزبن و ڕێگەمەدەن کەس بێتە نێوانتانەوە بەتایبەتی «هاوڕێی›› نێر، وە ئەگەر ئەم کارەت کرد ئەوا دڵخۆش دەبیت.

### بۆچی هەندێک پیاو لە ژنان دەدەن؟

ستیڤ هارڤی: زۆربەی دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی و پێویستی پیاو بۆ کۆنترۆڵکردنی کەسێک لە ژیانیدا، و دەرکەوتووە ئەو پیاوانەی لە ژن دەدەن هیچ چیرۆکێکیان نیە کە لەپیاوانی دیکەیان دابێت، ئەوان لەوپەڕی لاوازیدان.

### ئەی چی دەربارەی هاوڕێ کچەکان__تۆ هەستت چۆنە بەرامبەریان؟

ستیڤ هارڤی: ئێمە ڕێگری لەوە ناکەین، پیاوەکەت ناتوانێت پێت بڵێت کەنابێت هاوڕێی کچت هەبێت، هەروەک چۆن تۆش ناتوانیت ڕێگری لەچوونە دەرەوەی بکەیت لەگەڵ هاوڕێ کوڕەکانی بۆ یاری گۆڵف، کچە هاوڕێ باشە.

### بۆچونی پیاو چیە لەبارەی ووتی ووتی (قسەو قسەلۆک)؟

ستیڤ هارڤی: ئێمە ڕقمان لە قسەهێنان و بردنە، بەڵام

دەشزانین کەناتوانین ڕێگری لەوە بکەین، ئەمە پەلاماردانێکی کەسیە، وە پیاو بەتەواوی دڵنیایە کە کاتێک تۆ و هاوڕێکانت پێکەوەن باسی کەسانی دیکە دەکەن، هاوڕێکانیشت کاتێک هەر خۆیانن باسی تۆ و مێردەکەشت دەکەن، ئەمە بخە مێشکتەوە کاتێک جاری داهاتوو دەستت کرد بەباسکردنی خەڵکی.

## ئایا پیاو باسی ژنەکانیان دەکەن لای پیاوانی دیکە؟

ستیڤ هارڤی: شتی وا ناکات، ئەگەر تۆ ژنە شیاوەکەی بیت، ژن و کەسە گرنگەکان لەژیانی پیاودا سنوردارن لەگفتوگۆکردنی نێوان پیاودا، چونکە هیچ پیاوێک نایەوێت بەشێوەیەک لەشێوەکان بیر لەژنەکەی بکەیتەوە، و بەتایبەتی ئەگەر پەیوەندی بە پەیوەندی جەستەیی و ڕۆمانسیەتەوە هەبوو، پیاو ڕوونە لەم بابەتەدا، بەڵام کاتێک ژنە گونجاوەکەی نەبێت___بەڵکو کەسێک بێت کە پەیوەندیت لەگەڵ دابنێت لەمیانەی گەڕان بۆ ژنە شیاوەکەی___ئەوا دڵنیابە کەپیاوەکەت باست دەکات.

## ئایا پیاو لای گرنگە لەگەڵ دایکی تێکەڵ بێت؟

ستیڤ هارڤی: سەیرکە، ئەگەر پەیوەندیەکی باشت لەگەڵ دایکی نەبوو وە دایکی گرنگی پێنەدایت، ئەوا کارەکە سەخت دەبێت، پێویستە لەسەر هەر ژنێک کە ماوەی ۹۰ڕۆژە پەیوەندی لەگەڵ پیاوێکدا هەیە ئەبێت خێزانەکەی ناسی بێت. بەڵام ئەگەر هێشتا بەخێزانەکەی نەناساندووی، تۆ ناچاریت هۆکارەکەی بزانیت، یان دەبێت بەجوانی قبوڵی بکەیت کەگرنگی نادات بەدروستکردنی پەیوەندیەکی درێژخایەن لەگەڵت. ئەگەر تۆ

بەس بێت کە لەجێگەی نووستنەکەی لەگەڵی بێت، ئەوا دەبێت هێندەش باش بێت کە بەدایکیت بناسێنێت.

**ئەگەر خوشکی پیاوەکەت کچە هاوڕێیەکتی بەدڵ نەبێت ئایا لەبەرئەو پەیوەندی دەپچڕێنێت لەگەڵی؟**

ستیڤ هارڤی: بێگومان نەخێر، پیاو پەیوەندی ناپچڕێنێت لەگەڵ کچە هاوڕێکەی تەنها لەبەرئەوەی ڕێک ناکەوێت لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەی (بێجگە لەدایکی)، و پێویست ناکات خوشکەکەی بێت بۆ ماڵەوە و بەشداری کۆبوونەوە خێزانیەکان بکات، ئەگەر خۆشەویستی براکەی بەدڵ نیە، وە هەمان شتیشە بۆ ئامۆزاکانی و پورزا و خاڵۆزاکانی.

**ئەگەر پیاو خێزانی ژنەکەی بەدڵ نەبێت، لەگەڵی دەمێنێتەوە؟**

ستیڤ هارڤی: ئەگەر خێزانەکەی بە لەپێشترزانی، ئەوا بەڕێگای خۆیدا دەڕوات و جێت دەهێڵێت.

**بۆچونی پیاو چییە دەربـارەی باوکی منداڵەکانی ژنەکەی؟**

ستیڤ هارڤی: نایابە___پیاوان دەزانن کەمنداڵەکە باوکی هەیە، و ئەگەر لەژیانی منداڵەکەدا بێت، تێدەگات دەبێت کارلێکی لەگەڵ بکات، بەشێوەیەک لەشێوەکان. بەڵام پیاوەکەت پێویستیەتی کە بتوانێت کاتێک هات بۆ ماڵەکەت خۆی بێت.

ئەگەر لەپەیوەندیەکی پەیوەستدا بوو لەگەڵت، ئەگەر منداڵەکانی بینی هەڵەیەکیان کردوو نەیتوانی هیچ شتێک بکات،

ئەوکات تۆ ناهێڵیت ببیت بەو دابینکەرو پارێزەرەی کەخۆی دەیەوێت. وە ئەمە بەلایەوە کێشە دەبێت، تۆ ڕێگە نادەیت پیاوەکە پۆشاکی قوتابخانە بۆ منداڵەکان بکڕێت و یارمەتیت بدات لەدابینکردنی پێداویستیەکانیماڵەوەدا و سەوزە و میوە بۆ بەفرگرەکە بکڕێت، و سوتەمەنی بۆ ئۆتۆمبێلەکە بکڕێت، و دوایش پێی دەڵێیت مافی ئەوەی نیە ڕۆڵی باوک بگێڕێت، ئەگەر ئەمە حاڵتە، کەواتە خاڵی بوونی ئەو لێرەدا چیە؟ پێویستە لەسەرت جۆرێک لەهاوسەنگی ڕابگریت کەباوکی منداڵەکەت ئەرکی خۆی جێ بەجێ بکات، وە ڕێگە بەپیاوە نوێکەشت بدە ئەرکی خۆی جێ بەجێ بکات، ئەگەر پیاوەکەت ناتوانێت هاوبەشی بکات لەبەخێوکردنی منداڵەکەدا هەر خۆی ئەوە ڕوونی دەکاتەوە کەبۆچی باوکی منداڵەکەت ڕۆشتووە.

### ئایا پیاوەکەم چاوەڕێی ئەوەم لێدەکات کە هاوڕێ بم لەگەڵ دایکی منداڵەکانی؟

ئەم کارە بکات و ئەگەر تۆ یەکێک بیت لەوان پیرۆزبایت لێدەکەم، بەڵام گرەوی ئەوە ناکات کەبەشێوەیەکی باش تێکەڵی یەکترین و ئەمەش ناسەپێنێت.

### ئایا ڕاستە پەیوەندی بە پیاوەوە بکەی لەسەر کار تاوەکو قسەی لەگەڵ بکەی؟

ستیڤ هارڤی: ئەگەر تەلەفۆنی بۆ دەکەیت تا پێی بڵێیت «سوپرایزێکی تایبەتم بۆت هەیە کەهاتیتەوە بۆ ماڵەوە»» پێ برینێکی باشە، بەڵام ئەگەر بۆ کێشەی بێ مانا پەیوەندی دەکەی، ئەوا شتێکی باش ناکەیت.

**ئاماژەی جیهانی پیاو چیە کە مانای «من چیتر گوێت بۆ ناگرم» بێت؟**

ستیڤ هارڤی: کاتێک پیاوێک وەڵامی پرسیارەکەت دەداتەوە کە کردووتە (یان پێی وایە گوێبیستی بووە، تەنانەت ئەگەر تۆ هەرگیز پرسیاریشت نەکردبێت، لەوانەیە چیتر گوێت بۆ ڕانەگرێت، ئاماژەکە ئەوەیە کاتێک وەڵامدەداتەوە ئەگەر خەمی بوو، باسی هەر کێشەیەک بکەیت چارەسەری دەکات، بەڵام ئەگەر بەردەوام بیت لەباسەکەت ئەوکات گوێت بۆ ڕاناگریت.

**ئایا پیاو ئەو ژنانەی لاپەسەندە کە چێشتلێنان دەزانن یان ئەوانەی کە نایزانن؟**

ستیڤ هارڤی: بابەتی: «من نازانم چێشت لێ بنێم؟»» بابەتێکی زۆر گەورەیە، ئەگەر تۆ جوان بیت و نەزانیت چێشت لێ بنێیت، دەتوانین بەجۆرێک چاوپۆشی لێ بکەین، بەڵام ئەگەر هاوسەرگیرمان کرد و چێشتلێنان و چەند شتێکی دیکەت نەزانی وە داوای زۆریش لەئێمە دەکەیت___و بەکارمان دەهێنیت، پیاو ڕێزی ئەو ژنانە دەگرن کەدەزانن چێشت لێ بنێن: ئەو ژنانەی کە دەتوانن بەشێوەیەکی باش چێشت لێ بنێن، دەشتوانن هاوسەنگی ژووری نوستنەکەشیان ڕابگرن.

**ئایا پیاو بەنهێنی خەملاندن بۆ ژنێک دەکات ئەگەر دایکێکی باش و بنیاتنەری ماڵ بێت و هتد...؟**

ستیڤ هارڤی: بەتەواوەتی، کاتێک پەیوەست دەبین بە پەیوەندیەکی ئاشکرا و ڕوونەوە لەگەڵت، ئێمە بیر لەوە دەکەینەوە ئاخۆ ئەبێتماڵەکەمان چۆن بێت، ئەگەر بێت و تۆ

دایكێكی باش و توانای هەڵگرتنی لایەنە مادییەكانمانت هەبێت و بڕیاردانی درووست، و تۆش بەهەمان شێوە خەملاندن دەكەی.

## بۆچۆنی پیاو چییە دەربارەی ئەو ژنەی كە ماڵەكەی پاك ڕاناگرێت؟

ستیڤ هارڤی: پیاوان بەرگەی ئەو ژنانە ناگرن كە پاك و خاوێن نین،كاتێك خەڵك دێت بۆ سەردانمان، بەڕاستی پێت وایە كە دەمانەوێت ماڵێكی پیسیان نیشان بدەین؟ ئایا دەتوانین بە دایكمان بڵێن لەسەر قەنەفەیەكی قێزەون دابنیشێت لەژووری میوان؟ پێم وانیە، دەركەوتنی ماڵەكە ڕەنگدانەوەی تۆیە خانمەكەم، چونكە خەڵكی ناڵێن «هاوسەرەكەی ماڵ پیس دەكات»، بەڵكو بەدڵنیایەوە دەڵێن»ئەو ژنە پاك و خاوێن نیە». هەرچەند دابونەریت بگۆڕێت و بەرپرسیاریەتی پیاو لەماڵدا بگۆڕێت.

هەمیشە بابەتی پاكوخاوێنی ماڵ لەئەستۆی ژنە، و ئێمەی پیاویش بەشێوەیەكی جیاواز بیرناكەینەوە، ئێمە پێمان خۆشە كاتێك مۆم و چەپكە گوڵ دادەنێت لەگەڵ قاپ و قاچاخی زیوی، حەزدەكەین بێینەوە بۆ ماڵی پاك و خاوێن. ئێستا ئەگەر هەردووكتان كار دەكەن و تۆش ناتوانیت ماڵەكە بەپاكی ڕابگرێت و خۆ منیش نایكەم ، كەواتە ئێمە پێویستمان بەپێدانی بڕێك پارەیە بۆ كارگوزارێك تا ئەو كارە بكات، چونكە زۆر بەسادەیی نابێت ماڵەكە پیس بێت.

## ئایا پیاوان بە دوای وردەكاری دیاریكراوەوەن وەكو قەرز، كاتێك بیر لەبەستنی پەیوەندیەكی درێژخایەن

دەکەنەوە لەگەڵت؟
بەڵێ، ئەوە دیاری دەکات کەدەبێت چەندێک کار بکەیت و دەبێت چەندێک پارە دابین بکەین، لەوانەیە ئەمە ڕەتکردنەوەی مامەڵەکە نەبێت، بەڵام هۆکارێکە پیاو بەچاوی سەرنجەوە وەریدەگرێت.

**ئایا دەبێت پیاو دوای ژنەکەی بکەوێت کاتێک کە ژنەکەی پێویستی کرد بەهۆی کارەکەیەوە بگوازرێتەوە؟**
ستیڤ هارڤی: دوات دەکەوین بۆ کارە نوێیەکەت، ئەگەر دڵنیابین لەپیاوەتی خۆمان وباوەڕمان بەوەیە کەهێشتا لەتواناماندایە دابینکەرت بین، بەوشێوەی کەپێویستە و دەمانەوێت. بەڵام ئەگەر پێویست بوو هەموو ئەوە بدۆڕێنین کەهەوڵماندا بەدەستی بهێنین، هیچ بەڵگەیەک نیە ئێمە پارچەیەک هەڵبگرین و کاتێک کە بگوازیتەوە بۆ کارە نوێیەکەت، ئەوکات ئێمە دەکەوینە شەڕێکی سەختەوە.

**ئایا پیاو ڕازی دەبێت بچێت بۆ لای ڕاوێژکاری دەروونی؟**
ستیڤ هارڤی: ئێمە تەنها کاتێک گوێ بەوە دەدەین کە لەکێشە ڕزگارمان بکات. ئەگەر بزانین خەریکە تۆ لەدەست دەدەین، وە چاوپێکەوتنی ڕاوێژکاری دەروونی پەیوەندیەکەمان ڕزگار دەکات، ئەوا دەڕۆین، بەڵام ئەگەر زانیمان کێشەکەمان چارەسەر ناکات، هیچ هۆکارێکی باش نابینین بۆ دانیشتن و قسەکردن لەگەڵ کەسێک، و بڕیار بدات لەسەر هەر جوڵەیەک کەدەیکەین.

**هەستی پیاو چۆنە دەربارەی سوپرایز؟**

ستیڤ هارڤی: پیاوان حەزیان لەسوپرایزە، بەڵام تکایە چاوەڕێی هەمان کاردانەوە مەبە لێمان، ئێمە لەخۆشیا ناگرین لەبەرئەوەی دیاریت هێناوەتەوە بۆمان بۆماڵەوە، یان پلانی گەشتێکی نایابت داناوە، یان خوانێکی ڕۆمانسیت بۆ کردوین بەسوپرایز، ئەمە زۆر پیاوانە نیە.

**ئایا پیاو نیگەران دەبێت دەربارەی خیانەتی ژنەکەی؟**

ستیڤ هارڤی: زۆربەی کات، ئێمە هێندەی ژنان نیگەرانی بابەتی خیانەت نابین، لەبەرئەوەی دەزانین کە دروستبونی زگماکی تۆ جیاوازە لەهی ئێمە، تۆ زۆر بەئاگایت لەهەڵبژاردنی هاوسەرەکەتدا، وە بنەمای ڕەهات هەیە سەبارەت بەبڕیاردان لەبارەی خەوتن لەگەڵ پیاوێک، بە بۆچوونی ئێمە ئەمە بەشێوەیەکی بەرچاو نیگەرانی پیاو کەمدەکاتەوە لەبارەی خیانەتی ژنەکەیەوە.

ئەمەوێت زۆر سپاس و پێزانینی گوێگرە خۆشەویستەکانی بەرنامەی «بەیانیانی ستیڤ هارڤی» بکەم کە هاندەرم بوون بە پرسیارەکانیان دەربارەی پەیوەندییەکان.

ئەمەوێت سوپاسی «دینی میلەر» بکەم کەئەرکی گوڵبژێری ووشەکانم و هەندێک دەستەواژەی بێهاوتا لەهەندێک کاتدا کردووە و خستویەتیە سەر پەڕەکە تا گونجاو بێت بۆ خوێندنەوە لەلایەن مرۆڤایەتیەوە، بە دەربڕینێکی تر وەکو وەرگێڕێک بەکارم هێناوە، وە ئەویش ڕێگایەکی نایابی بەکارهێناوە تا بیرکردنەوەکانم چێژبەخش بن و دانایانە بن بۆ خوێندنەوە.

وە زۆر سوپاس بۆ «شێرلی سترۆبێری» هاوکاری بەرنامەی بەیانیانم، وە سوپاس بۆ «ئیلڤیرا گوزمان» ڕۆژنامەنووسم: کە هەردووکیان ئامادەبوون لەهەر پاکنووس و دانیشتنی ڕۆژنامەوانیدا و پرسیاریان ئاراستە کردووم، سیناریۆ و ئەو شتانەی کەتایبەتمەندی ژنە و ئێمەی پیاو لێی نازانین وە دوو ژن کەڕێگەیان پێدام کۆمەڵێک پرسیاری گشتگیرم دەست بکەوێت کە یەکێکیان ژنێکی سەڵتە و ئەوی تریشیان منداڵێکی هەیە و جیابۆتەوە، کە بەبێ یارمەتی ئەم دووانە ئەم کتێبە گشتگیرە بوونی نەدەبوو، وە هەروەها دەمەوێت سوپاسی «دۆن» و «داڤیس» بکەم کەئێمەی ئاشکرا کردوو وە «بیریان کریستیان» کە یارمەتی بازاڕیمان بوو وە «کاترین بایتینەر» کە یارمەتیدام لەجیاکاری و ووشەکاندا، وە سوپاسی «ترەیسی شیرۆد»، «لی لاکینس» ، «کاترین باومەر» دەکەم.

وە سوپاس بۆ هاوسەرەکەم «مارجوری» کە ژیانمی تەواو کردووە و لەوەش گرنگتر دڵخۆشی کردووم کە ڕێگەی پێنەداوم دابنیشم و بیر لەپشتی شتەکان بکەمەوە، بەڵکو بەگیانێکی ئاسوودەوە وای لێکردووم کەسێکی ڕووخۆش و خەمخۆری کەسانی دیکەبم لە خۆشی و ناخۆشیدا، وە زیاتر لەهەر کاتێک کارلێکیان لەگەڵ بکەم.

وە بۆ باوکی خوالێخۆشبووم، کەهەموو شتێکی باشی لەژیان فێرکردووم، ئەمەندە شەرەفمەند و سوپاسگوزاریم.

ستیڤ هارڤی توانای ژماردنی ئەو خانمانەی نیە کەمایەی سەرسامی بوون بەدرێژایی چەندین ساڵ ناسیونی لەڕێگەی پێشکەشکردنی برگەی «نامەکانی ستراوبێری» لەمیانەی پێشکەشکردنی بەرنامە کۆمیدیەکانیەوە.

ژنان توانای بەڕێوەبردنی دامەزراوە بازرگانیەکانیان هەیە و، توانای هێشتنەوەی ماڵ و منداڵیان هەیە بەشێوەیەکی باش، سەرکردایەتی کۆمەڵە ناوخۆییەکان دەکەن، کەچی ناتوانن لە پاڵنەرەکانی پیاو تێبگەن.

کاتێک بابەتەکە دێتەسەر پەیوەندی دانان لەگەڵی، بۆچی؟ ستیڤ هۆکارەکە دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو ژنانە تەنها داوای ئامۆژگاری لەژنانی دیکە دەکەن، لە کاتێکدا جگە لەپیاو، کەس ناتوانێت پێیان بڵێت چۆن پیاوێکی گونجاو بدۆزنەوەو لەگەڵیدا بمێننەوە.

لە پەرتووکی (وەک خانم ڕەفتار بکە و وەک پیاو بیربکەرەوە) ستیڤ، ژنان ئاشنا دەکات بەبیرکردنەوەکانی پیاو، هەروەها تیشک دەخاتەسەر زۆرێک لەچەمکەکان و وەڵامی بەشێک لەپرسیارەکانیان دەداتەوە.

